
﴿تيسير مصطلح الحديث﴾
زانستی زاراوەکانی فەرموودە
دانانی
الدكتور محمود الطحان
وەرگێڕانی
عەبدوللا مەلا ئەحمەد ئەحمەدئاوایی
لەم چاپە نوێیەدا
﴿منظومة: ابن فرح الاشبيلي﴾ لە گەڵدا جۆشدراوە

# ﴿تيسير مصطلح الحديث﴾

## زانستی زاراوەکانی فەرمووده

دانانی

## الدكتور محمود الطحان

وەرگێڕانی

عەبدوڵڵا مەلا ئەحمەد(ئەحمەدئاوایی)

لەم چاپە نوێیەدا، ﴿منظومة ابن فرح الاشبيلي﴾لە گەڵدا جۆشدراوە



# بسم الله الرحمن الرحيم

الحمدلله والصلاة والسلام على رسول الله......

زانستی فەرمووده‌ناسیی، و ئاشنابوون بە زاراوەکانی ئەم زانستە، یەکێکە لەو زانیارییانەی کە دەبێت، فێرخوازان ئاشنایبن!

لەم بوارەدا، پەڕتووکی،(تیسیرمصطلح الحدیث)، زۆر بەکورتیی، وپوختیی، ئەم زاراوانەی ڕۆشن کردۆتەوە.

بە هەمان شێواز، برای بەڕێزم، (مامۆستا عەبدوڵڵا،مەلا ئەحمەد)، توانیوییەتی بە ووردی قەڵەمی بخاتە گەڕ، و وەریگێڕێتە سەر زمانی شیرینی کوردی، وفێرخوازانی کوردی پێ ئاشنا بکات، وکتێبخانەی ئیسلامیی کوردیی لە ڕووی ئەم زانستەوە دەوڵەمەندتر کرد.

خواخێری بنووسێ، و قەڵەمی بڕشتتر بکات، و بیکاتە نووری گۆڕی.

م. عبدالدائم هەورامانی

٨/ی موحەڕڕەمی/١٤٣٠هـ.

هەڵەبجە

بسم الله الرحمن الرحيم

إنَ الحَمدَ لِلّهِ نَحْمَدُهُ وَ نَسْتَعَينُهُ وَنَسْتَغْفِرُهُ، وَ نَعُودُ باللهِ مِنْ شُرُورِ أنْفُسِنا وَ مِنْ سَيِّئاتِ أَعْمالِنا، مَنْ يَهْدِهِ اللهُ فَلا مُضِلَّ لَهُ، وَمَنْ يُضلِلْ فَلا هادِيَ لَهُ، وَ أَشْهَدُ أنْ لا إلهَ إلا اللهُ وَحْدَهُ لا شَرِيكَ لَهُ، وَ أشْهَدُ أَنَّ مُحَمَّداً عَبْدُهُ وَرَسُولُهُ.

(يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا اتَّقُوا اللَّهَ حَقَّ تُقَاتِهِ وَلا تَمُوتُنَّ إِلَّا وَأَنْتُمْ مُسْلِمُونَ) (آل عمران: ١٠٢)

(يَا أَيُّهَا النَّاسُ اتَّقُوا رَبَّكُمُ الَّذِي خَلَقَكُمْ مِنْ نَفْسٍ وَاحِدَةٍ وَخَلَقَ مِنْهَا زَوْجَهَا وَبَثَّ مِنْهُمَا رِجَالاً كَثِيراً وَنِسَاءً وَاتَّقُوا اللَّهَ الَّذِي تَسَاءَلُونَ بِهِ وَالْأَرْحَامَ إِنَّ اللَّهَ كَانَ عَلَيْكُمْ رَقِيباً) (النساء: ١)

(يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا اتَّقُوا اللَّهَ وَقُولُوا قَوْلاً سَدِيداً يُصْلِحْ لَكُمْ أَعْمَالَكُمْ وَيَغْفِرْ لَكُمْ ذُنُوبَكُمْ وَمَنْ يُطِعِ اللَّهَ وَرَسُولَهُ فَقَدْ فَازَ فَوْزاً عَظِيماً) (الأحزاب: ٧٠ – ٧١).

أمَّا بعد: فإن أصدق الحديث كتاب الله وخير الهدي هدي محمد ﷺ وشر الأمور محدثاتها، وكل محدثة بدعة وكل بدعة ضلالة وكل ضلالة في النار.

**پاشان:**

زانستی فەرمودە یەکێکە لە زانستە هەرە گرنگەکانی شەریعەت، چونکە ئیسلام لە دوو سەرچاوە پێکهاتووە، کە دەبێت مسوڵمانان لێیەوە ڕێڕەوی ژیانی مسوڵمانانەی خۆیانی لێوە وەربگرن، کە ئەوانیش قورئانی پیرۆزو پاشان سوننەتەکانی پێغەمبەری دڵسۆزن ﷺ کە ئێمە لێرەدا مەبەستمان دووەمیانە، چونکە سوننەتی پێغەمبەر ﷺ بە گوفتارو کردارو.....هتد،ەوە توشی گۆڕانکاریو لاڕێیی پێ کردنێکی زۆر بۆتەوە، لەلایەن ئەهلی بیدعەو

بێدینەکانەوە، بەڵام زانایان یاساو ڕێسا گەلێکی جوانو چاکیان دانا، بۆ سەر لەنویێ پاڵفتەکردنەوەی سوننەت، ڕەزاو ڕەحمەتی خوا برژێت بەسەریاندا بۆ خۆیان و کارو کرداری پاك و بەجێیان.

ئەمە لەسەرەتادا، پاشان ئەم کارە درێژەی کێشا، هەتا دوایی، کە لەم دواییانەو لە ئێستاشدا زانایانو مامۆستایانی بەڕێز کتێب گەلێکی جوانیان لەو بارەیەوەو بەرێکخستنێکی نوێترو دارشتنێکی جوان و بە پێزترەوە داناوە، خوای گەورە پاداشتی ئەمانیش بداتەوە کە توانیویانە ئەو زانستە پیرۆزە وەك خۆی بهێڵنەوەو پەرەیشی پێبدەن، جا یەکێك لەو کتێبە بەنرخانەی ئەم دواییە کتێبی (تیسیر مصطلح الحدیث)ی (د. محمود الطحان)ـە، کە یەکێکە لە کتێبە باشەکانی زاراوە ناسی کە لە نێوەرۆکی کتێبەکەوە گەوهەرەکانی ناویت بە جوانتر بۆ ڕون دەبێتەوە، بۆیە بەندەش دوای سەیرکردنو لێکۆڵینەوە لەسەری بۆم دەرکەوت، کە وەرگێڕانی ئەم کتێبە بۆ کوردی جێگای سودی تامەزرۆیانی زانست دەبێت، إنشاء اللە.بۆیە پێی هەستام و ـ بِحَمْدِ اللهِ وَ مُنِّهِ وَ فَضْلِهِ وَ كَرَمِهِ ـ جێبەجێم کرد.

لە کاتی وەرگێڕانەکەدا وشەی عەرەبیم زۆر دووبارە کردۆتەوە، ئەمەش تا کتێبەکە چێژە ڕەسەنەکەی خۆی هەبێت، و قوتابیش لەو وشانە سوود وەربگرێت، و حاڵەتی عەرەبیەکەی باشتر ببێت، چونکە ئەوانەی کە توێژینەوە لەسەر ئەم جۆرە کتێبانە دەکەن، کەسانی سەرەتایین. وە جگە لە مەیش لەهەندێ جێگادا ڕوونکردنەوەم زیاد لەوەرگێڕانەکەداوە، و جیام کردۆتەوە لێی، تا تێگەیشتنی زیاتربێت.

ئیتر ئەم وتەیە لە کورتیدا دەبڕمەوە، و سوپاسی خوای گەورە دەکەم لەسەریو لە خوێنەری ئازیزیش داواکارم هەر هەڵەیەکی بینی، ئەوا خۆی چاکی بکات، یان بیباتە خزمەت مامۆستایەکی بەڕێزو ئیصلاحی بکات، بۆیە:

إذا استعرت كتابي و أنتفعت به فـاحذر وقيت الردئ مـن أن تغيره

و أردده لـي سالماً أني شَغَفْتُ به لــولا مــخافــة كتم العلم لم ترهُ

لە کۆتاییشدا دەڵێم:

فياليت الـــذي يـقرأ كتـــابي دعـــاني بـــالخلاص في العــــذابِ

خوای گەورە هەموولایەك موەفەق بکات بۆ خزمەتی ئیسلام و مسوڵمانان ... آمین.

عەبدوڵڵا مەلا ئەحمەد(ئەحمەدئاوایی)
(١٨-٧-٢٠٠٣) - (١٩- جەمادی یەکەم -١٤٢٣)
ئەحماوا - هەورامان - کوردستانی عێراق

## ﴿ بیۆگرافیای (الشیخ الدکتور محمود أحمد الطحان) ﴾ دانەری کتێبی، ﴿تیسیر مصطلح الحدیث﴾

ئەم زانا فەرموودەناسە پایەبەرزە، ناوی (الدکتور أبو حفص محمود بن أحمد الطحان الحلبي النعیمي)یە، و ڕەچەڵکی دەڕواتەوە سەر، ئالی بەیتی پاکی (عەلی کوڕی حسەینی کوڕی عەلی کوڕی ئەبوطالیب)، رضي الله عنهم.

### لە دایکبوون، وپێگەیشتنی:

(الدکتور محمود الطحان)، لە قەزای (باب)ـی، سەر بە پارێزگای (حەلەب)ـی، ولاّتی (سوریا)، لە ساڵی، (١٩٣٥)ـی، زایینی، لە دایك بووە، و پاشان باری کردووە، بۆ شاری (مەنبەج)، و دواتر بۆ شاری حەلەب، و لە نێو بنەماڵەیەکی ئایینی، وخواناسدا گەورە بووە، و(حاجی ئەحمەد طەحان)ـی، باوکیی، پیاوێکی بەڕێز، و خۆش ئەخلاق بووە، ولای خەڵکیی خۆشەویست بووە، و سەرجەم منداڵەکانی خۆی لە سەر خۆشەویستی زانست، و زانایان پەروەردە کردووە.

### خوێندنی:

(الدکتور محمود الطحان)، سەرەتای خوێندنی لە، قەزای (باب)، دەست پێکردووە، و دواتر لە شاری (مەنبەج)، درێژەی پێداوە، و دواتر چووەتە دواناوەندی خوێندنی ئیسلامیی، لە شاری (حەلەب)، و لە ساڵی (١٩٥٤)، تەواوی کردووە . و پاشان دەستی کردووە، بە لەبەرکردنی قورئانی پیرۆز، لە خزمەت، (الشیخ محمد نجیب خیاطة)، "رحمه الله"، ولە خزمەتیدا سەرجەمی قورئانی پیرۆزی لەبەر کردووە، کە بەیانیان لە مزگەوتی (خوسرەویە)، لە خزمەتیدا دەیخوێند، و لە ماوەی دوو ساڵدا لەبەری کرد، و ئەمە،

وشانبەشانی بەردەوامبوونی لە خوێندنەکەی لە دواناوەندی خوێندنی ئیسلامیی، لە شاری (حەلەب)!

دواتر لە ساڵی(١٩٥٦)، چووە کۆلێژی شەریعە، لە شاری (دیمەشق)، و لە ساڵی(١٩٦٠)دا، تەواوی کرد، و هەر پێش تەواو کردنی زاکۆیش ژنی هێناوە، و لە ساڵی(١٩٦١)، بە تۆبزی کراوەتە سەرباز!

**مامۆستاکانی:**

(١). (الشيخ جمعة، أبو زلام).

لە ساڵەکانی، (١٩٤٦)، بۆ (١٩٤٩)، لە شاری مەنبەج، لە خزمەتیدا خوێندویەتی، و دوای ئێرە چووەتە، مەدرەسەی (خوسرەوییە)، لە حەلەب، و لە خزمەت،(الشيخ جمعه، أبو زلام)دا، (فیقهـ)، و(نەحو)، و (ألفيه ابن مالك)ـی، خوێندووە.

**– مامۆستاکانی، لە دواناوەندیی خوێندنی ئیسلامیی، لە شاری (حەلەب)!**

(٢).الشيخ عبد الوهاب سكر.

(٣).والشيخ محمد أبو الخير زين العابدين.

(٤).الشيخ الفقيه محمد الملاح.

(٥).الشيخ محمد نجيب خياطة، (شێخی قورئانخوێنان (القراء)ـی، حەلەب).

(٦).الشيخ الفقيه، محمد سلقيني.

(٧).الشيخ الفقيه اللغوي، محمد أسعد عبجي، (موفتی حەلەب).

(٨).الشيخ الفقيه اللغوي، محمد ناجي أبو صالح.

(٩).الشيخ اللغوي، عبد الله حماد.

**- مامۆستاكانی، لە (زانكۆی ئەزهەر)ـی، میصر:**

(١٠).الشيخ الدكتور محمد محمد أبو زهو، رحمه الله ، نووسەری كتێبی (كتاب الحديث والمحدثون).

(١١).الشيخ الدكتور محمد السماحي.

**هاوڕێكانی:**

**- هاوڕێكانی، لە دواناوەندیی خوێندنی ئیسلامیی، لە شاری (حەلەب)!**

(١).الدكتور عبد الله محمد سلقيني.

(٢).الدكتور محب الدين أحمد أبو صالح.

(٣).الشيخ عبد الوهاب ريحاوي.

(٤).الشيخ نجم الدين زين العابدين رحمه الله.

(٥).الشيخ عبد الحميد صلوح الأريحاوي، و هی تریش...

**قوتابییەكانی:**

(الدكتور محمود الطحان)، قوتابی زۆری هەبووە، بە تایبەت قوتابییەكانی لە، (زانكۆی ئیسلامیی)، لە شاری (مەدینەی مونەووەرە)، و كۆلیژی شەریعە، لە زانكۆی، (الإمام محمد بن سعود الإسلامية)، لە (رياض)، وكۆلیژی شەریعە، وتوێژینەوە ئیسلامییەكان، لە زانكۆی كوەیت، و ئەمە، و سەرەڕای دەیان قوتابی تر لە دەرەوەی زانكۆ، و كوڕە خوێندەوارەكانی خۆی.

- چەند کەسێك، لە قوتابییەکانی:

(١). الدکتور عبد الرزاق الشایجي، ڕاگری پێشووی کۆلیژی شەریعە، وتوێژینەوە ئیسلامییەکان، لە زانکۆی کوەیت.

(٢).الدکتور الداعیة محمد العوضي.

(٣). الدکتور ولید الطبطبائي.

(٤). فهد الخني ، ئەندامی پەرلەمانی کوەیت.

(٥). الدکتور نهاد عبید، لە (زانکۆی ئیسلامیی)، لە شاری (مەدینەی مونەووەرە)، لە خزمەتیدا خوێندویەتی. و هی تریش...

**کارکردنی:**

(الدکتور محمود الطحان)، وەك پێشنوێژ، و گوتارخوێن، لە مزگەوتی(الزیارة)، لە(مەنبەج)، و چەندەها مزگەوتی شاری (حەلەب)دا، کاری کردووە، و دواتر لە شارەکانی (الحفة)، و(اللاذقیة)، لە سوریا، وەك مامۆستای پەروەردەی ئیسلامیی کاری کردووە، و هەروەها لە خوێندنگەی دواناوەندی خوێندنی ئیسلامیی، لە شاری (حەلەب)، و خوێندنگە ئیسلامییەکانی تری سوریا، تا ساڵی (١٩٦٥)مامۆستایەتی کردووە!و پاشان، لە (زانکۆی ئیسلامیی)، لە شاری (مەدینەی مونەووەرە)، بووەتە مامۆستا، و شان بە شانی خوێندنی ماستەر، و دکتۆراکەی، بۆ ماوەی "دە"، ساڵ وانەی (الحدیث النبوي، ومصطلحە)ـی، گوتۆتەوە.

لە ساڵی (١٩٦٩)، لە سعودیە، ماستەری خوێندووە، و دواتر لە ساڵی (١٩٧١)، دکتۆرای لە فەرموودەدا، لە کۆلیژی (أصول الدین)ـی، زانکۆی ئەزهەر، وەرگرتووە، و ناوی دکتۆرانامەکەی بریتی بووە، لە،

﴿الحافظ الخطيب البغدادي، وأثره في علوم الحديث﴾، وئەم دكتۆرانامەيە، لە ساڵی (١٩٨١)دا، چاپكراوە.

پاشان لەكۆلێژی شەریعە، لە زانكۆی، (الإمام محمد بن سعود الإسلامية)، لە (رياض)، بۆ ماوەی حەوت ساڵ مامۆستا بووە، و هەر لەوێ، و لە ساڵی (١٩٧٧)دا، ئەم كتێبە بە نرخەی،" تيسير مصطلح الحديث"ـی، داناوە، و هەر لەكۆلێژی شەریعە، لە زانكۆی، (الإمام محمد بن سعود الإسلامية)، لە (رياض)، كراوەتە مەنهەجی خوێندن، و دوای یەك، دوو ساڵ كتێبی، "أصول التخريج ودراسة الأسانيد"يشی، داناوە، كە ئەمیش دیسان كراوەتە مەنهەجی خوێندن، لە هەمان زانكۆ!

پاشان لەكۆلێژی شەریعە، وتوێژینەوە ئیسلامییەكان، لە زانكۆی كوەیت، لە ساڵەكانی (١٩٨٢ – ٢٠٠٥)، وەك مامۆستای فەرموودەی پیرۆز دەست بەكار بووە، واتە، تا تەمەنی حەفتا ساڵی! پاشان گەڕاوەتە، بۆ شاری (حەلەب).

(الدكتور محمود الطحان)، دوو لە كوڕەكانی ماستەریان لە فەرموودەی پیرۆزدا هەیە.

ئەم زانا پایە بەرزە، چووەتە میسر بۆ خوێندن، و چووەتە سعودیە، وكوەیت بۆ دەرس گوتنەوە، و چووەتە ئەڵمانیا، وئەمریكا، بۆ كاری بانگەوازی ئیسلامیی، وئێستا زیاتر دانیشتووی شاری (حەلەب)ـی، زەوی بەرەنگاریی، وموقاوەمەت، وجیهادە!

(الدكتور محمود الطحان)، (١٤)جار، حەجی كردووە، و(٢٠)، بۆ (٣٠) جار، عەمرەی ئەنجامداوە!

(الدكتور محمود الطحان)، لە ژيانيدا، سێ ژنی هێناوه.

**كتێبه‌كانی:**

ئەم زانا مەزنە، چەندەها كتێبی هەن، كە ئێستا سەرچاوە، و بەردەستن، لە جیهانی ئیسلامیدا، لەوانە:

(١) تيسير مصطلح الحديث. (ئەم كتێبەی بەردەستمان)

(٢) أصول تخريج الأحاديث، ودراسة الأسانيد.

(٣) الخطيب البغدادي.

(٤) من للسنة اليوم.

(٥) عناية المحدثين بمتن الحديث كعنايتهم بالأسانيد.

(٦) حجية السنة، ودحض الشبهات التي تثار حولها . بحث.

(٧) مفهوم التجديد بين السنة النبوية وأدعياء التجديد . (بحث في الرد على الدكتور حسن الترابي).

(٨) معجم المصطلحات الحديثية . بحث.

(٩) تحقيق الجامع لأخلاق الراوي وآداب السامع، للخطيب البغدادي: أحمد بن علي،(ت ٤٦٣)، تحقيق المعجم الأوسط للطبراني (١١ مجلدا) طبع دار المعارف، بالرياض

(١٠) تحقيق كتاب :الحديث على أبواب الفقه ، للشيخ محمد بن عبد الوهاب ، رحمه الله ، حققه هو والدكتور خليل ملا خاطر ، كل منهما حقق مجلدين.

* گرنگیی ئەم کتێبی، (تیسیر مصطلح الحدیث)ـــە:

**_ ئەم کتێبە، کراوەتە مەنهەجی خوێندن، لە زۆر لە زانستگەکاندا، لەوانە:**

(١). کۆلێژی شەریعە، لە زانکۆی، (الإمام محمد بن سعود الإسلامیة)، لە (ریاض).

(٢). کۆلێژی شەریعە، وتوێژینەوە ئیسلامییەکان، لە زانکۆی کوەیت.

(٣). کۆلێژی توێژینەوە عەرەبیی، وئیسلامییەکان، لە (دوبەی)، و زۆر شوێنی تریش.

**– زانایان زۆر بە گرنگ باسیان کردووە، و زۆر جار بە دەرس گوتویانەتەوە.**

**– بە دەنگ لە سەر کاسێت، تۆمار کراوە.**

**– چەندەها جار چاپکراوەتەوە، لەوانە:** (چاپی "دار المعارف"، لە "ریاض"، و "دار التراث"، لە "کوەیت".

**– وەرگێڕە کراوە، بۆ زمانەکانی،( ئینگلیزی، و فەرەنسیی)، و ئەوەتا سوپاس بۆ خوا (کوردی)یش.**

**– (الشیخ علی بن نایف الشحود)، تەحقیقی کردووە، و پەراوێزی لە سەر نووسیوە، وناوی ناوەتە، (فتح المغیث، في التعلیق علی تیسیر مصطلح الحدیث).**

**- دانەری ئەم کتێبی (تیسیر مصطلح الحدیث)ـە، سەبارەت بەم پەڕاوەی دەڵێت:**

سوپاس بۆ خوای پەروەردگار، ئەم کتێبەم لای قوتابیانی زانستە شەرعییەکان بە گشتیی جێگای بایەخ پێدانە، بە تایبەتی لـە لای ئەو قوتابیی، و فەقێیانەی کە زیاتر بایەخ بە فەرموودەناسی دەدەن، هەر بۆیەش لـە ساڵی (١٩٧٧) بە دواوە، کە چاپی یەکەمی دەرچوو، تا ئێستا حەوت جار زیاتر چاپکراوەتەوە! دیسان سوپاس بۆ خوای پەروەردگار.

بسم الله الرحمن الرحيم

الحمد الله الذي من على المسلمين بإنزال القرآن الكريم، وتكفل بحفظه في الصدور والسطور إلى يوم الدين، وجعل من تتمة حفظه حفظ سنة سيد المرسلين.

والصلاة والسلام على سيدنا ونبينا محمد الذي أوكل الله إليه تبيان ما أراده من التنزيل الحكيم بقوله تعالى " وَأَنزَلْنَا إليكَ الذِّكْرَ لِتُبَيِّنَ لِلنَّاسِ مَا نُزِّلَ إليهِمْ وَلَعَلَّهُمْ يَتَفَكَّرُونَ "[1] فقام صلي الله عليه وسلم مبينا له بأقواله وأفعاله وتقريراته بأسلوب واضح مبين .

والرضي عن الصحابة الذين تلقوا السنة النبوية عن النبي الكريم فوعوها، ونقلوها للمسلمين كما سمعوها خالصة من شوائب التحريف والتبديل.

والرحمة والمغفرة للسلف الصالح الذين تناقلوا السنة المطهرة جيلا عن جيل. ووضعوا لسلامة نقلها وروايتها قواعد وضوابط دقيقة لتخليصها من تحريف المبطلين .

والجزاء الخير لمن خلف السلف من علماء المسلمين الذين تلقوا قواعد راوية السنة وضوابطها عن السلف فهذبوها ورتبوها وجمعوها في مصنفات مستقلة سميت فيما بعد بـ "علم مصطلح الحديث"[2].

أما بعد : فعندما كلفت منذ سنوات بتدريس علم " مصطلح الحديث " في كلية الشريعة بالجامعة الإسلامية في المدينة المنورة وكان المقرر تدريس كتاب " علوم الحديث " لابن الصلاح ، ثم قرر بدله مختصره كتاب " التقريب "

---

١. سورة النحل الآية ٤٤

[2]. يطلق على هذا العلم أيضا ، علم الحديث دراية و علوم الحديث وأصول الحديث.

للنووي . وجدت مع الطلبة بعض الصعوبات في دراسة هذين الكتابين ـ على جلالتهما وغزارة فوائدهما ـ دراسة نظامية ، من هذه الصعوبات ، التطويل في بعض الأبحاث، لا سيما في كتاب ابن الصلاح[٣]، ومنها الاختصار في البعض الآخر ، لا سيما في كتاب النووي [٤] ، ومنها صعوبة العبارة ، و منها عدم تكامل بعض الأبحاث[٥]، و ذلك كترك التعريف مثلا أو إغفال المثال أو عدم ذكر الفائدة من هذا البحث أو ذاك . أو عدم التعريج على ذكر أشهر المصنفات ، وما أشبه ذلك . ووجدت غيرهما من كتب الأقدمين في هذا الفن كذلك ، بل إن بعض تلك الكتب غير شامل لجميع علوم الحديث ، وبعضها غير مهذب ولا مرتب وعذرهم في ذلك هو إما وضوح الأمور التي تركوها بالنسبة لهم، أو الحاجة لتطويل بعض الأبحاث بالنسبة لزمنهم، أو غير ذلك مما نعرفه أو لا نعرفه.

فرأيت أن أضع بين أيدي الطلبة في كليات الشريعة كتاباً سهلا في مصطلح الحديث وعلومه ييسر عليهم فهم قواعد الفن ومصطلحاته ، وذلك بتقسيم كل بحث إلى فقرات مرقمة متسلسلة، مبتدئا بتعريفه ، ثم بمثاله ، ثم بأقسامه مثلا .... مختتما بفقرة " أشهر المصنفات فيه " كل ذلك بعبارة سهلة، وأسلوب علمي واضح ليس فيه تعقيد ولا غموض، ولم أعرج على كثير من الخلافات والأقوال وبسط المسائل مراعاة للحصص الزمنية القليلة المتخصصة لهذا العلم في كليات الشريعة وكليات الدراسات الإسلامية.

---

[٣]. كبحث معرفة كيفية سماع الحديث وتحمله وصفة ضبطه ، فقد استغرق / ٤٦ / صفحة .

[٤]. كبحث " الضعيف " مثلا إن لم يتجاوز تسع عشرة كلمة .

[٥]. مثال ذلك اقتصار النووي في بحث المقلوب على ما يلي : " المقلوب " هو نحو حديث مشهور عن سالم جعل عن نافع ليرغب فيه، وقلب أهل بغداد على البخاري مائة حديث امتحانا فردها على وجوهها فأذعنوا بفضله!

وسميته " تيسير مصطلح الحديث " ولست أرى أن هذا الكتاب يغني عن كتب العلماء الأقدمين في هذا الفن ، وإنما قصدت أن يكون مفتاحاً لها ، ومذكراً بما فيها ، وميسرا للوصول إلى فهم معانيها ، وتظل كتب الأشعة والعلماء الأقدمين مرجعاً للعلماء والمتخصصين في هذا الفن ، ومعينا فياضاً ينهلون منه .

ولا يفوتني أن أذكر أنه صدر في الآونة الأخيرة كتب لبعض الباحثين فيها الفوائد الغزيرة لا سيما الرد على شبه المستشرقين والمنحرفين ، لكن بعضها مطول ، وبعضها مختصر جدا وبعضها غير مستوعب ، فأردت أن يكون كتابي هذا وسطا بين التطويل والاختصار ومستوعباً لجميع الأبحاث.

**والجديد في كتابي هذا هو :**

١ – التقسيم، أي تقسيم كل بحث إلى فقرات مرقمة، مما يسهل على الطالب فهمه [٦]

٢ – التكامل في كل بحث من حيث الهيكل العام للبحث ، من ذكر التعريف والمثال والخ ...

٣ – الاستيعاب لجميع أبحاث المصطلح بشكل مختصر .

أما من حيث التبويب والترتيب فقد استفدت من طريقة الحافظ ابن حجر في النخبة وشرحها فإنه خير ترتيب توسل إليه ـ رحمه الله ـ وكان جل اعتمادي

---

[٦] لقد استفدت في موضوع تقسم البحث إلى فقرات من كبار أساتذتي ، كالأستاذ مصطفي الزرقاء في كتابه " الفقه الإسلامي في ثوبه الجديد " والأستاذ الدكتور معروف الدوليبي في كتابه " أصول الفقه " والأستاذ الدكتور محمد زكي عبدالنبي في مذكرة وضعها لنا ـ عندما كنا طلاباً في كلية الشريعة بجامعة دمشق ـ على كتاب الهداية للمرغيناني فكان لهذا التقسيم المبتكر أعظم الأثر في فهم تلك العوم بسهولة ويسر بعد أن كنا تقاسي كثيراً في فهمها واستيعابها .

في المادة العلمية على " علوم الحديث " لابن الصلاح ، ومختصر " التقريب " للنووي وشرحه " التدريب " للسيوطي.

وجعلت الكتاب من مقدمة وأربعة أبواب، الباب الأول في الخبر، الباب الثاني، في الجرح والتعديل، والباب الثالث في الرواية وأصولها، والباب الرابع في الإسناد ومعرفة الرواة.

وإنني إذ أقدم هذا الجهد المتواضع لأبنائنا الطلبة اعترف بعجزي وتقصيري في إعطاء هذا العلم حقه ولا أبريء نفسي من الزلل والخطأ ، فالرجاء ممن يطلع فيه على زلة أو خطأ أن ينبهني عليه مشكوراً ، لعلي أتداركه وأرجو الله تعالى أن ينفع به الطلبة والمشتغلين بالحديث وأن يجعله خالصاً لوجهه الكريم .

## پێشەكیی دانەر

بسم الله الرحمن الرحيم

سوپاس بۆ ئەو خوایەی كە منەتی خستەسەر مسوڵمانان، بەوەی كە قورئانی پیرۆزی بۆ سەرناردنو خۆیشی ئۆباڵــی پاراستنەكەیی لـە سینگەكانو لـە لاپەڕەكاندا گرتە ئەستۆ هەتا ڕۆژی دوایی، وە پاراستنی سونەتی سەروەری پێغەمبەرانیشی ﷺ گێڕاوەك تەواوكارێكی پاراستنی قورئان.

وە درودو سەلام لـەسەر گەورەمان و پێغەمبەرمان موحەممەد ﷺ كە خودا كردیە وەكیلی خۆی بۆ ئەوەی كە ئەو شتانەی لـە قورئاندا خوای گەورە ڕونكردنەوەیانی دەوێت ئەو ڕوونی بكاتەوە، وەك دەفەرموێت: (وَأَنْزَلْنَا إِلَيْكَ الذِّكْرَ لِتُبَيِّنَ لِلنَّاسِ مَا نُزِّلَ إِلَيْهِمْ وَلَعَلَّهُمْ يَتَفَكَّرُونَ)(النحل: ٤٤)، وە ئێمە ئەم زیكرەو (قورئان)مان بۆ تۆ نارد تائەوەی كە بۆخەڵكی هاتووە، بۆیان بەیان و ئاشكرا بكەی تا بەڵكو بیربكەنەوە.

جا پێغەمبەر ﷺ هەستا بە ڕونكردنەوەی —ئەم قورئانە— بە گوفتارو كردارو پەسەندكراوەكانی بەشێوازێكی ڕوون و ئاشكراكارانە.

وە خودا لـەو هاوەڵانە ڕازی بێت، كە سونەتی پێغەمبەریان ﷺ وەرگرت، لـە خودی پێغەمبەرەوە ﷺ گوێیان لــێ گرتو تێگەیشتن، وە گواستیانەوە بۆ مسوڵمانان بەو شێوازەی كە بیستبوویان بە پاكی و بەبــێ لارێیی كردن تیایدا و گۆڕانكاری پــێ كردنی.

وە ڕەحمەتو لـێخۆشبوون بۆ پێشینە چاكە كان (السلف الصالح) ئەوانەی كە سونەتی پاكی پێغەمبەریان ﷺ جیل بۆ جیل گواستەوە ،وە بۆ سەلامەت

بوونی ئەو گواستنەوەیەو گێڕانەوەی، یاساو ڕێسا گەلێکی وردیان دانا، بۆ پاك كردنەوەی لە شێواندن و گۆڕانكاری پێ كردنی بەتاڵكاران (المُبْطِلِين).

وە باشترین پاداشت بۆ ئەوانەی دوای پێشینەكان (خلف السلف) لە زانایانی مسوڵمانان، ئەوانەی كە یاساكانی گێڕانەوەی سوننەت و ڕێساكانیان لە سەلەفەوە وەرگرت، جا پوختەیان كردنو ڕێكیان خستنو كۆیان كردنەوە لە كتێب گەلێكی سەربەخۆدا، كە لەوەو دوا بە (علم مصطلح الحديث — بە زانستی زاراوەكانی فەرموودە) ناوزەدكران[٧].

**پاشان:** لە كاتێكا كە چەند ساڵێك بوو، وتنەوەی زانستی (مصطلح الحديث)م لە كۆلیژی شەریعە، لە زانكۆی ئیسلامی لە (المدينة المنورة) خرابوە ئەستۆ، وەئەوەی كە لەوێ دیاریكرابوو، ووتنەوەی كتێبی (علوم الحديث)ی (إبن الصلاح) بوو، پاشان گۆڕدراو لە جیاتی ئەو كتێبی (التقريب)ی (الإمام النواوي) دانرا كە كورتەی ئەوەی پێشووە، جا لەگەڵ قوتابیەكاندا هەندێك سەختیمان بینی لەكاتی لێكدانەوەی ئەو دوو كتێبەدا — ئەمەش لەگەڵ شكۆمەندیو زۆر سودمەندی ئەو كتێبانەدا — لە كاتی لێكدانەوەیاندا بەلێكدانەوەیەكی یاسایانە. لەو نارەحەتیو سەختیەیانە درێژ بڕی لەهەندێ باسدا بەتایبەتی لە كتێبەكەی (إبن الصلاح)[٨]دا، وە كورت بڕی لە هەندێكی تردا، بەتایبەتی لە كتێبەكەی (الإمام النواوی)[٩]دا، وە

---

[٧] وە هەروەها ئەم زانستە ناوی (علم الحديث دراية)، و (علوم الحديث) و (أصول الحديث)یشی بۆ بەكاردەهێنرێ.

[٨] وەك باسی (كيفية سماع الحديث و تحمله و صفة ضبطه) كە زیادە ڕەوانە (٤٦) لاپەڕەی لەسەر ڕۆیشتووە.

[٩] وەك باسی (ضعيف) بۆنموونە كە باسەكەی لە نۆزدە وشە تێپەڕی نەكردووە.

هەروەها لە سەختی دەستەواژەکانو تەواو نەکردنی هەندێ لە باسەکان[10]، ئەمەش وەك :بۆ نمونە نەکردنی پێناسە، یاخود لە بیرچوونی نمونە هێنانەوە، یاخود باس نەکردنی سودی ئەم باسە یان ئەوەی تر،، یان نەڕۆشتنە سەر باسکردنی بەناوبانگترین کتێب لەو بارەیەوە،و وێنەی ئەمانە وە کتێبی زانایانی پێشووی غەیری ئەمانەیشم لەم زانستەدا هەر بەم شێوازە بینی، بەڵکو هەندێ لەو کتێبانە تەنانەت سەرجەم باسەکانی زانستی فەرمودەشیان لەخۆ نەگرتبوو، وە هەندێکیشیان پوخت نەکرا بوون و ڕێك نەخرابوون، وە پاساویشیان بۆ ئەمە یان ئەوەیە کە ئەو شتانە زۆر ڕوون بوون لایان بۆیە وەلایان ناون، یان پێویستی سەردەمەکەی ئەوان وا بووە، کە لە هەندێ باسی تردا درێژ بڕی بکەن، یان چەند شتێکی تر کە ئێمە دەیان زانین یان نایان زانین.

جا وا هاتە پێش چاوم، کە کتێبێك بخەمە بەردەست قوتابیانی کۆلیژەکانی شەریعەت کەلە زانستەکان و زاراوەکانی فەرمودەدا ئاسان بێت، وە تێگەیشتنی یاساکانو زاراوەکانی ئەم زانستە لەسەریان ئاسان بکات، وە ئەمەش بە دابەشکردنی هەموو باسێك بۆ چەند بڕگەیەکی ژمارە بۆ دانراو (مُرَقَّمٌ)ی زنجیرەیی کە سەرەتاکەی بە پێناسەو پاشان بە نمونەو دواتر بە بەشەکانی....بۆنمونە وە بە بڕگەی (بەناوبانگترین دانراو تیایدا) کۆتایی دێت، ئەمەیش هەمووی بەدەستەواژەی ئاسان، و شێوازێکی ئەکادیمیانەی ڕوون، کە هیچ گرێ و گۆڵێکی تیادا نەبێت، بەڵام نەڕۆیشتوومەتە سەر زۆر لەو جیاوازیانەو گوتە جۆربەجۆرانەو فراوانکردنی بابەتەکان، ئەمەش وەك

---

[10] نموونەی ئەمە کورت بڕی (الإمام النواوي) یە، لەباسی (المقلوب) دا بەم شێوازە:

المقلوب: (هو نحو حدیث مشهور عن سالم جعل عن نافع لیرغب فیه، و قلب أهل بغداد علی البخاري مائة حدیث إمتحاناً فرَدها علی وجوهها فأذعنوا بفضله)!

ڕەچاوکردنی ئەو کاتەی کە دیاریکراوەو تایبەتکراوە تیایدا بۆ ئەم زانستە لە کۆلیژەکانی شەریعەتو کۆلیژەکانی توێژینەوە ئیسلامییەکاندا.

وەناوم ناوە (تيسير مصطلح الحديث)، وە من نابینم کە ئەم کتێبە، بێ نیازکەری تۆ بوو بێت، لە کتێبی زانایانی پێشوو لەم زانستەدا، بەڵکو من مەبەستم ئەمە بوو، کە کلیلێك بێت بۆ ئەو کتێبانە، و یادخەرەوە بێت بۆ ئەوەی لەو کتێبانەدا هەیە، وە ئاسانکاربێت، بۆ گەیشتن بە تێگەیشتنی ماناکانی ئەوان، وە کتێبی پێشەوایان و زانایانی پێشوو سەرچاوەیەکە بۆ زانایان و تایبەتکاران، (الْمُتَخَصِّصِين) لەم زانستەدا، وە یارمەتی دەرێکی فراوانە، کە زانایان شتی لێوە وەردەگرنو تینوێتی خۆیانی پێدەشکێنن.

وە با لەبیرم نەچێت کە ئەوە باس بکەم، کە لەم دواییەدا هەندێ کتێبی لێکۆڵەرەوان (الباحثين) دەرچوو، کە سودی زۆریان تیادا بوو، بەتایبەتی لە بەرپەرچ دانەوەیان لەسەر ڕاڕایی ڕۆژهەڵاتناسان و لادەران، بەڵام هەندێکیان درێژکارن وە هەندێکیشیان زۆر کورتن، وە هەندێکیشیان نەیان توانیوە بابەتەکان لەخۆ بگرن، جا ویستم کە ئەم کتێبەی من نێوەندێك بێت لەنێوان درێژ بڕیو کورت بڕیدا وە لە خۆگری سەرجەم ئەو باسانە بێت.

وە تازەگەری لەم کتێبەی مندا ئەوەیە:

١. دابەشکاری (التقسيم):واتە: دابەشکردنی سەرجەم بابەتەکان بۆ چەند بڕگەیەکی ژمارەدار تا تێگەیشتنی لەسەر قوتابی ئاسان بێت[11].

---

[11]. لە بابەتی دابەشکردنی باسەکاندا بۆ بڕگە بڕگە کردنیان سوودم لە گەورە مامۆستایانی وەك وەك مامۆستا (مصطفى الزرقاء) وەرگرتووە، لە کتێبەکەیدا (الفقه الإسلامي في ثوبه الجديد) وە مامۆستا (د. معروف الدواليبي) لە کتێبەکەیدا (أصول الفقه) و مامۆستا (د. محمد ذكي عبد البر) لە (مذكّر)ەکەیدا، کە بۆی دانا بوین، کاتێك کە ئێمە قوتابی بووین لە کۆلێژی شەریعەی زانکۆی

٢.تەواو كاری كردن لەسەرجەم باسەكاندا، لەڕووی شێوازی گشتی باسەكەوە، هەر لە هێنانی پێناسەو نمونەو ...هتد.

٣.لە خۆگرتنی سەرجەم باسەكانی زاراوە ناسی بەشێوەیەكی كورت.

بەڵام لەڕوی دابەشكردنی بەندەكان،- باب، باب -كردنیان و ڕێكخستنیەوە، سودم لە ڕێبازی (إبن حجر) وەرگرتووە، لە كتێبی (ألنخبة)و شەرحەكەیەوە، چونكە ئەو ڕێبازە چاكترین ڕێكخستنێكە كە (إبن حجر) ڕەحمەتی خودای لــی بێت پێی گەیشتووە، وە لەسەر بواری زانستیش زۆرترین پشت پــێ بەستنم لەسەر (علوم الحديث)ی (إبن الصلاح) و كورتەی ئەو كتێبە (التدريب)ی (إلامام النواوي)و شەرحەكەی (التقريب) ی (الامام السيوطي) بووە.

وە كتێبەكەم كردووە بە پێشەكیەكو چوار بەند.

* بەند ی یەكەم: دەربارەی فەرمودە (الخبر).
* بەندی دووەم: دەربارەی (الجرح و التعديل).
* بەندی سێهەم: دەربارەی ڕیوایەتو بنەماكانی.
* بەند ی چوارەم: دەربارەی (إسناد)و ناسینی گێڕەرەوەكانە.

وە من كە ئەم هەوڵە كەمە دەخەمە بەردەست قوتابیانمانەوە، دان دەنێم بە دەستەو ستانیو كەمو كورتیم لە هەركەم وكوڕیو ماف پێ بەخشینێكمدا بەو زانستە، وە دەرونی خۆم بەری ناكەم لە هەڵخلیسكان و هەڵە، جا داوام لەوە هەیە كە چاوی بەخلیسكان و هەڵەیەك

---

(دیمەشق) لە سەر كتێبی (الهداية)ی (مرغيناني) جا ئەم دابەشكاریەیە تازەیە گەورەترین كاریگەری هەیە، لە تێگەیشتنی ئەو زانستەدا بە ئاسانی، پاش ئەوەی كە ئێمە لە تێگەیشتنو وەرگرتنی زۆریاندا سەختیمان چەشتووە.

دەكەوێت، كە ئاگادارم بكاتەوە، بە سوپاسەوە. سا بەڵكو پێی بگەم و چاكی بكەم، وە داواكارم لە خوای گەورە كە قوتابیانو سەرقاڵان بەفەرمودە وە لێی سودمەندبن، وە ئەم كتێبە بگێڕی بەوەی كە تەنها لەبەرخاتری خۆی كرابێت.

## المقدمة

## نبذة تاريخية عن نشأة علم المصطلح والأطوار التي مر بها .
## أشهر المصنفات في علم المصطلح .
## تعريفات أولية.

## نبذة تاريخية عن نشأة علم المصطلح والأطوار التي مر بها:

يلاحظ الباحث المتفحص أن الأسس والأركان الأساسية لعلم الرواية ونقل الأخبار موجودة في الكتاب العزيز والسنة النبوية فقد جاء في القرآن الكريم قوله تعالى : " يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا إِن جَاءكُمْ فَاسِقٌ بِنَبَإٍ فَتَبَيَّنُوا " [١٢] . وجاء في السنة قوله صلى الله عليه وسلم : " نضر الله امرأ سمع منا شيئا فبلغه كما سمعه فرب مبلغ أوعى من سامع " [١٣] وفي رواية " فرب حامل فقه إلى من هو أفقه منه ، ورب حامل فقه ليس بفقيه " [١٤]

ففي هذا الآية الكريمة وهذا الحديث الشريف مبدأ التثبت في أخذ الأخبار وكيفية ضبطها بالانتباه لها ووعيها والتدقيق في نقلها للآخرين.

وامتثالا لأمر الله تعالى ورسوله صلى الله عليه وسلم فقد كان الصحابة رضي الله عنهم يثبتون في نقل الأخبار وقبولها ، لا سيما إذا شكوا في صدق الناقل لها ، فظهر بناء على هذا موضوع الإسناد وقيمته في قبول الأخبار أوردها ، فقد جاء في مقدمة صحيح مسلم عن ابن سيرين : " قال لم يكونوا يسألون عن الإسناد ، فلما وقعت الفتنة قالوا سموا لنا رجالكم ، فينظر إلى أهل

---

[١٢] من سورة الحجرات ـ آية ٦

[١٣] الترمذي ـ كتاب العلم ـ وقال عنه حسن صحيح .

[١٤] المصدر نفسه لكن قال عنه حسن ، وروي الحديث أبو داوود وابن ماجه .

السنة فيؤخذ حديثهم وينظر إلى أهل البدع فلا يؤخذ حديثهم [15] وبناء على أن الخبر لا يقبل إلا بعد معرفة سنده فقد ظهر علم الجرح والتعديل ، والكلام على الرواة ، ومعرفة المتصل أو المنقطع من الأسانيد ، ومعرفة العلل الخفية ، وظهر الكلام في بعض الرواة لكن على قلة ، لقلة الرواة المجروحين في أول الأمر .

ثم توسع العلماء في ذلك حتى ظهر البحث في علوم كثيرة تتعلق بالحديث من ناحية ضبطه وكيفية تحمله وأدائه ، ومعرفة ناسخه من منسوخه وغريبه وغير ذلك ، إلا أن ذلك كان يتناقله العلماء شفوياً .

ثم تطور الأمر وصارت هذه العلوم تكتب وتسجل، لكن في أمكنة متفرقة من الكتب ممزوجة بغيرها من العلوم الأخرى كعلم الأصول وعلم الفقه وعلم الحديث ، مثل كتاب الرسالة وكتاب إلام للإمام الشافعي .

وأخيرا لما نضجت العلوم واستقر الاصطلاح ، واستقل كل فن عن غيره ، وذلك في القرن الرابع الهجري ، أفرد العلماء علم المصطلح في كتاب مستقل ، وكان من أول من أفرده بالتصنيف القاضي أبو محمد الحسن بن عبدالرحمن بن خلاد الرامهرمزي المتوفي سنة ٣٦٠هـ في كتابه "المحدث الفاصل بين الراوي والواعي" : وسأذكر أشهر المصنفات في علم المصطلح من حين إفراده بالتصنيف إلى يومنا هذا

---

[15] مقدمة صحيح مسلم

# پـێشەکی

* کورتەیەکی مێژوویی دەربارەی نەشونما کردنی زاراوە ناسی ( علم المصطلح ) و ئەو قۆناغانەی کە پیایدا تێپەڕ بووە .

* بەناوبانگترین دانراوەکان لەم زانستی زاراوە ناسی یەدا

* چەند پێناسەیەکی سەرەتایی .

**كورتەيەكی مێژوويی دەربارەی نەشونماكردنی، (علم المصطلح) و ئەو قۆناغانەی كە پيايدا تێپەڕبووە.**

لێكۆڵەرەوەی سەرناس (المُتَفَحِّصْ) تێبینی ئەوە دەكات، كە بنەماو پایە ڕیشەییەكانی ...تـتی ڕیوایەت و گێڕانەوەی فەرموودە لە قورئانی پیرۆزو سوننەتی پێغەمبەردا (ﷺ) هاتووە، خوای گەورە لە قورئانی پیرۆزدا دەفەرمووێ (يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا إِنْ جَاءَكُمْ فَاسِقٌ بِنَبَإٍ فَتَبَيَّنُوا) (الحجرات:٦) واتە : ئەی ئەوانەی بڕواتان هێناوە ! ئەگەركەسێكی تاوانبار هەواڵێكی بۆتان هێنا جا بكۆڵنەوە نەكا لەڕووی نەزانییەوە بەخەڵكی تر زیان بگەیەنن، جا لەكارێ كە كردوتانە ، پەشیمان ببنەوە وەلە فەرموودەی پێغەمبەردا (ﷺ) هاتووە كە دەفەرمووێ (نضر الله أمرأ سمع مناً شيئا فبلّغه كما سمعه فرب مبلغ أوعى من سامع) [١٦]

وەلە ڕیوایەتێكا هاتووە :(فرُبَّ حامل فقه إلى من هو أفقه منه ورب حامل فقه ليس بفقيه) [١٧].

واتە : خوا پیت بخاتە كاری كەسێكەوە كە شتێكمان لێ دەبیستێ و بەو شێوەیەی كە بیستویەتی دەیگەیەنێتەوە، جا هەندێ پێ ڕاگەیەنرا و هەیە كەلە گوێگر وریاترەو تێگەیشتوترە. وەلە گێڕانەوەیەكی تر : وەهەندێ لە هەڵگری فیقهـ، هەیە كە كەسێكی تر هەیە لەو فیقهـ، زاناترە، وەهەندێ كەس هەیە كەهەڵگری شەرع (فقه)ەو كەچی شەرعزان (فقيه)نییە.

جالەو ئایەتە پیرۆزەو لەو فەرموودە بەپێزەدا پرۆگرامی پێداگیری (التثبت)لە وەرگرتنی فەرموودەو چۆنیەتی وەرگرتنی لەڕووی بێداری و شارەزایی و وردەكارییەوەی تیادایە لە گواستنەوەیدا بۆ كەسانی تر .

---

١٦ الترمذي : كتاب العلم : وقال عنه حسن صحيح.

١٧ المصدر نفسه، لكن قال عنه حسن، و روى الحديث أبوداود وأبن ماجة وأحمد.

وە وەك گوێڕایەڵیەك بۆ فەرمانی خوای گەورەو پێغەمبەرەکەی (ﷺ) هاوەڵان (رضي الله عنهم) زۆر پێداگیریان دەکرد لە گواستنەوە (النقل)ی فەرمودەداو لەوەرگرتنیدا، بەتایبەتی کە ئەگەر گومانیان هەبوایە لە ڕاستگۆیی گوێزەرەوەکەیدا هەرلەبەر ئەمەش بابەتی ڕشتە (سند)کە زۆربەنرخە بۆ وەرگرتن یان وەرنەگرتنی فەرمووده هاتەکایەوە.

لەپێشەکی (صحیح مسلم)دا هاتووە، لە (ابن سیرین)ەوە کە دەڵێت: نەدەپرسرایەوە لەسەنەد، بەڵام کە فیتنە سەری هەڵدا، دەیان گوت، ناوی پیاوەکان ، واتە ئەوانەی سەنەدەکە بڵێ، جا ئەوانەی کە ئەهلی سوننە بوون فەرمودەکانیان لێ وەردەگیرا ئینجا ئەوانەش کە (أهل البدع)بوون، فەرموودەیان لێ وەرنەدەگیرا[١٨]، جا لەبەرئەوەی کەفەرمووده لەدوای ناسینی سەنەدەکەیەوە نەبێت وەرناگیرێ ، بۆیە زانستی (الجرح والتعدیل) و قسەکردن لەسەر ڕاوییەکان و ناسینی (متصل و منقطع)ی سەنەدەکان و ناسینی (العلل الخفیة) هاتە کایەوە و وەدەرکەوت و هەروەها قسەکردن لەسەر هەندێ ڕاوی هاتە کایەوە بەڵام بەکەمی ئەمەش لەبەر کەمی گێڕەرەوەی تانە لێدراو(مجروح)لە سەرەتاوە — واتە لەو کاتەدا .

پاشان زانایان لەم بارەیەوە زیاتر لایەنەکەیان فراوانتر کرد تا باسکردن

و لێکۆڵینەوە لەسەر زانست گەلێك کە پەیوەست بوون بەفەرموودەوە لەڕووی (ضبط)کردن و چۆنیەتی هەڵگرتن و دانەوەیەوە و ناسینی (ناسخ) و (منسوخ) و (غریب) و هتد .... هاتەکایەوە ئەمە زانایان بە سەرەکی دەیان گواستەوە .

پاشان شتەکە بەرەو پێش چوو، وەوای لێهات ئەو زانستانە دەنوسرانەوەو تۆمار دەکران، بەڵام لەچەند شوێنێکی پەڕاگەندەوە لەکتێبەکاندا، کەبەزانستەکانی تریشەوە تێکەڵ کرابوون، وەك زانستی (أصول) و زانستی (فقه) و زانستی (حدیث) وەك کتێبی (الرسالة) و کتێبی (الأم)ی ئیمامی شافیعی، جا لەکۆتاییدا کە زانستەکان پێگەیشتن و زاراوەش (الأصطلاح)

---

١٨ مقدمة صحیح مسلم.

جێگیر بوو، هەموو زانستێ سەربەخۆ بوو، لەهی تر جیا بۆوە، کەئەمەش لەسەدەی چوارەمی هیجریدا بوو، زانایان ئەم زاراوە ناسییە (علم المصطلح)یان، لەکتێبی سەربەخۆدا جیا کردەوە، یەکەم کەسێك کە کتێبی تایبەتی تیادا دانا (القاضي أبو محمد الحسن بن عبدالرحمن بن خلاد الرامهرمزي )بوو کەلە ساڵی (٣٦٠)هـ دا کۆچی دوایی کردووە لەکتێبەکەیدا (المحدث الفاصل بين الراوى والواعى)، جا بە ناوبانگترین دانراوی(علم المصطلح)هەر لە سەرەتای جیاکردنەوەیانەوە لە ڕووی دانانەوە، هەتا ئێستا باس دەکەم .

## أشهَر المصنفات في علم المصطلح:

### ١- المحدث الفاصل بين الراوي والواعي :

صنفه القاضي أبو محمد الحسن بن عبدالرحمن بن خلاد الرامهرمزي المتوفي في سنة ٣٦٠هـ لكنه لم يستوعب أبحاث المصطلح كلها ، وهذا شأن من يفتتح التصنيف في أي فن أو علم غالباً .

### ٢- معرفة علوم الحديث:

صنفه أبو عبدالله محمد بن عبدالله الحاكم النيسابوري المتوفي سنة ٤٠٥هـ لكنه لم يهذب الأبحاث ولم يرتبها الترتيب الفني المناسب .

### ٣- المستخرج على معرفة علوم الحديث :

صنفه أبو نعيم أحمد بن عبدالله الاصبهاني المتوفي سنة ٤٣٠هـ ، استدرك فيه على الحاكم ما فاته في كتابة " معرفة علوم الحديث " من قواعدَ هذا الفن ، لكنه ترك أشياء يمكن للمتعقب أن يستدركها عليه أيضاً .

٤- الكفاية في علم الرواية :

صنفه أبو بكر أحمد بن على بن ثابت الخطيب البغدادي المشهور المتوفي سنة ٤٦٣هـ ، وهو كتاب حافل بتحرير مسائل هذا الفن ، وبيان قواعد الرواية ، ويعتبر من أجلِّ مصادر هذا العلم "

٥_ الجامع لأخلاق الراوي وآداب السامع:

صنفه الخطيب البغدادي أيضا ، وهو كتاب يبحث في آداب الرواية كما هو واضح من تسميته وهو فريد في بابه ، قيِّم في أبحاثه ومحتوياته ، وقلَّ فن من فنون علوم الحديث إلا وصنف الخطيب فيه كتاباً مفرداً ، فكان كما قال الحافظ أبوبكر بن نقطة : " كل من أنصف علم أن المحدثين بعد الخطيب عِيال على كُتبه ".

٦- الإلماع إلى معرفة أصول الرواية وتقييد السماع :

صنفه القاضي عياض بن موسي اليحصبي المتوفي سنة ٥٤٤هـ ، وهو كتاب غير شامل لجميع أبحاث المصطلح ، بل هو مقصور على ما يتعلق بكيفية التحمل والأداء وما يتفرغ عنها لكنه جيد في بابه ، حسن التنسيق والترتيب .

٧- مالا يسع المحدث جهله :

صنفه أبو حفص عمر بن عبدالجيد الميانجي المتوفي سنة ٥٨٠هـ ، وهو جزء صغير ليس فيه كبير فائدة .

٨- علوم الحديث :

صنفه أبو عمرو عثمان بن عبدالرحمن الشهرزوري المشهور بابن الصلاح المتوفي سنة ٦٤٣هـ وكتابه هذا مشهور بين الناس بـ " مقدمة ابن الصلاح "

وهو من أجود الكتب في المصطلح جمع فيه مؤلفه ما تفرق في غيره من كتب الخطيب ومن تقدمه ، فكان كتاباً حافلاً بالفوائد ، لكنه لم يرتبه على الوضع المناسب لأنه أملاه شيئاً فشيئاً ، وهو مع هذا عمدة من جاء بعده من العلماء فكم من مختصر له وناظم ومعارض له ومنتصر .

**٩-التقريب والتيسير لمعرفة سنن البشير النذير :**

صنفه محيي الدين يحيي بن شرف النووي المتوفي سنة ٦٧٦هـ ، وكتابه هذا اختصار لكتاب " علوم الحديث " لابن الصلاح ، وهو كتاب جيد ، لكنه مغلق العبارة أحياناً .

**١٠-تدريب الراوي في شرح تقريب النواوي :**

صنفه جلال الدين عبدالرحمن بن أبي بكر السيوطي المتوفى سنة ٩١١هـ ، وهو شرح لكتاب تقريب النواوي كما هو واضح من اسمه ، جمع فيه مؤلفه من الفوائد الشيء الكثير.

**١١-نظم الدرر في علم الأثر:**

صنفها زين الدين عبدالرحيم بن الحسين العراقي المتوفى سنة ٨٠٦هـ ومشهورة باسم "ألفية العراقي " نظم فيها " علوم الحديث " لابن الصلاح ، وزاد عليه وهي جيدة غزيرة الفوائد وعليها شروح متعددة ، منها شرحان للمؤلف نفسه .

**١٢-فتح المغيث في شرح ألفية الحديث :**

صنفه محمد بن عبدالرحمن السخاوي المتوفى سنة ٩٠٢هـ ، وهو شرح على ألفية العراقي، وهو من أوفى شروح الألفية وأجودها .

### ١٣-نخبة الفكر في مصطلح أهل الأثر:

صنفه الحافظ ابن حجر العسقلاني المتوفى سنة ٨٥٢هـ ، وهو جزء صغير مختصر جداً ، لكنه من انفع المختصرات وأجودها ترتيباً ، ابتكر فيه مؤلفه طريقة في الترتيب والتقسيم لم يُسْبَق إليها ، وقد شرحه مؤلفه بشرح سماه " نزهة النظر " كما شرحه غيره .

### ١٤-المنظومة البيقونية :

صنفها عمر بن محمد البيقوني المتوفى سنة ١٠٨٠هـ، وهي من المنظومات المختصرة ، إذ لا تتجاوز أربعة وثلاثين بيتاً ، وتعتبر من المختصرات النافعة المشهورة ، وعليها شروح متعددة .

### ١٥-قواعد التحديث:

صنفه محمد جمال الدين القاسمي المتوفى سنة ١٣٣٢هـ وهو كتاب محرر مفيد ، وهناك مصنفات أخرى كثيرة يطول ذكرها اقتصرت على ذكر المشهور منها ، فجزي الله الجميع عنا وعن المسلمين خير الجزاء .

## بەناوبانگترینی دانراوەکانی ( علم المصطلح )

### ١.(المحدث الفاصل بين الراوي والواعي ) :

(قاضی ابو محمد الحسن بن عبدالرحمن بن خلاد الرامهرمزی) دایناوە، کە لە ساڵی (٣٦٠ هـ)دا کۆچی دوایی کردووە، بەڵام سەرجەم باسەکانی (مصطلح)ی لەخۆنەگرتووە، هەرکەسێکیش کەسەرەتای کتێب دانانی بێت لەهەربابەتێکا یان لە هەر زانستێکدا بەزۆری هەر وایە .

**٢. ( معرفة علوم الحديث ) :**

(أبو عبدالله محمد بن عبدالله الحاكم النيسابوري)دايناوه، كهلهسالّی (٤٠٥ ه)كۆچی دوایی كردووه، بهلاّم باسهكانی پوخت نهكردووه، وهشێوازێكی ڕێكخستنی هونهری گونجاوی بهكارنههێناوه .

**٣.(المستخرج على معرفة علوم الحديث ) :**

(أبو نُعَيم أحمد بن عبدالله الأصفهاني)دايناوه، كهلهسالّی"٤٣٠"ه كۆچی دوایی كردووه، له ڕێساكانی ئهم زانستهدا ئهوشتانهی كه (حاكم)له كتێبی (معرفةعلوم الحديث)دا لهدهستی داون، ئهم هێناونی بهلاّم چهند شتێكیشی تهرك كردووه، كه بۆ كهسیّ كهلهدوایهوه كاری لهسهر بكات دهتوانیّ ئهوشتانهش بهێنیّ .

**٤.( الكفاية في علم الرواية ):**

(أبوبكر أحمد بن علي بن ثابت الخطيب البغدادي)ی دايناوه كهلهسالّی (٤٦٣ ه)كۆچی دوایی كردووه، ئهم كتێبه پڕه له نوسینهوهی بابهتهكانی ئهم زانسته و ڕونكردنهوهی ڕێساكانی ڕیوایهت ، وهبه شكۆمهندترینی سهرچاوهكانی ئهم زانسته دادهنرێت .

**٥.( الجامع لأخلاق الراّوي وأداب السامع ):**

ئهمیش (الخطيب البغدادي)دايناوه، كتێبێكه دهربارهی ئادابهكانی ڕیوایهت باس دهكات ههروهك بهناوهكهیدا دیاره،كتێبێكه لهبواری خۆیدا تاكه و كرۆكهكهی زۆر گرنگه، مهگهر زۆر بهكهمی دهنا لهسهرجهم بابهتهكانی زانستی فهرمودهدا (الخطيب) كتێبی سهربهخۆی تیادا داناوه جا وایه، كه (الحافظ أبوبكر بن نقطة)دهڵێت : ههركهسێك كهویژدانی ههبێت، دهزانیّ كهفهرموودهناسهكانی دوای (الخطيب) ههموویان پێویستیاری كتێبهكانی ئهون .

**٦.(الألماع إلى معرفة أصول الرواية وتقييد السماع ):**

(القاضي عياض بن موسّى اليحصُبي)دايناوه كهلهسالّی"٥٤٤"ه، كۆچی دوایی كردووه

که کتێبێکی گشتگیر نی یه بۆ سەرجەم باسەکانی زانستی (مصطلح) ، بەڵکو لەسەر ئەو شتانه کورت هەڵهێنراوە، که پەیوەستن به چۆنیەتی وەرگرتن و دانەوەی فەرمودەو ئەو بابەتانەی که لەمانه دەبنەوه ، بەڵام لەبابەتەکەی خۆیدا زۆر باشه ، و لەڕووی پێوەندی و ڕێکخستنیشەوه زۆر جوانه .

٧.(**ما لايَسَعُ الُمحَدِّثَ جَهْلَهُ**) :

(ابو حفص عمر بن عبدالمجيد الميانجي) دایناوه، کەله ساڵی (٥٨٠) کۆچی دوایی کردووه، که جوزوەیەکی بچووکه، و سوودی گەورەو زۆری نییه .

٨.(**علوم الحديث**) :

(أبو عمرو عثمان بن عبدالرحمن)ی شارەزووری ناسراو به (ابن الصلاح)دایناوه کەلەساڵی (٦٤٣ ه)دا کۆچی دوایی کردووه وەئەم کتێبەی لەناو خەڵکدا به (**مقدمة ابن الصلاح**)ناسراوه وەلەسەخاوەت مەندترین کتێبەکانی (مصطلح)ە، که دانەرەکەی تیایدا ئەو شتانەی کەجیاوازن لەم بارەوه ، لەکتێبەکانی (الخطيب)و ئەوانەی پێش ئەو کۆی کردۆتەوه وەکتێبێکی پڕ له سووده بەڵام لەسەر شێوازێکی گونجاو ڕێکی نەخستووه، چونکه شت لەدوای شت وتویەتیەوەو یەکی خستووه وەلەگەڵ ئەمەشدا پاڵپشتێك بووه بۆ ئەو زانایانەی کەله دوایەوه هاتوون ، هەیه کورتی کردۆتەوه، هەیه ڕێکی خستووه، هەیه بەرەنگاری بۆتەوەو هەیه پاڵپشتی لێ کردووه.

٩.(**التقريب والتسيير لمعرفة سنن البشير النذير**):

(محي الدين يحيى بن شرف النواوي) دایناوه که لەساڵی"٦٧٦"ه دا کۆچی دوایی کردووه وەئەم کتێبەی کورت کردنەوەیه بۆ کتێبی (علوم الحديث) ی (ابن صلاح)وه کتێبێکی باشه بەڵام جارجاره عیبارەتەکانی داخراو، و ڕەقن .

**١٠.( تدريب الراوي في شرح تقريب النواوي ):**

(جلال الدين عبدالرحمن بن ابى بكر السيوطي)دايناوه كەلەسالّى (٩١١ ھ)كۆچى دوايى كردووە كە شەرحى كتێبى (تقريب النواوي)يە هەروەك لەناوەكەيەوە ديارە كە دانەرەكەى تيايدا سودێكى زۆرى كۆكردۆتەوە .

**١١.( نظم الدُّرر في علم الأثر ):**

(زين الدين عبدالرحيم بن الحسين العراقي)دايناوه ، كەلەسالّى (٨٠٦ ھ)كۆچى دوايى كردووە كەبەناوى (الفية العراقي) ناسراوە، كەتيايدا (علوم الحديث)ى (أبن الصلاح)ى هۆندۆتەوە وەشتى لەسەر زياد كردووە، زۆر باشەو سوود مەندە ، چەندەها شەرحى لەسەر كراوە، لەوانە دووشەرحى خودى دانەرەكەيەتى .

**١٢.( فتح المغيث في شرح الفية الحديث ):**

(محمد بن عبدالرحمن السخاوى)دايناوه كە لە سالّى (٩٠٢ ھ)كۆچى دوايى كردووە كەئەمەش شەرحێكە لەسەر كتێبى (الفية العراقي)كەلە فراوانترين و دەولّەمەندترينى شەرحەكانى ئەلفيەيە .

**١٣.( نخبة الفكر في مصطلح أهل الأثر ):**

(الحافظ ابن حجر العسقلاني)دايناوه كەلەسالّى (٨٥٢ ھ)كۆچى دوايى كردووە كە جوزوەيەكى بچوكەو زۆريش كورتە بەلاّم لە سوود مەندترينى كورتيلەكانەو باشترينيانە لەڕوى ڕێكخستنەوە تيايدا دانەرەكەى ڕێبازێكى لە ڕێكخستن و دابەشكارى داهێناوە كە لە پێشيەوە كەسى تر نەى كردووە وەهەر دانەرەكەشى شەرحى كردووە، كەناوى ناوە (نزهة النظر)هەروەك هى تريش شەرحيان كردووە .

**١٤.( المنظومة البيقونية ):**

(عمر بن محمد البيقوني)دايناوه كە لەسالّى (١٠٨٠ ھ)كۆچى دوايى كردووە كەلەو

کتێبە کورتانەیە، کە هۆندنەوەی بۆ کراوە کەلەسیو چوار دێڕ تێپەڕناکات وەبە کتێبە بەسوودە ناسراوەکان دادەنرێت، وەچەندەها شەرحی لەسەرکراوە .

١٥.( **قواعد التحديث** ) :

(محمد جمال الدين القاسمي)دایناوە ، کەلەساڵی (١٣٣٢ هـ) کۆچی دوایی کردووە ، کە کتێبێکی دارێژراوو نوسراو (محرر)ی بەسودە، وە لێرەدا دانراوی زۆرتر هەیە کەناوهێنانیان زۆر دەکێشێ بۆیە کورتم هەڵهێنا لەسەر باس کردنی ناسراوەکانیان و، وەستام، خودا پاداشتی هەموو لایەك بداتەوە.

(فجزى الله الجميع عنا وعن المسلمين خير الجزاء).

## تعريفات أولية:

**١- علم المصطلح :**

علم بأصول وقواعد يعرف بها أحوال السند والمتن من حيث القبول والرد.

**٢- موضوعه:**

السند والمتن من حيث القبول والرد.

**٣- ثمرته :**

تمييز الصحيح من السقيم من الأحاديث.

**٤- الحديث:**

أ) لغة: الجديد. ويجمع على أحاديث على خلاف القياس .

ب) اصطلاحا : ما أضيف إلى النبي صلى الله عليه وسلم من قول أو فعل أو تقرير أو صفة.

**٥- الخَبَر:**

أ) لغة: النبأ . وجمعه أخبار .

ب) اصطلاحاً: فيه ثلاثة أقوال وهي:

١) هو مرادف للحديث: أي إن معناهما واحد اصطلاحاً.

٢) مغاير له: فالحديث ما جاء عن النبي صلى الله عليه وسلم. والخبر ما جاء عن غيره.

٣) أعم منه: أي إن الحديث ما جاء عن النبي صلى الله عليه وسلم والخبر ما جاء عنه أو عن غيره.

٦- الأثر:

أ) لغة: بقية الشيء.

ب) اصطلاحاً: فيه قولان هما:

١) هو مُرادف للحديث: أي أن معناهما واحد اصطلاحاً.

٢) مُغاير له: وهو ما أُضيف إلى الصحابة والتابعين من أقوال أو أفعال.

٧- الإسناد: له معنيان:

أ) عَزْو الحديث إلى قائله مسنداً .

ب) سلسلة الرجال المُوصلة للمتن . وهو بهذا المعنى مرادف للسند .

٨- السند:

أ) لغة: المعتمد. وسمي كذلك لأن الحديث يستند إليه ويعتمد عليه .

ب) اصطلاحا: سلسلة الرجال الموصلة للمتن.

٩- المتن:

أ) لغة: ما صلب وارتفع من الأرض.

ب) اصطلاحاً: ما ينتهي إليه السند من الكلام.

١٠- المُسنَد: ( بفتح النون )

أ) لغة: اسم مفعول من أسند الشيء إليه بمعنى عزاه ونسبه له.

ب) اصطلاحاً: له ثلاثة معان.

١) كل كتاب جمعَ فيه مرويات كل صحابي على حِدَة .

٢) الحديث المرفوع المتصل سنداً .

٣) إن يُراد به " السند " فيكون بهذا المعنى مصدراً ميمياً.

١١- المُسْنِد : ( بكسر النون )

هو من يروي الحديث بسنده . سواء أكان عنده علم به. أم ليس له إلا مجرد الرواية

١٢- المُحدث:

هو من يشتغل بعلم الحديث رواية ودراية . ويطلع على كثير من الروايات وأحوال رواتها.

١٣- الحافظ : فيه قولان :

أ) مرادف للمحدث عند كثير من المحدثين.

ب) وقيل هو أرفع درجة من المحدث . بحيث يكون ما يعرفه في كل طبقة أكثر مما يجهله.

١٤- الحاكم:

هو من أحاط علماً بجميع الأحاديث حتى لا يفوته منها إلا اليسير على رأي بعض أهل العلم.

## چەند پێناسەیەکی سەرەتایی

**١. زاراوە ناسی (علم المصطلح):**

زانستێکە کە بەهۆی چەند بنەماو ڕێسایەکەوە حاڵەتی ڕشتە (السند) و تێکست (المتن)دەزانرێ، لەڕووی وەرگرتن یان وەرنەگرتنەوە .

**٢. بابەتی ئەم زانستە :**

بریتییە لە باسکردنی سەنەدومەتن لەڕووی وەرگرتن یان وەرنەگرتنەوە.

**٣. بەرهەمەکەی :**

بریتییە لەجیاکردنەوەی فەرموودەی ڕاست (الصحیح) و ناڕاست (السقیم) لەیەکتر.

**٤. فەرموودە (الحدیث):**

**أ.لەڕووی زمانەوە** : بەمانای تازە دێت ، وەبە پێچەوانەی قیاسەوە لەزمانی عەرەبدا جەمعەکەی (أحادیث)ە.

**ب.لەڕووی زاراوەوە** :ئەوەیە کە بدرێتە پاڵ پێغەمبەر (ﷺ) لەگوفتارو کردارو پەسەند کراو و ئاوەڵناو (صفة) بۆی.

**٥.هەواڵ (الخبر) :**

**أ.لەڕووی زمانەوە** :بەمانای هەواڵ (النبأ)دێت ، کە جەمعەکەی (أخبار)ە .

**ب.لەڕووی زاراوە:** سێ گووتەی لەسەرە:

**١.(الخبر) هاوڕێکی (الحدیث)ە** : واتە لەڕووی زاراوەوە ماناکەیان یەکێکە .

**٢.پێچەوانەی یەکترن** : (الحدیث) ئەوەیە کەلە پێغەمبەرەوە (ﷺ) و (خبر) ئەوەیە کەلە غەیری پێغەمبەرەوەیە (ﷺ) .

**٣.لە (حدیث) گشتی ترە** : واتە : (حدیث) ئەوەیە کە لەپێغەمبەرەوە (ﷺ) هاتووە، و (خبر) ئەوەیە کەلەپێغەمبەریش (ﷺ) و غەیری پێغەمبەریشەوە (ﷺ) هاتووە .

**٦.ڕێچکە (الأثر) :**

**أ.لەڕووی زمانەوە** : واتە پاشماوەی شتێك .

**ب.لەڕووی زاراوەوە:** دوقسەی لەسەرە کە ئەمانەن:

١.**ئەوەیە کە هاوڕێکی (حدیث)ە** :واتە، لەڕووی زاراوەوە یەك مانایان هەیە .

٢.**پێچەوانەیەتی** : ئەوەیە کە درابێتە پاڵ هاوەڵێ یان تابعی یەك لە گوفتارو کردار .

٧.**(الأسناد)** :کە دوو مانای هەیە :

أ.دانە پاڵی فەرمودەکە بۆ لای بێژەرەکەی .

ب.زنجیرەی ئەو پیاوانەی کەئەو مەتنە دەگەیەنن جا بەم مانایە هاوڕێکی (سند)ە .

**٨. ڕشتە (السند) :**

**أ.لەڕووی زمانەوە** : بەمانای پشت پێ بەستراو (المعتمد)دێت هەرلەبەر ئەوەش واناونراوە، چونکە فەرمودەکە پشتی پێدەبەسترێ و ئیعتیمادی دەخرێتە سەر .

**ب.لەڕووی زاراوەوە** : زنجیرەی ئەو پیاوانەیە کەمەتنەکە دەگەیەنن

**٩.تێکست (المتن) :**

**أ.لەڕووی زمانەوە:** ئەو شتە یە، کە دەرکەوێت و بەرزبێتەوە لەزەوی.

**ب.لە ڕووی زاراوەوە:** ئەوەیە کە جگە لەسەنەدەکە، دەمێنێتەوە .

١٠.**(المسنَد)** : بەفەتحەی نونەکە :

**أ.لەڕووی زمانەوە** : ئیسمی مەفعولە، بەمانای (أسند الشئ أليه) واتە درایە پاڵی دێت.

**ب:لەڕووی زاراوە** : سێ مانای هەیە :

١.هەموو ئەو کتێبانەیە کەتیایدا ڕیوایەتی هەموو هاوەڵێك بەگوێرەی خۆی کۆکرابێتەوە .

٢.بەفەرموودەی مەرفوع و ڕشتە پەیوەست (متصل السند)دەوترێ .

٣.مەبەست پێی (السند)ە ، کە بەم واتایە بێت مەصدەرێکی میمییە .

**١١.(المسنِد)بەکەسرەی نونەکە:**

ئەوەیە کە فەرموودە ڕیوایەت دەکات بەسەنەدەکەی خۆی ئیتر ئایا ئەوەی کەلەلایەتی زانایە پێی یان تەنها ڕیوایەتە و هیچی تر .

**١٢.فەرموودە ناس (المحدث):**

ئەوەیە کەسەرقاڵە بەزانستی فەرموودەوە، لەڕووی گێڕانەوە (روایة)و پێزانین (درایة)ەوە وەئاگای بەزۆری ڕیوایەتەکان و چۆنیەتی ڕاوییەکان هەبێت .

**١٣. (الحافظ) دوو قسەی لەسەرە :**

أ.لەلای زۆربەی فەرمودە ناسان هاوماناى (محدث)ە.

ب.وتراوە کەپلەی بەرزترە لە (محدِّثْ)، بە جۆرێك کە ئەوەی کەلەهەر (طبقة)ئاستێکدا، کە دەیزانێت زیاترە لەوەی کە بێ ئاگایە لێی .

**١٤.(الحاکم):**

ئەوەیە کە زانستەکەی قاڵە بەسەر هەموو فەرمودەکاندا، بەجۆرێك کە هیچی لەدەست دەرنەچووە لێیان تەنها کەمێك نەبێت، ئەمەش لەسەر ڕای هەندێ لە ئەهلی عیلم .

# الباب الأول

- الخبر

- الفصل الأول : تقسيم الخبر باعتبار وصوله إلينا .
- الفصل الثاني : الخبر المقبول
- الفصل الثالث : الخبر المردود .
- الفصل الرابع : الخبر المشترك بين المقبول والمردود .

- تقسيم الخبر باعتبار وصوله إلينا

* ينقسم الخبر باعتبار وصوله إلينا إلى قسمين:

١- فان كان له طرق بلا حَصْرٍ عدد معين فهو المتواتر .

٢- وإن كان له طرق محصورة بعدد معين فهو الآحاد.

و لكل منهما أقسام وتفاصيل ، سأذكرها وأبسطها إن شاء الله تعالى وأبدا ببحث المتواتر.

# بەندی یەکەم

(الخبر) بمانای فەرمووده

بەشی یەکەم : دابەش کردنی فەرمووده بەگوێرەی گەیشتنی بە ئێمە .

بەشی دووەم : فەرموودەی وەرگیراو .

بەشی سێ یەم : فەرموودەی وەرنەگیراو .

بەشی چوارەم : فەرموودەی بەشدار لەنێوان وەرگرتن و وەرنەگرتن دا .

بەشی یەکەم

دابەش کردنی فەرمووده بەگوێرەی گەیشتنی بەئێمە

فەرمووده بەگوێرەی گەیشتنی بەئێمە دەبێتە دوو بەشەوە :

١.ئەگەر چەندەها رێگای بێ ئەژماری هەبوو بەبێ حەسر ئەوا موتەوا تیرە .

٢.ئەگەرچەند رێگایەکی دیاری کراوو بەژمارە دیاری کراوی هەبوو، ئەوە (أحاد)ە.

وەبۆ هەریەکەیان چەند بەشێ هەیە و لەسەر رۆیشتن (تفصیل)یان هەیە،کە باسیان دەکەم ورِوونیان دەکەمەوە ، إنشاو الله ، جا دەست دەکەم بەباس کردنی موتەواتیر.

# المْبحَثُ الأول

## الخبر المتواتر

**١- تعريفه :**

أ) لغة: هو اسم فاعل مشتق من المتواتر أي التتابع، تقول تواتر المطر أي تتابع نزوله.

ب) اصطلاحا: ما رواه عدد كثير تُحيل العادة تواطؤهم على الكذب.

**ومعنى التعريف:** أي هو الحديث أو الخبر الذي يرويه في كل طبقة من طبقات سنده رواة كثيرون يحكم العقل عادة باستحالة أن يكون أولئك الرواة قد اتفقوا على اختلاق هذا الخبر.

**٢- شروطه:**

يتبين من شرح التعريف أن التواتر لا يتحقق في الخبر إلا بشروط أربعة وهي:

أ) أن يرويه عدد كثير. وقد اختلف في أقل الكثرة على أقوال المختار أنه عشرة أشخاص [١٩]

ب) أن توجد هذه الكثرة في جميع طبقات السند.

ت) أن تُحيل العادة تواطؤهم على الكذب [٢٠] .

ث) أن يكون مُسْتَنَد خبرهم الحس .

---

١٩تدريب الراوي جـ٢ ـ ص ١٧٧ .

٢٠وذلك كأن يكونوا من بلاده مختلفة. وأجناس مختلفة. ومذاهب مختلفة وما شابه ذلك. وبناء على ذلك فقد يكثر عدد المخبرين ولا يثبت للخبر حكم المتواتر. وقد يقل العدد نسبياً ويثبت للخبر حكم المتواتر . وذلك حسب أحوال الرواة.

كقولهم سمعنا أو رأينا أو لمسنا أو ..... أما إن كان مستند خبرهم العقل. كالقول بحدوث العالم مثلا . فلا يسمي الخبر حينئذ متواتراً .

**٣- حُكمه :**

المتواتر يفيد العلم الضروري، أي اليقيني الذي يضطر الإنسان إلى التصديق به تصديقاً جازماً كمن يشاهد الأمر بنفسه كيف لا يتردد في تصديقه، فكذلك الخبر المتواتر. لذلك كان المتواتر كله مقبولا ولا حاجة إلى البحث عن أحوال رواته.

**٣- أقسامه:**

ينقسم الخبر المتواتر إلى قسمين هما، لفظي ومعنوي.

أ) المتواتر اللفظي: هو ما تواتر لفظه ومعناه. مثل حديث " من كذب عليَّ معتمداً فليتبوأ مقعده من النار " رواه بضعة وسبعون صحابياً .

ب) المتواتر المعنوي: هو ما تواتر معناه دون لفظة.

مثل : أحاديث رفع اليدين في الدعاء . فقد ورد عنه صلى الله عليه وسلم نحو مائة حديث. كل حديث منها فيه أنه رفع يديه في الدعاء .لكنها في قضايا مختلفة فكل قضية منها لم تتواتر، والقَدر المشترك بينها ـ وهو الرفع عند الدعاء ـ تواتر باعتبار مجموع الطرق. [٢١]

**٥) وجوده :**

يوجد عدد لا بأس به من الأحاديث المتواترة ، منها حديث الحوض ، وحديث المسح على الخفين ، وحديث رفع اليدين في الصلاة وحديث نضر الله

---

٢١ تدريب الراوي جـ٢ ـ ص ١٨٠

أمراً، وغيرها كثير ، لكن لو نظرنا إلى عدد أحاديث الآحاد لوجدتا أن الأحاديث المتواترة قليلة جداً النسبة لها .

**٦) أشهر المصنفات فيه :**

لقد اعتني العلماء بجمع الأحاديث المتواترة وجعلها في مصنف مستقل ليسهل على الطالب الرجوع إليها. فمن تلك المصنفات:

أ) الأزهار المتناثرة في الأخبار المتواترة : للسيوطي . وهو مرتب على الأبواب.

ب) قطف الأزهار للسيوطي أيضاً . وهو تلخيص للكتاب السابق .

ت) نظم المتناثر من الحديث المتواتر : لمحمد بن جعفر الكتاني .

# باسی یەکەم، (المبحث الأول)

## فەرموودەی موتەواتیر

**١.پێناسەکەی :**

**أ.لە ڕووی زمانەوە** : ئیسمی فاعیلەو لە (التواتر) ەوە وەرگیراوە، کە بەمانای یەك لەدوای یەك (التتابع) دێت، جا کە دەڵێیت : (تواتر المطر) باران باری، واتە یەك لە دوای یەك دەباری .

**ب.لە ڕووی زاراوەوە** : ئەو فەرمودەیەیە کە ژمارەیەکی زۆر بیگێڕنەوە، کە شتەکی عادەتی نەبێت، کە ئەوانە لەسەر درۆ ڕێك بکەون .

**واتای پێناسەکە** : واتە ئەو فەرمودەیە (الحدیث، الخبر)ـە یە، کە لە هەموو ئاستێك لە ئاستەکان (الطبقة) ی سەنەدەکەدا بیگێڕنەوە، چەند ڕاوی یەکی زۆر، کە بە گوێرەی عادەت عەقڵ دانی پیادا نەنێت، کە ئەوڕاوی یانە کۆبووبنەوە، لەسەر شێواندنی ئەو فەرموودەیە.

**٢.مەرجەکانی**:لە ڕونکردنەوەی پێناسەکەوەدەردەکەوێت کە موتەواتیر بونی فەرموودە بەچوار مەرج نەبێت نایەتە دی کە ئەمانەن :

أ.دەبێ ژمارەیەکی زۆر بیگێڕنەوە وەلەسەر لایەنی کەمی ئەو ژمارە زۆرە ڕا جیایی هەیە ، لەسەرچەند قسەیەك، کە ڕای هەڵبژێرراو ئەوەیە کەدە کەسن. [٢٢]

ب.دەبێت ئەو ژمارە زۆرە لەسەرجەم ئاستەکانی سەنەدەکەدا هەبن .

---

٢٢ تدريب الراوی ج٢ — ص ١٧٧ .

ج.دەبێت عادەتی نەبێت کەئەوانە لەسەر درۆ کۆ ببنەوە. [٢٣]

د.پێویستە ئەو فەرموودەیە یان ئەندامەکانی هەست کردن پشت گیری لێوەبکات ، وەك ئەوەی کەبلێن ، بیستمان یان بینیمان یان بەری کەوتین (لمسنا)یان ... بەلام ئەگەر هەواڵەکەیان عەقڵ پشت گیری لێوە دەکرد وەك ئەوە کەبلێی بۆ نمونە : دونیا داهاتووە،وئەفرێنراوە، (العالم حادث)، ئەوە لەم کاتەدا هەواڵی موتەواتیری پێ ناوترێ .

**٣.حوکمەکەی:**

فەرموودەی موتەواتیر سوودی ئەو زانستە دڵ دامەزرێنەرە یە(العلم الضروري، العلم اليقيني)ەیەی هەیە ، کە پێویستە مرۆڤ بەتەواوی (جازماً) باوەڕی پێی هەبێت، وەك ئەوەی کەشتەکەی بەچاوی خۆی

ببینێ چۆن گومانی نی یە لەڕاستی یەکەی دا هەردەبێ بەم جۆرەش بێت لەفەرمودەی موتەواتیردا بۆیە فەرموودەی موتەواتیر هەمووی وەرگیراوە، وە پێویست بەباس کردن لەسەر چۆنایەتی ڕاوی یەکانی ناکات .

**٤.بەشەکانی :**

فەرموودەی موتەواتیر دەبێتە دوو بەشەوە : کەئەوانیش گوتراو(لفظي) و (معنوي)ین.

---

٢٣ وەك ئەوەی کە خەڵکی چەند جێگایەکی جیاواز بن ، وەرەگەزو مەزهەب و هتد .... یان جیاواز بێت ، لەبەر ئەمە جاری واهەیە ژمارەی گێرەرەوان زیادە، بەلام حوکمی موتەواتیر بونی جێگیر نابێت، وەجاری واهەیە ژمارەکە رێژەییانە ( نسبياً)کەمە، کەچی موتەواتیر بونەکە دادەمەزرێ، بەگوێرەی حاڵەتی راوی یەکان.

أ.**موتەواتیری گوتراو (لفظي)**:ئەوەیە کە لەفزەکەی و ماناکەی هەردووکیان موتەواتیر بن وەك فەرموودەی (من كذب علي متعمدا فليتبوا مقعده من النار)کە نزیکەی حەفتاو ئەوەندە لەهاوەلان ڕیوایەتیان کردووە، واتە: هەرکەسێ بەئارەزووی خۆی بەدەممەوەﷺ درۆبکات، باجێگای خۆی لەئاگری دۆزەخدا ئامادە بکات .

ب.**موتەواتیری مەعنەوی** : ئەوەیە کەماناکەی موتـــــــــەواتیر بێت نەك لەفزەکەی .

وەك فەرموودەکانی بەرزکردنەوەی دەست لەنوێژدا کەلە پێغەمبەرەوە (ﷺ) نزیکەی سەد فەرموودە هاتووە، هەموو فەرموودەیەك لەوانە تیایدا هاتووە، کە پێغەمبەر (ﷺ) لەنزاکردندا دەستەکانی بەرز کردۆتەوە، بەلام لەچەندەها کات و شوێنی جیاوازدا ، هەموو کات و شوێنێکیان (قضية)یەکیان موتەواتیر نییە، بەلام ئەو ئەندازە هاوبەشەی نێوانیان کەبەرزکردنەوەی دەستەکانە لە پاڕانەوەدا بەموتەواتیری هاتووە ، بەگوێرەی کۆکردنەوەی ڕێگاکانی[٢٤] گێڕانەوە .

**٥.بوونی فەرمودەی موتەواتیر :**

فـەرموودەی موتـەواتیر ژمارەیـەکی ناوەنـد هـەن لەوانـە فـەرمودەی حـەوزی (کوثر)و فـەرمودەی مەسـح کـردن لەسـەر گـۆرەوی(الخف)و فـەرمودەی بـەرز کردنەوەی دەسـتەکانیﷺلـەدوعادا و فـەرمودەی (نضـر الله أمـرأ .....) وهـی تریش کە زۆرن، بەلام ئەگەر سەیری ژمارەی فەرمودە (آحاد)ەکان بکەین، دەبیـنین کە فەرمودەی موتەواتیر زۆر کەمن ، بەگوێرەی ئەمان.

---

٢٤ تدريب الراوي ج ٢ / ص ١٨٠

وكان هذا الحديث حسناً لأن رجال إسناده الأربعة ثقات إلا جعفر بن سليمان الضبعي فإنه حسن الحديث [٨٩] لذلك نزل الحديث عن مرتبة الصحيح إلى الحسن .

**٤- مراتبه:**

كما أن للصحيح مراتب يتفاوت بها بعض الصحيح عن بعض، كذلك فان للحسن مراتب، وقد جعلها الذهبـي مرتبتين فقال:

أ) فأعلى مراتبه : بَهْزٌ بن حكيم عن أبيه عن جده ، وعمرو ابن شعيب عن أبيه عن جده ، وابن اسحق عن التيمي ، وأمثال ذلك مما قيل أنه صحيح ، وهو من أدني مراتب الصحيح .

ب) ثم بعد ذلك ما اختلف في تحسينه وتضعيفه : كحديث الحارث بن عبدالله ، وعاصم بن ضَمْرَة ، وحجاج ابن أرطاة ونحوهم .

**٥- مرتبة قولهم: " حديث صحيح الإسناد " أو " حسن الإسناد ":**

أ) قول المحدثين : " هذا حديث صحيح الإسناد " دون قولهم : " هذا حديث صحيح "

ب) وكذلك قولهم: " هذا حديث حسن الإسناد " دون قولهم: " هذا حديث حسن ". لأنه قد يصح أو يحسن الإسناد .دون المتن لشذوذ أو علة . فكأن المحدث إذا قال : " هذا حديث صحيح " قد تكفل لنا بتوفر شروط الصحة الخمسة في هذا الحديث أما إذا قال : " هذا حديث صحيح الإسناد " فقد تكفل لنا بتوفر شروط ثلاثة من شروط الصحة وهي : اتصال الإسناد ،

---

[٨٩] كما نقل الحافظ ابن حجر في تهذيب التهذيب ٢/٩٦ ذلك عن أبي احمد

وعدالة الرواة وضبطهم ، أما نفي الشذوذ ونفى العلة عنه فلم يتكفل بهما لأنه لم يتثبت منهما.

لكن لو اقتصر حافظ مُعْتَمَد على قوله: " هذا حديث صحيح الإسناد " ولم يَذْكُرْ له علة، فالظاهر صحة المتن، لأن الأصل عدم العلة وعدم الشذوذ.

### ٦_ معنى قول الترمذي وغيره " حديث حسن صحيح " .

إن ظاهر هذه العبارة مُشْكِل ، لأن الحسن يتقاصر عن درجة الصحيح ، فكيف يُجْمَعُ بينهما مع تفاوت مرتبتهما ؟ ولقد أجاب العلماء عن مقصود الترمذي من هذه العبارة بأجوبة متعددة أحسنها ما قاله الحافظ ابن حجر ، وارتضاه السيوطي . وملخصه ما يلي :

أ) إن كان للحديث اسنادان فأكثر فالمعني " حسن باعتبار اسناد ، صحيح باعتبار اسناد آخر " .

ب) وان كان له اسناد واحد فالمعني"حسن عند قوم ، صحيح عند قوم آخرين ".

فكأن القائل يشير إلى الخلاف بين العلماء في الحكم على هذا الحديث، أو لم يترجح لديه الحكم بأحدهما.

### ٧- تقسم البَغَوي أحاديث المصابيح [٩٠] :

دَرَجَ الإمام البغوي في كتابه "المصابيح" على اصطلاح خاص له، وهو أنه يرمز إلى الأحاديث التي في الصحيحين أو أحدهما بقوله:" صحيح" وإلى الأحاديث التي في السنن الأربعة بقوله"حسن" وهو اصطلاح لا يستقيم مع

[٩٠] اسم الكتاب الكامل ، مصابيح السنة " وهو كتاب جمع فيه مؤلفه أحاديث منتقاة من الصحيحين والسنن الأربعة وسنن الدارمي ، وهو الذي زاد عليه وهذبه الخطيب التبريزي وسماه " مشكاة المصابيح "

الاصطلاح العام لدى المحدثين، لأن في السنن الأربعة الصحيح والحسن والضعيف والمنكر، لذلك نبه ابن الصلاح والنووي على ذلك، فينبغي على القارئ في كتاب " المصابيح" أن يكون على علم من اصطلاح البغوي الخاص في هذا الكتاب عند قوله عن الأحاديث:"صحيح" أو "حسن".

**٨- الكتب التي من مظنات[٩١] الحسن:**

لم يفرد العلماء كتباً خاصة بالحديث الحسن المُجَرَّد كما افردوا الصحيح المجرد في كتب مستقلة لكن هناك كتباً يكثر فيها وجود الحديث الحسن. فمن أشهر هذه الكتب :

أ) جامع الترمذي : المشهور بـ " سنن الترمذي " فهو أصل في معرفة الحسن ، والترمذي هو الذي شهره في هذا الكتاب وأكثر من ذكره .

لكن ينبغي التنبه إلى أن نُسَخَهُ تختلف في قوله " حسن صحيح " ونحوه، فعلى طالب الحديث العناية باختيار النسخة المحققة والمقابلة على أصول معتمدة.

ب) سنن أبي داود : فقد ذكر في رسالته إلى أهل مكة : أنه يذكر فيه الصحيح وما يشبهه ويقاربه ، وما كان فيه وَهَنٌ شديد بَيَّنَهُ، وما لم يذكر فيه شيئاً فهو صالح. فبناء على ذلك، إذا وجدنا فيه حديثاً لم يبين هو ضعفه ، ولم يصححه أحد من الأئمة المعتمدين فهو حسن عند أبي داود .

ت) سنن الدار قطني : فقد نص الدارقطني على كثير منه في هذا الكتاب .

---

[٩١] مظنات جمع مظنة بكسر الظاء، ومظنة الشيء معدنه وموضعه. فيكون معنى العنوان " الكتب التي هي موضع وجود الحسن

## فەرموودەی جوان و شیرین ( الحسن )

### ١.پێناسەکەی:

**أ.لەڕووی زمانەوە :** صیفەتی موشەبیهەیەو لە (الحُسْن)ەوە هاتووە کەبەمانای جوان هاتووە .

**ب.لەڕووی زاراوەوە:** زانایان جیاوازیان هەیە لەسەر پێناسەی (حسن)لەڕووی ئەوەوە کە ناوەندێکە لەنێوان فەرمودەی ساغ (صحیح)و فەرمودەی لاواز (ضعیف)دا، هەروەها چونکە هەندێکیان بەشێکیان پێناسە کردووە، جا ئەو پێناسانە باس دەکەم و پاشان ئەوەیان هەڵدەبژێرم کەلەوانی تر لەلام ڕێکترە .

**١.پێناسەی (خطابي):**ئەوەیە کە سەرچاوەکەی (مخرج)بزانرێت،وە پیاوەکانی (رجال)ناسراو بن، وە قورسایی (مدار) ی زۆربەی فەرمودەی لەسەرە، وەهەر ئەمەشە کە زۆرینەی زانایان وەریان گرتووە، وەزۆربەی شەرعزانان (فقهاء) بەکاری دێنن [٩٢].

**٢.پێناسەی (الترمذي) :** هەموو فەرمودەیێك کە ڕیوایەت بکرێت و لە ڕشتە (اسناد)ەکەیدا کەسێك نەبێت، کە تۆمەتبار کرابێت بەدرۆ دەوترێ، وەنابێت ئەوفەرمودەیە (شاذ) بێت، وە دەبێت لەڕووی ترەوە بەو شێوازە ڕیوایەت کرابێت، ئەوە لەلای ئێمە فەرمودەی (حسن)ە [٩٣].

**٣.پێناسەی(إبن الحجر) :**دەفەرموێت، فەرمودەی (احاد)ئەوەیە

٩٢ معالم السنن ج١ / ص١١

٩٣ جامع الترمذي مع شرحه تحفة الأحوذي – كتاب العلل، ج١٠ ـ ٥١٩.

کەکەسێکی ڕاستاڵ (عادل)و بیر تیژ (تام الضبط) نـەقڵی بکـات و دەبێـت ڕشتەکەی پەیوەست (متصل السند)بێت، و(معلل)و (شـــاذ) نـەبێت، ئـەوە (صحیح لذاته)یە . [٩٤] ئەگەر هێزی بیرکردنەوەی (ضبط)کـەمترو نـزمتر بـوو، ئەوە (حسن لذاته)یە. [٩٥]

**من دەڵێم:**وەك بڵێی فەرمودەی (حسن)لەلای (ابن حجر) هەر صـەحیحە، بەلاَم کاتێ کە (ضبط)ی ڕاوییەکەی تۆزێ کەمتر بێت، کە ئەمـەش چـاکترین پێناسەیە بـۆ فـەرمودەی (حسـن)، بـەلاَم پێناسـەکەی (خطـابي)زۆر ڕەخنــەی لـەسەرە، بەلاَم، (الترمذي) یەکێك لـەدووبەشەکەی (حسن)ی پێناسە کـردووە کە ئەویش (حسن لغیرە)یە، وەئەصڵێش لـەپێناسەکەی دا ئەوەیـە کـە (حسـن لذاته)یەکەیە، نەك(حسن لغیرە)، چونکە ئەو(حسن لغیرە)یە، هـەر لـەئەصـڵدا لاوازە (ضعیف)ە، وە بەپلەی(حسن) گەیشتووە بەهۆی زۆری ڕێگاکانییەوە.

**٤.پێناسەی هەڵبژێرراو (المختار) :**

بەگوێرەی ئەو پێناسەیەی کە (ابن حجر)کـردی، دەکـرێ کـە فـەرمودەی (حسن)بەم جۆرە پێناسە بکرێت، ئەوەیە کـە سـەنەدەکەی پەیوەسـت بێـت و کەسـێکی عـادلی وا لێـی گێڕابێتـەوە کـە توانـای لەبـەرکردنی (ضـبط)ی لەکەسانی تر کەمتر نەبێت، ئەمەهەر لـەسەرەتاوە تاکۆتایی بەبێ بوونی (شـاذ)و (علة) تیایدا .

---

٩٤ النخبة مع شرحها له ، ص٢٩ .

٩٥ المصدر السابق ص٣٤ .

### ٢.حوكمەكەی:

لەحوكمدا وەك (صحيح) وايە لـە بەبـــــــەڵگە كردنـدا (الأحتجـاج) هەرچەندە هێزی لەو كـەمترە، هـەر بۆیـەش زۆرینـەی شـەرعزانان (الفقهـاء) كردویانەتـە بەڵگـەو كاریشـیان پـێ كـردووە، وە زۆربـەی فـەرمودە ناسـان (المحدثين) و زانایانی (أصول)یش هەرلەسەر ئـەوەن، كـە بـە بەڵگـەی بكـەن، تـەنها هەنـدێكیان نـەبێت لـە تونـدڕەوەكان (المتشـددين)، وەهەنـدێ لـە ئاسانكارەكان(المتسـاهلين)یش خزاندویانەتـە نـاو جۆرەكـانی (صـحیح)ەوە، وەك(حـاكم)و(ابن حبـان)و(ابن خزيمـة)ئەمـەش لەگـەڵ ڕونكردنەوەیانـدا بـۆ ئەوەی كە پلەی صەحیحەكە كەمترە لەیەكەم جاركە باس كرا .[٩٦]

### ٣.نموونەكەی :

وەك ئەوەی كە (ترمذي) هێناویەتی و دەڵێت (حدثنا قتيبة حدثنا جعفر بـن سليمان الضبعي عن أبي عمران الجَوْني عن ابي بكر بن ابي موسى الأشعري ، قال سمعت ابي بحضرة العدو يقول قال رسول الله (ﷺ)أن أبواب الجنـة تحـت ظلال السيوف ... الحديث[٩٧]

واتە : قوتەیبە بۆی باس كردوین، وە (جعفر بـن سـلیمان الضـبعي)ش پێـی گوتوین كە (ابی عمران الجونی)ئەویش لە (ابـی بكـر بـن موسـی الأشـعری) دەڵێت: بیستومە لە بابم لە هێڵـی تەماسـا، كـە پێغەمبـەر (ﷺ) فـەرمووی : دەرگاكـانی بەهەشـت لـەژێر سـێبەری شمشـێر دان . كـە ئـەم فەرمودەیـە (ترمذی)دەربارەی دەڵێت (هذا حدیث حسن غریب).

---

٩٦ بروانە تدريب الراوی ج١ / ص ١٦٠

٩٧ الترمذي أبواب فضائل الجهاد – ج٥ /ص ٣٠٠ من الترمذي مع شرحه تحفة الأحوذي.

وە ئەم فەرمودەیە (حسن)ە، چونکە پیاوانی سەنەدەکە کە چوارن متمانە دار (ثقة)ن، تەنها (جعفر بن سليمان الضبعي) نەبێت کە (حسن الحديث)ە [98]، بۆیە فەرمودەکە لە پلەی صەحیحەوە دابەستووە بۆ پلەی (حسن).

**٤.پلەکانی فەرمودەی (حسن):**

هەروەك چۆن فەرمودەی صەحیح چەند پلەیەکی هەیە، کە بەهۆیانەوە هەندێکی صەحیحەکان لەهەندێکی تریان جودا دەکرێتەوە، هەربەو شێوازەش بۆ فەرمودەی(حسن)چەند پلەیەك هەیە، کە (الأمام الذهبي) کردونیەتیە دوو پلە و دەفەرموێ :

أ.بەرزترین پلەی ئەوەیە کە (بَهْزُ بن حكيم) لە باوکیەوە لە باپیریەوە، وە (عمرو بن شعيب)لە باوکیەوە لەباپیریەوە، وە(ابن اسحاق) لە (التيمی)یەوە، وەنمونەی ئەمانە کە (صحیح)بونیان دەربارە، گوتراوە، کەلە نزمترینی پلەکانی صەحیحیشە.

ب.پاش ئەمە ئەوەیە کە ڕاجیایی هەیە لەبەچاك دانان و لاوازدانانیدا وەك فەرمودەکەی (الحارث بن عبدالله) و (عاصم بن ضمرة) و (حجاج بن أرطاة)و هاوشێوەکانیان .

**٥.پلەی ئەم گوتەیەی زانایان کە دەفەرموێ (حديث صحيح الأسناد) یان (حسن الأسناد) :**

أ.قسەی فەرمودە ناسان (هذا حديث صحيح الأسناد)لە خواری ئەوەوەیە کە بلێین (هذا حديث صحيح).

---

٩٨ كما نقل الحافظ ابن حجر في تهذيب التذهيب ٢ / ٩٦ ذلك عن ابي أحمد.

ب.وەهەروەها ئەم گوتەیەیان (هذا حديث حسن الأسناد)لەخوار ئەوەوەیە کە بلێین، (هذا حديث صحيح حسن) چونکە هەندێ جار ڕشتە (الاسناد)ساغ (صحيح)یان چاك و جوان (الحسن)دەبێت، نەك مەتنەکە، چونکە لەوانەیە (شذوذ) و (علة)ی تێدابێت .

جا کە فەرموودەناس (المحدث)فەرمووی : (هذا حديث صحيح) وەك ئەوە وایە ئەرکی هاتنەدی پێنج مەرجەکەی صەحیح بوونی فەرموودەی تیادا لە ئۆباڵ گرتبێ ، بەڵام کە گوتی : (هذا حديث صحيح الاسناد)، ئەوە هاتنەدیی سێ مەرج لە مەرجەکانی صەحیحی فەرموودەی تیادا لە ئۆباڵ گرتووە ، کە ئەوانیش :ڕشتە پەیوەستی (اتصال السند) و ڕاستا لێ گێرەرەوەکان (عدالة الرواة ) و بیرچاکی (ضبط) ن ، بەڵام نەبوونی (شذوذ) و (علة) تیایدا لە ئەستۆو ئۆباڵ نە گرتووە ، چونکە نەفی کردنی ئەم دوانەی تیایاندا بۆ جێگیر (ثابت) نەبووە ، بەڵام ئەگەر (حافظ) یێکی باوەڕ پێکراو (معتمد) لە کورتیا بڕیەوەو گوتی : (هذا حديث صحيح الاسناد) وە باسی (علة) ی نەکرد، ئەوە بەڕوکەش (ظاهر) مەبەست پێی صەحیحی (متن)ـە، چونکە ئەصڵ تیایدا نەبوونی (علة) و (شذوذ)ـە.

**٦.مانای ئەم گوتەیەی (الامام الترمذي) و هی تریش کە دەڵێن : (حديث حسن صحيح) :**

ڕووکەش (ظاهر) ی ئەم دەستەواژە (العبارة) یە، گیروگرفتاوی (المشكل)ە، چونکە پلەکانی فەرموودەی (حسن) لە فەرموودەی (صحيح) کەمترە و کورت ترە ، جا چۆن لە گەڵ جیاوازی پلەکانیاندا، کۆکردنەوە لە نێوانیاندا دەکرێت ؟ جا بێگومان زانایان وەڵامیان لە سەر مەبەستی ئەم دەستە واژەیەی (ترمذی) داوەتەوە، بە چەندەها وەڵام، چاکترینیان ئەوەیە

کە(حافظ ابن حجر) فەرموویەتی، و (الامام السیوطي) پێی ڕازی بووه، وپوختەکەی ئەمەیە :

أ.ئەگەر فەرموودەکە دوو (أسناد) یان زیاتری هەبوو، ئەوه واتاکەی ئەمەیە (حسن باعتبار أسناد) بە گوێرەی سەنەدەکەی حەسەنە، وە (صحيح باعتبار أسناد اخر) صەحیحە بە گوێرەی سەنەدێکی تر .

ب.ئەگەر تەنها سەنەدێکی هەبوو، ئەوه واتاکەی ئەوەیە کە (حسن عند قوم) و (صحيح عند قوم اخرين) لەلای کۆمەڵێك (حسن)ە و لە لای کۆمەڵێکی تر صەحیحە ، وەك بلێی لێرەدا بێژەری ئەم گوتەیە ئاماژە دەکات بە ڕاجیایی (خلاف) ی نێوان زانایان لە سەر حوکم دان بەسەر ئەو فەرمودەیەدا، یان ئەوەیە کە (ترجيح) دانی یەکێکیان بەسەر یەکێکی تریاندا لە لای ئەو نەهاتوەتەدی .

## ٧.دابەشکاری (الامام البغوی) بۆ فەرموودەکانی کتێبی "المصابيح".[٩٩]

ئیمامی بەغەوی، لەکتێبەکەیدا (المصابيح) زاراوەیەکی تایبەتی خۆیی تێخزاندووه، کە ئەویش ئەوەیە کە بۆ ئەو فەرمودانەی کەلە دوو کتێبە صەحیحەکەدا یان لە یەکێکیاندا هەنە بە (صحيح) ئاماژەی بۆدەکات، وە بۆ ئەو فەرمودانەی کە لە چوار (سنن)ەکەدا هەیە بە (حسن)ئاماژەیان بۆ دەکات، کە ئەمەش زاراوەیەکە لەگەڵ زاراوەی گشتی (الاصطلاح العام)ی فەرمودەناساندا تێك ناکاتەوە، چونکەلە چوار(سنن)ەکەدا فەرمودەی

٩٩ ناوی تەواوی کتێبەکە ( مصابيح السنة )ەیە،کە کتێبەکە دانەرەکەی تیایدا فەرمودە گەلێکی هەڵبژاردەی لە دوو کتێبە صەحیحەکەداو لەچوار سونەنەکەداو لە ( السنن الدارمي )داکۆ کردۆتەوە وەهەر ئەو کتێبەیە کە ( الخطيب التبريزي )شتی زیادکردووەو ناوی ناوەتە ( مشکاة المصابيح ).

(صحيح)،(حسن)،(ضعيف)،(منكر) هەيە،

هەربۆیەش (ابن الصلاح) و (النواوی)ئاگادارییان لەسەر ئەمە داوە ،

بۆیە لەسەر خوێنەری کتێبی (المصابیح) پێویستە، کە زانیاری هەبێت سەبارەت بەو زاراوە تایبەتەی (الامام البغوی) لەوکتێبەیدا لەسەر گوتەکانی بەو فەرمودانە (صحیح) یان (حسن)ن .

**٨.ئەو کتێبانەی کە فەرمودەی (حسن)یان تیادایە [١٠٠] (الكتب التي من مظنات الحسن):**

زانایان کتێبیان لەسەر فەرمودەی (حسن)دانەناوە لەکتێب گەلی سەربەخۆدا و تەنها بەلاّم لێرەدا کتێب گەلێك هەن، کەبوونی فەرموودەی (حسن) یان تیادا زۆرە ، لە ناو دارترینی ئەو کتێبانە :

أ.(جامع الترمذی)کە ناسراوەبە (السنن الترمذی) کە ئەم کتێبە ئەصلّە لە ناسینی فەرمودەی (حسن)، وە زۆری هێناوە و زۆر باسی کردووە، بەلاّم پێویستە کە ئاگاداری ئەوە بکرێ لەدەقی گوتەی حسن (صحیح)و هتد ... دا نوسخەکانی جیاوازییان تیادایە بۆیە لەسەر تامەزرۆیانی فەرمودە (طالب الحدیث) پێویستە کە هەوڵ و بایەخ بدات بەدەست خستنی نوسخەیەکی لێکۆڵراو (المحقق)یّ کەبەرابەری (المقابلة)کرابێت لەگەڵ نوسخە ئەصلّییە باوەرپێکراوەکاندا .

ب.(سنن ابی داود) لەپەیامەکەیدا بۆ خەڵکی مەککە، نوسیویەتی : کە

[١٠٠] ( مظنات )کۆی ( مظنة )ەیە، بەکەسرەی پیتی ( ظاء )،وکە وتراوە ( مظنة الشيء ): واتە : موضعه: جێگاکەی ! جامانای ئەو سەربابەتە بەم جۆرە دەبێت: ( الكتب التي هي موضع وجود الحسن) ئەو کتێبانەی کە جێگای دەستکەوتنی فەرمودەی ( حسن )ن.

فەرمودەی صەحیح و هاو وێنەی ئەو ، یان ئەوانەی کەلەصەحیحەوە نزیکن تیایدا نوسیوە، ئەوەی کە شلەژان (وَهْن)ێکی توندی تێدا بێت ڕوونی کردۆتەوە، وەئەوەی کەهیچی دەربارە نەوتووە ئەوە باشە (صالح)ـە، جا لەسەر ئەمە ئەگەر فەرمودەیەکمان تیادا بینی کە لاوازی (ضعف)ی ڕون نەکرابویەوە، وەهیچ لە پێشەوایانی متمانە پێ کراوتەصحیحیان نەکردبوو، ئەوە لەلای (الامام ابو داود)، (حسن)ـە.

ج.(سنن الدارقطني):ئەم پێشەوایە لەم کتێبەیدا دەقی فەرموودەگەلێکی (حسن)ی، زۆری هێناوە.

## الصحيح لغيره

**١- تعريفه:**

هو الحسن لذاته إذا رُوِيَ من طريق آخر مِثْلُهُ أو أقوى منه . وسُمي صحيحاً لغيره لأن الصحة لم تأت من ذات السند ، وإنما جاءت من انضمام غيره له .

**٢- مرتبته:**

هو أعلي مرتبة من الحسن لذاته ، ودون الصحيح لذاته .

**٣- مثاله:**

حديث " محمد بن عمرو عن أبي سلمة عن أبي هريرة أن رسول الله صلي الله عليه وسلم قال : لولا أن أشق على أمتي لأمرتهم بالسواك عند كل صلاة "[١٠١]

---

[١٠١] أخرجه الترمذي في كتاب الطهارة ، وأخرجه الشيخان من طريق أبي الزناد عن الأعرج عن أبي هريرة .

قال ابن الصلاح : " فمحمد بن عمرو بن علقمة من المشهورين بالصدق والصيانة ، لكنه لم يكن من أهل الإتقان حتى ضعفه بعضهم من جهة سوء حفظه ، ووثقه بعضهم لصدقه وجلالته ، فحديثه من هذه الجهة حسن ، فلما انضم إلى ذلك كونه رُوِيَ من أَوْجُهٍ أُخَرَ زال بذلك ما كنا نخشاه عليه من جهة سوء حفظه ، وانجبر به ذلك النقص اليسير، فصح هذا الإسناد ، والتحق بدرجة الصحيح "[١٠٢]

## فەرموودەی (الصحيح لغيره)

### ١.پێناسەکەی :

ئەم (صحيح لغيره) خۆی (حسن لذاته )یە، کاتێك کـە ڕیوایـەت بکرێـت لـەڕێگایەکی ترەوە وەك خۆی یان بە هێزتر لـەخۆی ، وەبـە (صـحيح لغـيره) ناوزەد کراوە، چونکە صەحیح بوونەکەی لـەخودی سـەنەدەکەوەی نـی یـە، بەڵکو بەهۆی تێئالانی سەنەدی ترە پێوەی، واتە: بەهۆی سەنەدی تـرەوە بۆتـە صەحیح، دەناخۆی وانییە .

### ٢.پلەکەی :

پلەی لەفەرمودەی (حسن لذاتـه)بـەرزترەو لـەخوار فـەرمودەی (صـحيح لذاته)یەوەیە .

### ٣.نمونەکەی :

فەرمودەی (محمد بـن عمـرو) لـە (أبـي سـلمة)ەوە لـە(ابـوهريرة)ەوە کـە پێغەمبەر (ﷺ) فەرمویەتی (لو لا أن أشق على أمـتي لأمـرتهم بالسـواك عنـد

---

[١٠٢] علوم الحديث ص ٣١-٣٢

کل صلاة)[١٠٣] واتە : ئەگەر لەسەر ئۆمەتەکەم قورس نەکردبایە ، ئەوا فەرمانم پێ دەکردن بە سیواك کردن لەگەڵ هەموو نوێژێکا .

**(ابن الصلاح) دەڵێت** : (محمد ابن عمرو بن علقمة) لەوانەیە کە بە ڕاستگۆیی و خۆ پارێزی (الصیانة) ناسراوە، بەڵام ئەهلی وردەکاری (الاتقان)نەبووە، تاوای لێهاتووە، کە هەندێك لە زانایان لە ڕووی خراپی لە بەرکردنیەوە (سووالحفظ)ـەوە، بۆیە بە لاوازیان داناوە، وە هەندێکی تر لەبەر ڕاستگۆیی و شکۆمەندی (جلالە)ـەوە، متمانەیان پێکردووە ، بۆیە فەرموودەکەی لەو لایەنەوە (حسن)ـە، جا کەگێڕانەوەی ڕیوایەتەکە لەچەند لایەکی ترەوە درایە پاڵی ئەو ترسەی ئێمە ڕەوییەوە لەسەری کە (سوو الحفظ) بوو، وە ئەو گێڕانەوانەی تر بووە هۆی ئەوەی کەئەم کەم و کوڕییە کەمە لابدات، بۆیە سەنەدەکەی صەحیح کراو گەیشتە پلەی صەحیح[١٠٤] .

## الحَسَن لِغَيْرِه

**١ – تعريفه:**

هو الضعيف إذا تعددت طرقه، ولم يكن سببُ ضعفه فِسْقَ الراوي أو كَذِبَهُ.

يستفاد من هذا التعريف أن الضعيف يرتقي إلى درجة الحسن لغيره بأمرين هما:

أ) أن يُرْوَيٍ من طريق آخر فأكثر ، على أن يكون الطريقُ الآخر مثله أو أقوى منه

---

١٠٣ اخرجه الترمذي في كتاب الطهارة وأخرجه الشيخان من طريق ابي الزناد الأعرج عن ابى هريرة .

١٠٤ علوم الحديث ص ٣١ – ٣٢

ب) أن يكون سببُ ضعف الحديث إما سوء حفظ راويه أو انقطاع في سنده أو جهالة في رجاله .

٢- مرتبته:

الحسن لغيره أدني مرتبة من الحسن لذاته .

وينبني على ذلك أنه لو تعارض الحسن لذاته مع الحسن لغيره قُدِّمَ الحسنُ لذاته .

٣- حكمه:

هو من المقبول الذي يُحْتَجُّ به .

٤- مثاله:

" ما رواه الترمذي وحَسَّنَه من طريق شعبة عن عاصم بن عبيد الله عن عبدالله بن عامر بن ربيعة عن أبيه أن امرأة من بني فَزَارَةَ تزوجت على نَعْلَيْنِ فقال رسول الله صلي الله عليه وسلم : " أرضيتِ من نَفْسِكِ ومالِكِ بنعلينِ ؟ قالت : نعم ، فأجاز "

قال الترمذي : " وفي الباب عن عمر وأبي هريرة وعائشة وأبي حَدْرَدٍ " [١٠٥]

فعاصم ضعيف لسوء حفظه ، وقد حسن له الترمذي هذا الحديث لمجيئه من غير وجه "

---

[١٠٥] الترمذي .

## فەرموودەی ( الحسن لغیرە )

### ١.پێناسەکەی:

بریتییە لەفەرمودەی لاواز (الضعیف)، ئەمە لەکاتێکا کە ئەگەر ڕێگاکانی گێڕانەوەی چەند دانەیەك (متعدد)بن، بەڵام هۆکاری لاوازییەکەی خراپەکاری (فسق)ی ڕاوییەکە یان درۆزن بونی نەبێت.

لەم پێناسەیەوە ئەوە وەك سود وەردەگیرێت، کەفەرمودەی لاواز (ضعیف) بەرز دەبێتەوە بۆ پلەی (حسن لغیرە)لەبەر دووشت کەئەمانەن.

أ.لەڕێگایەك یان چەند ڕێگایەکی ترەوە ڕیوایەت کرابێت، بەجۆرێك کە ئەو ڕێگایەی تر وەك خۆی یان لە خۆی بەهێزتر بێت.

ب.دەبێت هۆکاری لاوازی فەرمودەکە یان خراپی لەبەرکردن (سوء الحفظ)ی ڕاوییەکەی یان پچڕان لەسەنەددا (انقطاع في السند) یان نادیاری لەپیاوەکانیدا (جهالة في رجاله)بێت .

### ٢.پلەی (الحسن لغیرە) :

فەرمودەی (الحسن لغیرە)پلەی لەفەرمودەی (الحسن لذاتە)نزمترە ، وە لەسەر ئەمە ئەوە وەردەگیرێ کە ئەگەر فەرمودەی (حسن لذاتە) لەگەڵ فەرمودەی (حسن لغیرە)جیاواز کەوتن ، ئەوە فەرمودەی (حسن لذاتە) یەکە پێش دەخرێ .

### ٣.حوکمەکەی :

(حسن لغیرە)لەو فەرمودە وەرگیراو (المقبول)انەیە ، کەدەکرێتە بەڵگە

**٤.نمونه‌كه‌ی :**

مارواه الترمذي وحَسَّنَهُ من طريق شعبة عن عاصم عن عبيدالله عن عبدالله بن عامر بن ربيعة عن ابيه ان امرأة من بني فزارة تزوجت على نعلين، فقال رسول الله (ﷺ) (أرضيت من نفسك و مالك بنعلين ؟ قالت : نعم، فأجاز)

واته : وه‌ك ئه‌و فه‌رمووده‌یه‌ی كه (ترمذی) ڕیوایه‌تی كردووه و به (حسن) یش دایناوه، له‌ڕێی (شعبة عن عاصم عن عبيدالله عن عبدالله بن عامر بن ربيعة) له باوكیه‌وه،كه ئافره‌تێك له هۆزی (بني فزارة) ماره كراله‌سه‌ردوو نه‌عل پێغه‌مبه‌ر(ﷺ)فه‌رمووی:ئایا ڕازیت ؟

ئافره‌ته‌كه وتی:به‌ڵێ، ئیتر ڕێگای پێدا .

(الامام الترمذي) ده‌ڵێت : له عه‌مر و (ابوهريرة) و (عائشة) و (ابي حَدْرَدْ) ه وه‌یه .

جا (عاصم) لاوازه له‌به‌ر خراپی له‌به‌ركردنی (سوء الحفظ)، (ترمذي) ئه‌م فه‌رمووده‌ی به (حسن) داناوه، له‌به‌ر هاتنی له ڕێگای تره‌وه .

## خَبَر الآحاد المَقبُول المُحتف بالقَرائن

**١– توطئة:**

وفي ختام أقسام المقبول أبحث المقبول المحتف بالقرائن ، والمراد بالمحتف بالقرائن أي الذي أحاط واقترن به من الأمور الزائدة على ما يتطلبه المقبول من الشروط .

وهذه الأمور الزائدة التي تقترن بالخبر المقبول تزيده قوة وتجعل له ميزة على غيره من الأخبار المقبولة الأخرى الخالية عن تلك الأمور الزائدة وترجحه عليه.

**٢- أنواعه:**

الخبر المحتف بالقرائن أنواع ، أشهرها :

أ) ما أخرجه الشيخان في صحيحيهما مما لم يبلغ حد المتواتر فقد احتف به قرائن منها :

١- جلالتهما في هذا الشأن .

٢- تقدمهما في تمييز الصحيح على غيرهما .

٣- تلقى العلماء لكتابيهما بالقبول، وهذا التلقي وحده أقوى في إفادة العلم من مجرد كثرة الطرق القاصرة عن التواتر ؟

ب) المشهور إذا كانت له طرق متباينة سالمة كلها من ضعف الرواة والعلل.

ت) الخبر المسلسل بالأئمة الحفاظ المتقنين حيث لا يكون غريبا:

كالحديث الذي يرويه الإمام احمد عن الإمام الشافعي ويرويه الشافعي عن الإمام مالك ويشارك الإمام أحمد غيره في الرواية عن الإمام الشافعي، ويشارك الإمام الشافعي كذلك غيره في الرواية عن الإمام مالك.

**٣- حكمه :**

هو أرجح من أي خبر مقبول من أخبار الآحاد ، فلو تعارض الخبر المحتف القرائن مع غيره من الأخبار المقبولة قدم الخبر المحتف بالقرائن .

## باسی فەرموودەی ( احاد )ی وەرگیراوی نیشاندار ( المحتف بالقرائن )

### ١.ڕیخۆشکردن :

لــە کۆتــایی بەشــەکانی فــەرموودەیوەرگیراو (المقبــول) دا، باســی فەرموودەی (المحتف بالقرائن) دەکەم کە مەبەست لە (المحتف بالقرائن) واتــە : ئەو فەرموودەیەی کە ئەو مەرجە زیادانەی کە فەرموودەی وەرگیراو (مقبــول) هەیەتی و داوایان دەکات، لەمدا هاتووەتەدی و پێوەی لکاون .

وە ئەم شتە زیادانە کە بە فەرموودەی وەرگــیراو (مقبــول) ە وە، دەلکــێن، زیاتر بە هێزی (القوة) دەبەخشنە ئەو فەرموودەیە، وەجیاکاری (مَیِّزَة)ە یــەکی پیّ دەبەخشــن، کــە لــە فــەرموودە مەقبولــەکانی تــری جیــا بکاتــەوە، ئــەو فەرموودانەی کە ئەو شــتە زیادانــەیان تیــا دا نییــە ، وە ئــەم جــۆرە فــەرمودە زیادەدارانە تەرجیح دەدرێن بەسەر ئەوانی تردا .

### ٢.جۆرەکانی :

فەرمودەی خــاوەن زیــادە نیشــانەدار (المحتــف بــالقرائن) چــەند جۆرێکــە ناسراوترینیان بریتییە لە :

أ.ئەوانــەن کــە دوشێخەکە(بخاری،مســلم)لەدوو کتێبــە صــەحیحەکانیاندا هێناویانــە کــە نەگەیشــتونەتە پلــەی (متــواتر)، جــا چــەند زیادەیــەك ڕووی تێکردوون لەوانە :

١.شکۆمەندیان لەوشتەدا – جلالتهما في هذا الشأن .

٢.پێشخستنیان لە جیاکردنەوەی فەرمودەی (صحیح) لەهی تر .

٣.زانایان کتێبەکانیان وەرگرتووە، وە ئەم وەرگرتنە تەنها خۆیشی بەهێزترە لەو تەنها زۆرگێڕانەوەیەی کە لە (تواتر) بووندا کورت کراونەتەوە .

ب.فەرمودەی (المشهور) ئەمە ئەگەر چەند ڕێگایەکی جیاوازی هەبوو وەهەموویان (سالم)بن لەوەی کە گێڕەرەوەکانیان لاواز بن و کێشەیان تێدا بێت .

ج.ئەو فەرمودەزنجیرەییەی (المسلسل)ەی، کە هی پێشەوایانی حافظی وردەکار (الأئمة الحافظ المتقنین)بێت بەجۆرێ کە (غریب)نەبێت .

وەك ئەو فەرمودەیەی کە (امام احمد)ڕیوایەتی دەکات لە (امام الشافعي)یەوە، (الشافعي)یش ڕیوایەتی ئەکات لە (امام مالك)ەوە، وەکەسانی تریش بەشداری (امام احمد)دەکەن لە گێڕانەوەی ئەو فەرمودەوە لە (امام شافعي)یەوە، وەکەسانی تریش بەشداری دەکەن لەگەڵ (امام شافعي)دا لە ڕیوایەت کردنی ئەو فەرمودەیەدا لە (امام مالك)ەوە .

### ٣.حوکمەکەی :

ئەم جۆرەفەرمودەیە(ارجح)ترە، لەهەموو فەرمودەیەکی (مقبول) لەفەرمودە (احاد)ەکان، جا ئەگەر فەرمودەی (المحتف بالقرائن) پێچەوانەگەری (تعارض)ی لەگەڵ غەیری خۆیدا لەفەرمودە وەرگیراوەکاندا تێکەوت ئەوا ئەم فەرمودەیەی (محتف بالقرائن) پێش دەخرێت.

# المبْحَث الثَاني

**ـ تقسيم الخبر المقبول إلى معمول به وغير معمول به ـ**

ينقسم الخبر المقبول إلى قسمين: معمول به وغير معمول به، وينبثق عن ذلك نوعان من أنواع علوم الحديث وهما: " المُحْكَم ومُخْتَلفُ الحديث " و" الناسخ والمنسوخ "

## باسی دووهم (المبحث الثاني)

دابەش کردنی فەرمودەی وەرگیراو (المقبول)بۆ مەقبولی کارپێکراو (معمول به)، وکارپێنەکراو (غير معمول به):

فەرمودەی (مقبول)دەبێت بەدوو بەشەوە: (معمول به) و (غير معمول به)، وە لەمەشەوە دوو جۆر لە جۆرەکانی زانستی فەرموودە جیا دەبنەوە، کە ئەوانیش (المحكم ومختلف الحديث)و(الناسخ والمنسوخ)ن .

## المُحْكَم ومُخْتلِف الحديث

**١- تعريف المُحْكَم:**

أ) لغة: هو اسم مفعول به " أَحْكَم " بمعني أَتْقَنَ.

ب) اصطلاحاً: هو الحديث المقبول الذي سَلِمَ من معارضة مِثْلِهِ .

وأكثر الأحاديث من هذا النوع ، وأما الأحاديث المتعارضة المختلفة فهي قليلة بالنسبة لمجموع الأحاديث.

## ٢- تعريف مُختَلِف الحديث:

أ) لغة: هو اسم فاعل من " الاختلاف " ضد الاتفاق ، ومعنى مختلف الحديث : أي الأحاديث التي تصلنا ويخالف بعضها بعضاً في المعني ، أي يتضادّان في المعنى .

ب) اصطلاحاً : هو الحديث المقبول الْمُعَارَض بمثله مع إمكان الجمع بينهما .

أي هو الحديث الصحيح أو الحسن الذي يجيء حديث آخر مثله في المرتبة والقوة ويناقضه في يجمعوا بين مدلوليهما بشكل مقبول.

## ٣- مثال الْمُختَلِف:

أ) حديث " لا عَدْوَى ولا طِيَرَةَ [١٠٦] .... " الذي أخرجه مسلم مع

ب) حديث " فِرَّ من الَمجذُوم [١٠٧] فِرَارَكَ من الأسَدِ " الذي رواه البخاري .

فهذان حديثان صحيحان ظاهرهما التعارض ، لأن الأول ينفي العدوى ، والثاني يثبتها ، وقد جمع العلماء بينهما ووفقوا بين معناهما على وجوه متعددة ، أذكر هنا ما اختاره الحافظ ابن حجر ، وُمفادُه ما يلي :

## ٤- كيفية الجمع:

وكيفية الجمع بين هذين الحديثين أن يقال : أن العدوى منفية وغير ثابتة ، بدليل قوله صلى الله عليه وسلم : " لا يُعْدِي شيء شيئاً " [١٠٨] وقوله لمن

---

[١٠٦] الطيرة : التشاؤم بالطيور .

[١٠٧] المجذوم : المصاب بالجذام وهو داء تتساقط أعضاء من يصاب به .

[١٠٨] الترمذي في كتاب القدر جـ ٤ ـ ص ٤٥٠ وأخرجه أحمد .

عارضه بأن البعير الأجرب يكون بين الإبل الصحيحة فيخالطها فتجرب : " فمن أعدى الأول ؟ " [109]

يعني أن الله تعالى ابتدأ ذلك المرض في الثاني كما ابتدأه في الأول . وأما الأمر بالفرار من المجذوم فمن باب سدِّ الذرائع ، أي لئلا يتفق للشخص الذي يخالط ذلك المجذوم حصول شيء له من ذلك المرض بتقدير الله تعالى ابتداء لا بالعدوى المنفية ، فيظن أن ذلك كان بسبب مخالطته له ، فيعتقد صحة العدوى ، فيقع في الإثم، فأُمِرَ بتجنب المجذوم دفعاً للوقوع في هذا الاعتقاد الذي يسبب الوقوع في الإثم.

**٥- ماذا يجب على من وجد حديثين متعارضين مقبولين ؟**

عليه أن يتبع المراحل الآتية:

أ) إذا أمكن الجمع بينهما: تَعَيَّنَ الجمعُ ، ووجب العمل بهما .

ب) إذا لم يمكن الجمع بوجه من الوجوه.

١- فان عُلِمَ أحدُهما ناسخاً : قدمناه وعملنا به ، وتركنا المنسوخ .

٢- وان لم يُعْلَم ذلك : رجحنا أحدهما على الآخر بوجه من وجوه الترجيح التي تبلغ خمسين وجهاً أو أكثر ، ثم عملنا بالراجح .

٣- وان لم يترجح أحدهما على الآخر: ـ وهو نادر ـ توقفنا عن العمل بهما حتى يظهر لنا مرجح.

---

[109] البخاري ـ كتاب الطب ـ جـ ١٠ ـ ص ١٧١ مع فتح الباري ، وأخرجه مسلم وأبو داود وأحمد

### ٦- أهميته ومن يكمل له :

هذا الفن من أهم علوم الحديث ، إذ يضطر إلى معرفته جميع العلماء وإنما يكمل له ويمهر فيه الأئمة الجامعون بين الحديث والفقه ، والأصوليون الغواصون على المعاني الدقيقة ، وهؤلاء هم الذين لا يُشْكِلُ عليهم منه إلا النادر.

وتعارض الأدلة قد شغل العلماء، وفيه ظهرت موهبتهم ودقة فهمهم وحسن اختيارهم. كما زَلَّتْ فيه أقدام من خاض غِمَارَه من بعض المتطفلين على موائد العلماء .

### ٧- أشهر المصنفات فيه :

أ) اختلاف الحديث : للإمام الشافعي ، وهو أول من تكلم وصنف فيه .
ب) تأويل مختلف الحديث : لابن قتيبة . عبدالله بن مسلم .
ج) مشكل الآثار : للطحاوي . أبي جعفر أحمد بن سلامة .

## (المحكم ومختلف الحديث)

### ١.پێناسەکەی (محكم) :

**أ.لەڕووی زمانەوە:** ئیسمی مەفعولە و لە (احكم)ەوە هاتووە، کە بەمانای (اتقن)وردەکاری دێت .

**ب.لەڕووی زاراوەوە:** ئەو فەرمودە وەرگیراوەیە کەلەپێچەوانە گەری (معارضة)ی هاوێنەی خۆی بەدوورە وساڵە .

وەزۆربەی فەرمودەکان لەم جۆرەن، بەڵام فەرمودەی پێچەوانەو جیاواز (المتعارضة والمختلفة) کەمن، لەچاو سەرجەم فەرمودەدا .

**٢.پێناسەی فەرمودەی جوداکار (مختلف):**

**أ.لـەڕووی زمانـەوە** :ئیسـمی فاعیلـە و لـە جیـاوازی (الاختلاف)ـەوە هاتووە،کەدژی کۆکبون (الاتفاق)ـە، وە مانای فەرمودەی (مختلف)واتـە ئـەو فەرمودانەی دەمانگەنیّ، بـەلاّم لـەمانادا هەنـدێکیان لەگـەڵ هەنـدێکی تریـان دژن، واتە، لەمانادا دژی یەکن .

**ب.لـەڕووی زاراوەوە** : ئـەو فـەرمودە وەرگیراوەیـە کـە فـەرمودە هـاو وێنەکانی پێچەوانەی دەبنەوە لەگەڵ گونجانی کۆکردنـەوەیان لەگـەڵ یـەکتری دا، واتە: ئـەو فـەرمودە (صـحیح)ە، یـان (حسـن)ە کەفەرمودەیـەکی تـری هاووێنەی لـە پلـە (المرتبـة)و هێـز (القـوة)دا دێـت، بـەلاّم لـەڕووی مانـاوە بەڕوکـەش (ظـاهر)دژییـەتی وە بـۆ خـاوەن زانسـت و کەسـانی بـیر تیـژ دەگونجێت،کـە بەشـێوازێکی وەرگـیراو (مقبـول) کۆکردنـەوە لـە نێـوان (مدلول)ەکانیاندا بکرێت .

**٣.نمونەی فەرمودەی (مختلف):**

أ.وەك فەرمودەی (لا عدوى ولا طـيرة .........) کـە ئیمـام موسـلیم هێناویەتی.

ب.وەفەرمودەی (فرَّ من المجذوم فرارك مـن الأسـد) کـە (امـام البخـاری) ڕیوایەتی کـردووە، واتـە لەکەسـی گـول (مجـذوم) ڕاکـە، هـەروەك لەشـێر ڕادەکەیت.

ئەمـە دوو فـەرمودەی صـەحیحن کـە لـە(ظـاهر)دا پێچـەوانەن، چـونکە یەکەمیان (العـدوة)نـەفی دەکـات و دووەمیـان جـێگیر (ثابـت) ی دەکـات، وەزانایـان کۆکردنـەوە (جمع)یـان لەنێوانیانـدا کـردوون، وە ڕێکـەوتوون

لەسەرماناکانیان بەچەند شێوەیەك، من لێرەدا ئەوەی کە (حافظ ابن حجر)هەڵی بژاردووە دەیهێنم، کە ناواخنەکەی بەم جۆرەیە .

**٤.چۆنیەتی کۆکاری (جمع)ـەکە:**

وەچۆنییەتی جەمع کردن لەنێوان ئەو دوو فەرمودەیەدا ئەوەیە بوترێ کە (عدوی) گوازرانەوەی نەخۆشی لەکەسێکەوە بۆ کەسێکی تر نەفی کراوەو دانەمەزراوە، بەبەڵگەی فەرمودەی پێغەمبەر (ﷺ) ﴿ لایعدی شیئ شیئا ﴾ شتێك نەخۆشی ناخاتە سەرشتێکی تر[١١٠]وە ئەوگوتەیەی پێچەوانەی کەسێکە کەپێی وایە کە وشتری گەڕ (الاجرب)کەلەنێوان کۆمەڵێك وشتری ساغدا بوو، ئەوانیش توش دەکات، بەڵام ئایا کێ یەکەمی تووش کرد ؟[١١١])واتە هەر بێگومان خوای گەورە ئەو نەخۆشییەی خستە سەردووەم هەروەك تووشی یەکەمی کردووە، بەڵام فەرمان کردن بەڕاکردن لەکەسی گول ئەوە سەربەمەسەلەی ڕێگاگرتن لەتەشەنەکردنە (باب سد الذرائع)واتە : لەبەر ئەوەی لەوکەسەیدا کە تێکەڵی ئەکات، پریشکێ لەونەخۆشییەی بەرنەکەوێ، هەرلەڕێی خۆیەوە (ابتداء) نەك بەگوازرانەوە کە پێغەمبەر (ﷺ) نەفی کردووە، چونکە وا گومانیش دەبات کەبۆیە تووش بووە چونکە تێکەڵی لەگەڵ ئەوکابرا گولەدا کردووە ، بەمەش دەکەوێتە تاوانەوە، جا بۆیە فەرمانی پێکرا کە لە کۆڕی گولان دوورکەوێتەوە، نەبادا ئەو بیروباوەڕەی لادروست ببێت، کە باسمان کردو بە هۆی بیروباوەڕەکەیشیەوە بکەوێتە نێو تاوانەوە.

---

[١١٠] الترمذي في كتاب القدر– ج٤،ص٥٠، وأخرجه أحمد.

[١١١] البخاري في كتاب الطب– ج١٠، ص١٧١، مع فتح الباري وأخرجه أحمد،ومسلم.

## ٥.چی پێویسته لەسەر کەسێك کە دوو فەرموودەی جیاواز (مختلف)ی وەرگیراو (مقبول) ی بینی ؟

پێویسته لەسەری کەشوێن ئەم قۆناغانەی خوارەوە بکەوێت .

أ.ئەگەر جەمع کردن لەنێوانیانـدا گونجـاو بـوو، ئـەوا (جمع)ەکـە دیـاری دەکات و پێویسته کاریان پێ بکات .

ب.ئەگەر بەشێوازێ لە شێوازەکان (جمع)کردن نەدەکرا :

١.ئەگەر زانرا : کە یەکێکیان سڕەرەوە (ناسخ)ە، ئـەوا دەیهێننـە پێشـێ و کاری پێ دەکەین و سڕراوەکە (منسوخ)ەکە لادەدەین .

٢.ئەگـەر ئەمـە نـەزانرا بـەجۆرێك لـەجۆرەکانی (تـرجیح)، دانەیـەکیان (ترجیح)دەدەین بەسەر دانەیەکی تریاندا ، کە (ترجیح) نزیکەی پەنجا جۆر یـان زیاتری هەیەو پاشان کار بە (ارجح)ەکە دەکەین .

٣.ئەگەر یەکێکیان بەسەر یـەکێکی تریانـدا (تـرجیح) نەدەدرا،کـە ئەمـەش دەگمەنـە ئـەوا دەوەسـتین لەسـەر کارپێکردنیـان تـا (مـرجح) ەکـەمان بـۆ دەردەکەوێت .

## ٦.گرنگییەکەی و ئەوەی کە تیایدا پسپۆڕە :

ئەم هونـەرە لـەگرنگترینی زانسـتەکانی فەرموودەیـە، چـونکە سـەرجەم زانایـان پێویستیان پێی هەیە و پێشەوایانی فەرموودەو(فقه) ئەوانەی کـە ئـەم دوو زانسـتەیان تێکەڵ کردووە تیایدا شارەزان — تیایدا لێزان و بالادەست و پسپۆڕن، وەهـەروەها ئەو زانایانەی (علـم الاصول)یش کە ڕۆچـوو لێـزانن (غواصـون)، وردەکـارن لـە لێکدانەوەی وردی ماناکاندا پێی شارەزان ، وە ئەمانە ئەوانەن کـە زۆر بەدەگمـەن ئیشکالیان لادروست دەبێت لەسەری .

وەبەپێچەوانە بونەوەی بەڵگەکان (تعارض الأدلة) زانایانی سەرقاڵ کردووە، هەر لەمەشدا توانـاو وردەکـاری تێگەیشـتن یـان چـاك هەڵبـژاردن (حسـن الأختيار)يان دەرکەوتووە، هەروەك پێی هەندێ لەوانەی کە سەرەتایین لە چاو زانستی زانایاندا لەم بوارەدا هەڵخلیسکاون .

**٧.بەناوبانگترین دانراوەکان تیایدا :**

أ.(اختلاف الحديث) دانراوی (الامام الـشافعی)یە، کەئەمیش یەکـەم کـەس بوو قسەی تیادا کردووە و کتێبی تیادا داناوە.

ب.(تأويل المختلف الحـديث)دانـراوی (ابـن قتيبيـة)، (عبـدالله)ی کـوڕی (مسلم)ـە.

ج.(مشكل الأثار)،دانراوی (الطحاوي) ابو جعفر أحمد بن سلامة .

## ناسخُ الحَديثِ وَمَنسُوخه

**١-تعريف النسخ:**

أ) لغة: له معنيان : الإزالة . ومنه نَسَخَت الشمسٌ الظلَّ. أي إزالته والنقل، ومنه نسختٌ الكتابَ، إذا نقلتٌ ما فيه، فكأنَّ الناسخ قد أزال المنسوخ أو نقله إلى حكم آخر.

ب) اصطلاحاً: رَفْعُ الشارع حكما منه متقدماً بحكم منه متأخر.

**٢- أهميته وصعوبته وأشهر المُبرِّزين فيه:**

معرفة ناسخ الحديث من منسوخه فن مهم صعب فقد قال : الزهري : " أَعْيا الفقهاء وأعجزهم أن يعرفوا ناسخ الحديث من منسوخه "

وأشهر المبرزين فيه هو الإمام الشافعي . فقد كانت له فيه اليد الطولى والسابقة الأولى . قال الإمام أحمد لابن وَارَةَ ـ وقد قدم من مصر ـ كتبتَ كُتُبَ الشافعي ؟ قال : لا ، قال: فَرَّطْتَ ما علمنا المُجْمَلَ من المُفَسَّرِ ، ولا ناسخ الحديث من منسوخه حتى جالسنا الشافعي .

### ٣- بم يُعْرَفُ الناسخ من المنسوخ ؟

يعرف ناسخ الحديث من منسوخه بأحد هذه الأمور :

أ) بتصريح رسول الله صلي الله عليه وسلم : كحديث بُرَيْدَةَ في صحيح مسلم " كنتُ نهيتكم عن زيارة القبور فزوروها فإنها تذكِّر الآخرة " .

ب) بقول صحابي : كقول جابر بن عبدالله رضي الله عنه : " كان آخِرَ الأمرين من رسول الله صلى الله عليه وسلم تَرْكُ الوضوء مما مست النار " أخرجه أصحاب السنن .

ت) بمعرفة التاريخ : كحديث شدَّاد بن أوس " أفطر الحاجم والمحجوم " [١١٢] نُسِخَ " بحديث ابن عباس أن النبي صلى الله عليه وسلم احتجم وهو مُحرِمُ صائم " [١١٣] فقد جاء في بعض طرق حديث شداد أن ذلك كان زمن الفتح وأن ابن عباس صحبه في حجة الوداع .

ث) بدلالة الإجماع : كحديث من شرب الخمر فاجلدوه فان عاد في الرابعة فاقتلوه " [١١٤] قال النووي :" دَلَّ الإجماع على نسخه

والإجماع لا يَنْسَخُ . ولا يُنْسَخَ. ولكن يدل على ناسخ .

---

[١١٢] رواه أبو داود .

[١١٣] أخرجه مسلم .

[١١٤] رواه أبو داود والترمذي

**٤- أشهر المصنفات فيه :**

أ) الاعتبار في الناسخ والمنسوخ من الآثار لأبي بكر محمد ابن موسى الحازمي .

ب) الناسخ والمنسوخ للإمام احمد

تجريد الأحاديث المنسوخة لابن الجوزي .

## فەرموودەی سڕیار، و فەرموودەی سڕراوە

## ( ناسخ الحديث ومنسوخه )

**١.پێناسەی نەسخ:**

**أ.لەڕووی زمانەوە:**دوو واتای هەیە، سڕینەوە (الازالة) هەرلەمەشەوە (نسخت الشمس الظل)واتە:(ازالتە) سڕینەوەی، وە گواستنەوەشی (النقل)،هەر لەمەشەوەیە (نسخت الكتاب)واتە : ئەوەی کە تیایدایە نەقڵم کردو گواستمەوە، وەك ئەوەی کە ئەو سڕەرەوە (الناسخ)ە سڕراوە (منسوخ)ەکەی لابرد بێ یان گواستبێتیەوە بۆ حوکمێکی تر .

**ب.لەڕووی زاراوەوە (الأصطلاح)ەوە :** بریتییە لە لادانی حوکمێك بەحوکمێکی تری دوای خۆی لەلایەن (شارع)خوداو پێغەمبەرەوە(ﷺ).

**٢.گرنگی و سەختی ئەم زانستە – بالاّ دەستڕین کەس تیایدا :**

ناسینی فەرمودەی نەسخ کەرەوە لەفەرمودەی نەسخ کراوە هونەرێکی گرنگەو سەختە (الزهری)وتویەتی وریاترین و دەستەوەستان ترینی شەرع زانان بەزانینی (ناسخ و منسوخ) ی فەرمودە جیا دەکرێتەوە، وەناسراوترینی

بالاَّ دەستان لەم بابەتەدا (الامام الشافعي)يە، كەتيايدا دەستێكي بالاَّو رابردويەكي لەمێژينەی هەبووە ، (امام احمد) وتي بە (ابن وارة) كەلە ميسرەوە هاتبوو ئايا كتێبەكاني (شافعي)ت نوسيوەتەوە، وتي: نەخێر! ووتي:كەم و كورِيت تيايدا كردووە، جا (مجمل)و (مُفَسِّر)ی، فەرمودەی نەسخ كەرەوە مان نەدەزاني تا لەگەلَ (الامام الشافعي)دا دانە نيشتايەين .

## ٣.بەچي فەرمودەی نەسخ كارونەسخ كراوە دەزانرێت ؟

فەرمودەی نەسخ كەرەوە و بەيەكێ لەم شتانە دەزانرێت:

أ.بەرِونكردنەوە (تصريح)ی پێغەمبەری خوا (ﷺ)وەك فەرمودەكەی (بُرَيدة) لە (صحيح مسلم) دا (كنت نهيتكم عن زيارة القبور فزورها فأنها تذكر الاخرة)بەربەستيم لێ دەكردن لەوەی كە بچن سەرداني گۆرِستان بكەن، بەلاَم ئێستا، بچن قيامەتتان دەخاتەوە ياد .

ب.بەگوتەی هاوەلاَن(رضي الله عنهم)وەك، ئەم گوتەيەی (جابر) ی (كوڕی عبدالله)خوای لێ رازی بێت : (كان اخر الأمرين من رسول الله (ﷺ) ترك الوضوء مما مست النار [١١٥]:كۆتايي دووكارەكەی پێغەمبەر (ﷺ) بريتي بوون لەوەی كەئايا بەخواردني گۆشتي برژاو دەست نوێژ دەشكێت يان نا..كۆتايي ئەم دوانە بەوەبوو، كەبەخواردني گۆشتي برژاو دەست نوێژ بەتالَ نابێتەوە).

ج.بەزانيني مێژوو:(معرفة التأريخ) وەك فەرمودەكەی (شداد بن اوس) (أفطر الحاجم والمحجوم [١١٦] كەنەسخ كراوەتەوە بەفەرمودەكەی ئيبن عەبباس

---

(١١٥) أخرجه أصحاب السنن

(١١٦)رواه ابو داود

کەوا (ان النبـي(ﷺ)أحتجم وهو محرم صائم) [١١٧]جالەهەندیّ لە ڕێگاکـانی گێڕانەوەی فەرمودەکەی (شـداد)ەوە هـاتووە، کـە ئەمـە لەسـەردەمی فـەتحی مەککەدا بووە، (ابن عباس)ی لەگەڵ دا بووە لە حەجی ماڵئـاوایی دا (حجـة الوداع) .

د.بەبەڵگەی ئیجماع وەك فەرمودەی (من شرب الخمر فاجلدوه فان عـادفي الرابعة فاقتلوه [١١٨])ئەوەی مەی خـواردەوە ئـەوا جەڵـدی لێ بـدەن، ئەگـەر تاچوار جار دووبارەی کردەوە، بیکوژن .

(الامام النواوی) دەفەرموێت: ئەمە ئیجماعی لەسەرە کە نەسخ کراوەتەوە، وە ئیجماع نەسخ ناکاتەوە و نەسخیش ناکرێتەوە، بەڵکو بەڵگەدەبێت لەسـەر نەسخ کردنەوەکە .

**٤ .بەناوبانگترین کتێب تیایدا :**

أ.(الاعتبار في الناسخ والمنسوخ مـن الاثـار) دانـراوی (ابـوبكر محمـد ابـن موسى الحازمی) .

ب.(الناسخ و المنسوخ)، (للأمام أحمد)

ج.(تجريد الأحاديث المنسوخة)، دانراوی (ابن الجوزی).

---

[١١٧] أخرجه مسلم

[١١٨] رواه ابو داود والترمذي

# الفصل الثالث

الخَبَر المَرْدوّد

- المبحث الأول: الضعيف.
- المبحث الثاني: المردود بسبب سقط من الإسناد
- المبحث الثالث: المردود بسبب طعن في الراوي

# بەشی سێهەم

## فەرموودەی لادراو (الخبر المردود)

باسی یەكەم: فەرموودەی لاواز (الضعیف).

باسی دووەم: فەرموودەی ڕەدكراوە بەهۆی كورت هەڵهاتن لەڕشتەكەیدا (السقط في الأسناد).

باسی سێهەم: فەرموودەی ڕەدكراوە بەهۆی تاوانباركرانی گێڕەرەوە (الطعن في الراوي).

## الخبر المردود، وأسباب ردّه

١– تعريفه:

هو الذي لم يَتَرَجَّحْ صِدْق الْمخْبِرِ به. وذلك بفقد شرط أو أكثر من شروط القبول التي مرت بنا في بحث الصحيح.

٢– أقسامه وأسباب رده :

لقد قسم العلماء الخبر المردود إلى أقسام كثيرة [١١٩] ، وأطلقوا على كثير من تلك الأقسام أسماء خاصة بها ، ومنها ما لم يطلقوا عليها اسما خاصاً بها بل سموها باسم عام هو " الضعيف " .

أما أسباب رد الحديث فكثيرة، لكنها ترجع بالجملة إلى أحد سببين رئيسين هما:

أ) سَقْط من الإسناد .

ب) طعن في الراوي .

وتحت كل من هذين السببين أنواع متعددة ، سأتكلم عنها بأبحاث مستقلة مفصلة إن شاء الله تعالى مبتدئاً ببحث " الضعيف " الذي يعتبر هو الاسم العام لنوع المردود .

---

[١١٩] بلغ بها بعضهم نيفاً وأربعين قسماً .

## ( فەرموودەی ڕەدکراوەو هۆکارەکانی ڕەدکردنەوەی )

### ١.پێناسەکەی:

ئەوفەرموودەیەیە کەتەرجیحی ڕاستگۆیی هەواڵدەرەکەی (المخبربه) نەدرابێت.

ئەمەش لەبەر لەدەستدانی مەرجێك یان زیاتر لە مەرجەکانی وەرگرتنی فەرموودە، ئەو مەرجانەی کە لەباسی فەرموودەی صەحیحدا گوزەری بەسەرماندا کرد.

### ٢.بەشەکانی و هۆکارەکانی ڕەدکردنەوەی:

زانایان فەموودەی ڕەدکراوەیان بۆ چەندەها بەشی زۆر دابەشکردووە[١٢٠]، بەسەر زۆری ئەو بەشانەدا ناوی تایبەتیان بۆداناون، وە هەندێکیان ناوی تایبەتیان بەسەردا نەبڕیون، بەڵکو هەروا ناوێکی گشتی یان بۆ داناون، وەك فەرمودەی لاواز (الضعیف).

هۆکارەکانی ڕەدکردنەوەی فەرمودە زۆرن، بەڵام بەشێوەیەکی گشتی بۆ دوو هۆکاری سەرەکی دەگەڕێتەوە:

أ.کورت هاتن لە ڕشتەکەدا (سقط من الأسناد).

ب.تانەدان لە گێڕەرەوەکەدا (الطعن في الراوي).

وە لە ژێر هەریەکە لەم دوو هۆکارەدا چەندەها جۆر هەیە، کە بەباس گەلێکی سەربەخۆ بە درێژی لەسەریان دەدوێم، أنشاء الله کە لەسەرە تاوە بە باسی فەرمودەی لاواز دەست پێ دەکەم، کەبەناوێکی گشتی دادەنرێت، بۆ جۆرەکانی فەرمودەی ڕەدکراوە.

---

(١٢٠) کە هەندێکیان گەیاندویانە تە چلو ئەوەندە بەش!

# المبْحَثُ الأول

## " الضعيف "

١ – تعريفه:

أ) لغة: ضد القوى، والضعف حسي ومعنوي، والمراد به هنا الضعف المعنوي.

ب) اصطلاحاً: هو ما لم يجمع صفة الحسن، بفقد شرط من شروطه.

قال البيقوني في منظومته :

وكلُّ ما عن رتبة الحُسْنِ قَصُر فهو الضعيف وهو اقسام كُثُر

٢– تفاوته:

ويتفاوت ضعفه بحسب شدة ضعف رواته وخفته كما يتفاوت الصحيح ، فمنه الضعيف، ومنه الضعيف جدا ومنه الواهي ، ومنه المنكر ، وشر أنواعه الموضوع [١٢١]

٣– أوْهَي الأسانيد :

وبناء على ما تقدم في " الصحيح " من ذكر أصح الأسانيد ، فقد ذكر العلماء في بحث " الضعيف " ما يسمي بـ "أوهي الأسانيد " وقد ذكر الحاكم النيسابوري [١٢٢] جملة كبيرة من "أوهي الأسانيد " بالنسبة إلى بعض الصحابة أو بعض الجهات والبلدان ، وأذكر بعض الأمثلة من كتاب الحاكم وغيره :

[١٢١] انظر علوم الحديث ـ معرفة الموضوع ص 89

[١٢٢] في معرفة علوم الحديث ص ٧١ -٧٢

أ) أوهي الأسانيد بالنسبة لأبي بكر الصديق رضي الله عنه " صدقة بن موسي الدقيقي عن فرقد السبخي عن مرة الطيب عن أبي بكر " [١٢٣] .

ب) أوهي أسانيد الشاميين " محمد بن قيس المصلوب عن عبيد الله بن زحْر عن علي بن يزيد عن القاسم عن أبي أمامة[١٢٤] .

ت) أوهي أسانيد ابن عباس رضي الله عنه " السُّدِّي الصغير محمد بن مروان عن الكلبي عن أبي صالح عن ابن عباس " قال الحافظ ابن حجر : " هذه سلسلة الكذب لا سلسلة الذهب"[١٢٥] .

**٤- مثاله:**

ما أخرجه الترمذي من طريق " حَكيم الأثْرَم " عن أبي تميمة الهَجَيْمي عن أبي هريرة عن النبي صلي الله عليه وسلم قال : " من أتي حائضاً أو امرأة في دبرها أو كاهنا فقد كفر بما أنزل على محمد " ثم قال الترمذي بعد إخراجه " لا نعرف هذا الحديث إلا من حديث حكيم الأثرم عن أبي تميمة الهجيمي عن أبي هريرة " ثم قال " وَضعَّفَ محمد[١٢٦]، هذا الحديث من قِبَلِ إسناده "[١٢٧]، قلت لأن في إسناده حكيماً الأثرم ، وقد ضعفه العلماء ، فقد قال عنه الحافظ ابن حجر في تقريب التهذيب " فيه لِيْن " .

---

[١٢٣] معرفة علوم الحديث ص ٧١ - ٧٢

[١٢٤] معرفة علوم الحديث ص ٧١ - ٧٢

[١٢٥] انظر تدريب الراوي جـ ١ — ص ١٨١

[١٢٦] أي البخاري.

[١٢٧] الترمذي مع شرحه — جـ ١ — ص ٤١٩ - ٤٢٠

**٥- حكم روايته :**

يجوز عند أهل الحديث وغيرهم رواية الأحاديث الضعيفة والتساهل في أسانيدها من غير بيان ضعفها ـ بخلاف الأحاديث الموضوعة فأنه لا يجوز روايتها إلا مع بيان وضعها ـ بشرطين .

أ) أن لا تتعلق بالعقائد، كصفات الله تعالى.

ب) أن لا تكون في بيان الأحكام الشرعية مما يتعلق بالحلال والحرام .

يعني يجوز روايتها في مثل المواعظ والترغيب والترهيب والقصص وما أشبه ذلك ، وممن رُوي عنه التساهل في روايتها سفيان الثوري وعبدالرحمن بن مَهدي وأحمد بن حنبل [١٢٨]

وينبغي التنبه إلى أنك إذا رويتها من غير إسناد فلا تقل فيها : قال رسول الله صلى الله عليه وسلم كذا ، وإنما تقول : رُوي عن رسول الله صلى الله عليه وسلم كذا ، أو بلغنا عنه كذا وما أشبه ذلك لئلا تجزم بنسبة ذلك الحديث للرسول وأنت تعرف ضعفه .

**٦- حكم العمل به :**

اختلف العلماء في العمل بالحديث الضعيف، والذي عليه جمهور العلماء أنه يستحب العمل به في فضائل الأعمال لكن بشروط ثلاثة، أوضحها الحافظ ابن حجر [١٢٩] وهي:

أ) أن يكون الضعف غير شديد .

---

[١٢٨] انظر علوم الحديث ص ٩٣ والكفاية ص ١٣٣ - ١٣٤ باب التشدد في أحاديث الأحكام والتجوز في فضائل الأعمال.

[١٢٩] انظر تدريب الراوي جـ ١ ـ ص ٢٩٨ ـ ٢٩٩ وفتح المغيث جـ١ ـ ص٢٦٨ .

ب) أن يندرج الحديث تحت أصل معمول به.

ت) أن لا يعتقد عند العمل به ثبوته، بل يعتقد الاحتياط.

**٧- أشهر المصنفات التي هي مَظِنَّة الضعيف :**

أ) الكتب التي صُنِّفَتْ في بيان الضعفاء : ككتاب الضعفاء لابن حبان ، وكتاب ميزان الاعتدال للذهبي ، فأنهم يذكرون أمثلة للأحاديث التي صارت ضعيفة بسبب رواية أولئك الضعفاء لها .

ب) الكتب التي صُنِّفت في أنواع من الضعيف خاصة : مثل كتب المراسيل والعلل والمُدْرَج، غيرها ككتاب المراسيل لأبي داود ، وكتاب العلل للدارقطني.

# باسی یەکەم

## فەرموودەی لاواز ( الضعیف )

### ١.پێناسەکەی:

**أ.لەرووی زمانەوە:**دژی بەهێز (القوي)یە، وە لاوازیش یان هەستدارانە (حسي)یە، یان مەعنەوییە، وە لێرەدا مەبەست پێی لاوازی مەعنەوییە.

**ب.لەروی زاراوەوە:**ئەو فەرموودەیەیە کە سیفەتی فەرمودەی حەسەنی تیادا نەهاتبێتەدی، بەوەی کە مەرجێك لە مەرجەکانی فەرمودەی (حسن)ی لەدەست دا بێت.

(الإمام البیقوني) لە (منظومة)ەکەیدا دەڵێت:

(و كلُّ ما عن رتبة الحُسْنِ قَصُر..........فهو الضعيف و هو أقسام كُثُر)

واتە: وە هەر فەرمودەیەك کەلەپلەی، (حسن) دابەزی، ئەوە بەلاواز (ضعیف) دادەنرێت، ئەمیش چەندەها بەشی لێ دەبێتەوەو زۆرە.

### ٢.جیاوازیەکانی (تفاوته):

فەرمودەی لاواز بەگوێرەی زۆرو کەمی لاوازبوونی ڕاوییەکان دەگۆڕێت، هەروەك فەرموودەی صەحیحیش وایە، جا هەیانە **ضەعیفە**، هەیانە زۆر **ضەعیفە**، هەیانە، شێواو (واهی)یە، و هەیانە نەناسراو (**منکر**)ـە، وە خراپترینی جۆرەکانی لاواز، هەڵبەستراو (**موضوع**)ەکەیەتی [١٣٠].

(١٣٠) علوم الحديث، معرفة الموضوع، ص٨٩.

**٣.لاوازترین سەنەد:**

بەگوێرەی ئەوەی کە ڕابورد لەسەر فەرمودەی صەحیح لەباسکردنی صەحیح ترینی سەنەدەکان زانایان لەباسکردنی فەرمودەی لاوازدا باسی لاوازترینی سەنەدەکانیان کردووە، کە بە (**أو هي الأسانيد**) ناوزەدیان کردووە، وە پێشەوا (**حاكم النيسابوري**) [١٣١] ڕێژەیەکی گەورەی لە لاوازترینی سەنەدەکان باسکردووە، ئەمەش بەگوێرەی هەندێ لە هاوەڵان (أصحاب)ﷺ وهەندێ لایەن وهەندێ لە شارەکان، جا هەندێ لەو نمونانەی لە کتێبەکەی (حاکم)و هی ترەوە باس دەکەم.

أ.لاوازترین سەنەد بەگوێرەی (ابوبکر الصديق) ﷺبریتیە لە: (صدقة بن موسى الدقيقي) لە (فرقد السبخي) لە (مرّة الطيب عن أبي بكر)ەوە[١٣٢].

ب.لاوازترین سەنەدی شامیەکان بریتیەلە (محمد بن قيس المصلوب) لە (عبيد الله بن زحر) ئەویش لە (علي بن يزيد) ئەویش لە (قاسم) و ئەویش لە (أبو أمامة)ەوە [١٣٣].

جـ.لاوازترین سەنەدی (أبن عبّاس) ﷺبریتیە لە:(السُدّي الصغير محمد بن مروان) لە (كلبى) و ئەویش لە (ابو صالح) ئەویش لە (أبن عبّاس)ەوەیە.

(حافظ إبن حجر) دەڵێت:ئەمە زنجیرەی درۆیە، نەك زنجیرەی ئاڵتون...، هذه سلسلة الكذب، لاسلسلة الذهب.[١٣٤]

---

([١٣١]) معرفة علوم الحديث ص٧١ – ٧٢.

([١٣٢]) معرفة علوم الحديث ص٧١ – ٧٢.

([١٣٣]) معرفة علوم الحديث ص٧١ – ٧٢.

([١٣٤]) تدريب الراوي ج١/ ص١٨١.

### ٤.نموونەکەی:

وەك ئەوەی کە (ترمذي) لە ڕێی (حكيم الأثرم) ..ەوە، ئەویش لە ..(أبي تميمة الهُجيمي)..ئەویش لە (أبو هريرة) ..ەوە، ئەویش لە پێغەمبەری خواوە (ﷺ) کە دەفەرموێ: (من أتى حائضاً أو أمرأة في دبرها أو كاهناً فقد كفر بما أنزل على محمدﷺ) واتە: ئەوەی بچێتە لای ئافرەتێ کە لەحەیزا بێت، یان لەدواوە بچێتەلای، یاخود بچێتەلای فالگرەوە، وەك ئەوە وایە کوفری کردبێت بەوەی کە نازلکراوەتە سەر محمد (ﷺ) کە قورئانە، پاشان (ترمذي) لەدوای هێنانی ئەم فەرمودەیە دەڵێت: ئەم فەرمودەیە، ناناسین و نازانین تەنها لەڕێی فەرمودەکەی (حكيم الأثرم)،ئەویش لە (أبي تميمة الهُجَيْمي) ئەویش لە (أبو هريرة)ەوە نەبێت، پاشان دەڵێت: (محمد) واتە: ئیمامی بوخاری ئەم فەرمودەیەی بەلاواز داناوە لەڕوی سەنەدەکەیەوە.[١٣٥]

دەڵێم:چونکە لەسەنەدەکەیدا (حكيم بن الأثرم) هەیە، کە زانایان بەلاوازیان داناوە، کە (حافظ إبن حجر) لە کتێبی (تقريب التهذيب)دا لەسەری دەڵێت: (فيه لِيْن)، ئاسانەو نەرمی نواندنی تیادا هەیە.

### ٥.حوکمی گێڕانەوەی فەرمودەی لاواز:

لەلای هەندێ لە زانایانی فەرمودەو زانایانی تریش دروستە گێڕانەوەی فەرمودەلاوازەکان و ئاسانکاری (تساهل)کردن لەسەنەدەکانیاندا بەبێ باسکردن و ڕوونکردنەوەی لاوازەکانیان بەپێچەوانەوەی فەرمودە هەڵبەستراو (موضوع)ەکانەوە، ئەوانە دروست نییە کە ڕیوایەت بکرێن، مەگەر لەگەڵ ڕوونکردنەوەو دەرخستنی هەڵبەستراویەکەیاندا، ئەویش بەدوو مەرج.

---

([١٣٥]) الترمذي مع شرحه ج١/ص٤١٩- ٤٢٠.

أ.دەبێت پەیوەندیان نەبێــت بە بابەتی بیروباوەڕەوە، وەك صیفاتەكانی خوای گەورە.

ب.نابێت ڕێسای (أحكام)ە شەرعیەكان ڕوون بكەنەوە، ئەوانەی كە پەیوەستن بە حەلاڵ و حەرامەوە.

**واته:** دروسته ڕیوایەت كردنیان، وەك لـە ئامۆژگاریو زەوقدانە خەڵكی (ترغیب)و ترساندنیان (ترهیب)، و چیرۆك و هاو وێنەی ئەمانەدا، وە لەوانەی كە لێوەیان ڕیوایەت كراوە بەوەی كە ئاسان كاریان كردووە، لە گێڕانەوەیاندا (سفیان الثوري)و (عبدالرحمن بن مهدي)و (أحمد بن حنبل)ن[١٣٦].

پێویستە بێداركردنەوە لـەسەر ئەوەی كە هەركات بەبـێ باسكردنی سەنەدەكە ڕیوایەتیت كردن، مەڵـێ: (قال رسول الله (ﷺ) كذا) پێغەمبەر (ﷺ) وای فەرموو، بەڵكو بڵـێ: (روي عن رسول الله (ﷺ) كذا) یاخود بڵـێ فلان شت لە پێغەمبەرەوە (ﷺ) ڕیوایەتكراوە، یاخود بڵـێ (بلغنا عنه كذا) لەوەوە فلان شتمان پێگەیشتووە یان هاو وێنەی ئەمانە، لەبەر ئەوەی كە پێدا گیری تەواو (جزم)ی نیسبەت دانی ئەو فەرموودەیە بۆ لای پێغەمبەر (ﷺ) نەكەیت لەكاتێكا كە تۆ دەزانیت لاوازە.

## ٦.حوكمی كاركردن پێی:

زانایان جیاوازن لـەسەر كاركردن بە فەرموودەی لاواز، ئەوەی كە جەماوەری زانایانی لـەسەرە ئەوەیە كە كاركردن پێی لە (فضائل الأعمال)دا

---

[١٣٦] علوم الحديث ص٩٣ و الكفاية ص١٣٣ – ١٣٤ باب التشدّد في أحاديث الأحكام و التجوز في فضائل الأعمال.

چاكه، بەڵام بەسێ مەرج كە (حافظ إبن حجر) ڕوونی كردونەتەوە، كە ئەمانەن[١٣٧].

أ.نابێت لاوازییەكەی زۆر بێتو دەبێت كەم بێت.

ب.دەبێت ئەو فەرموودەیە لەژێر یاسایەكی گشتیو كارپێكراوی ئیسلامیدا جێگای ببێتەوەو بگونجێ.

ج.نابێت لە كاتی كارپێكردنیدا باوەڕت وابێت، كە تەواوی ئەو فەرمودەیە جێگیر (ثابت) بووە، بەڵكو پێویستە مشور (أحتیاط) بكرێت.

**٧.ناسراوترین، ئەو دانراوانەی كە پێگەی فەرمودەی لاوازن:**

أ.ئەو كتێبانەی كە بۆ ڕوونكردنەوەی فەرموده لاوازەكان دانراون: وەك كتێبی (الضعفاء) دانراوی (إبن حبان)و كتێبی (میزان الإعتدال)ی (الإمام الذهبي)، ئەمانە نمونە گەلێكی فەرمودەی لاواز باس دەكەن، بەهۆی ئەوەوە لاوازن، چونكە كەسانێكی لاواز ڕیوایەتیان كردووە.

ب.ئەو كتێبانەی كە لە چەند جۆرێكی لاوازدا بەتایبەتی دانراون:وەك كتێبەكانی (المراسیل)و (العلل)و (المُدرَج)و هتد...وەك كتێبی (المراسیل) دانراوی (أبو داود) و كتێبی (العلل) دانراوی (دار قطني).

---

(١٣٧) تدريب الراوي ج١/ ص٢٩٨ – ٢٩٩و فتح المغيث، ج١/ ص٢٦٨.

## المبْحَث الثَاني

## المردود بسبب سَقْط من الإسناد

### ١- المراد بالسَّقْط من الإسناد :

المراد بالسَّقْط من الإسناد انقطاع سلسلة الإسناد بسقوط راو أو أكثر عمداً من بعض الرواة أو عن غير عمد ، من أول السند أو من آخره أو من أثنائه ، سقوطاً ظاهراً أو خفياً .

### ٢- أنواع السقط :

يتنوع السقط من الإسناد بحسب ظهور ، وخفائه إلى نوعين هما :

أ) سَقْط ظاهر وهذا النوع من السقط يشترك في معرفته الأئمة وغيرهم من المشتغلين بعلوم الحديث ، ويعرف هذا السقط من عدم التلاقي بين الراوي وشيخه ، إما لأنه لم يُدرك عَصْره ، أو أدرك عصره لكنه لم يجتمع به ( وليست له منه إجازة ولا وِجاده ) [١٣٨] لذلك يحتاج الباحث في الأسانيد إلى معرفة تاريخ الرواة لأنه يتضمن بيان مواليدهم ووفياتهم وأوقات طلبهم وارتحالهم وغير ذلك .

وقد اصطلح علماء الحديث على تسمية السقط الظاهر بأربعة أسماء بحسب مكان السقط أو عدد الرواة الذين أُسقطوا . وهذه الأسماء هي:

١- المُعَلَّق.

---

[١٣٨] الإجازة : الإذن بالرواية ، وقد يحصل الراوي عليها من شيخ لم يلتق به ، كأن يقول الشيخ أحياناً أجزت رواية مسموعاتي لأهل زماني ، والوجادة بكسر الواو : أن يجد الراوي كتاباً لشيخ من الشيوخ يعرف خطه ، فيروي ما في ذلك الكتاب عن الشيخ ، وسيأتي تفصيل بحث الإجازة والوجادة في باب طرق التحمل وصيغ الأداء .

٢– المُرْسَل.

٣– المُعْضَل.

٤– المُنْقَطِع.

ب) سَقْط خَفِي: وهذا لا يدركه إلا الأئمة الحَذّاق المطلعون على طرق الحديث وعلل الأسانيد. وله تسميتان وهما :

٥– المُدَلَّس.

٦– المُرْسَل الخفي.

وإليك بحث هذه المسميات الستة مفصلة على التوالي.

# باسی دووەم

## فەرموودەی ڕەدکراوە، بەهۆی کورت هەڵهێنان لەسەنەددا

## ( السقط من الإسناد )

### ١.مەبەست لە (السقط من ألإسناد):

مەبەست لە کورت هێنانی ڕشتە (السقط من ألإسناد) بریتیە لە پچڕانی زنجیرەی ڕشتەکە، بەداکەوتنی ڕاویەك یان زیاتر لەهەندێ لەو ڕاویانەدا ئەمە بەتایبەتیوبەمەبەستی (عمداً)، یان بە هەوانتەیی (غیر عمد) هەر لە سەرەتای سەنەدەکەوە، یان لە کۆتاییەکەی دا یاخود لەناوەڕاستەکەیدا، ئیتر ئەو داکەوتنە داکەوتنی ئاشکرا (ظاهر) بێت، یان شاراوە (خفي) بێت.

### ٢.جۆرەکانی داکەوتن (السقط):

کورت هەڵهێنان لەسەنەددا بەگوێرەی ئاشکراییو شاراوەیی یەکەی دەبێتە دوو جۆرەوە کە ئەمانەن:

أ.داکەوتنی ئاشکرا (سقط ظاهر): ئەم جۆرە کورت هاتنە پێشەوایان و غەیری ئەوانیش کە سەرقاڵن بەزانستەکانی فەرموودەوە لە زانینیدا بەشدارن، ئەم داکەوتنە (سقط)ە بەهۆی نەبوونی پێگەیشتن لەنێوان ڕاوییەکەداو مامۆستاکەیەوە دەزانرێت، جائەمە یان لەبەر ئەوەیە کە لەوسەردەمەیدا نەبووە، یاخود لە سەردەمی مامۆستاکەیدا هەبووە، بەڵام کۆنەبوەتەوەلەگەڵی (مۆڵەت دانو دەسکەوتنیشی لێوەی نەبێت)[139]، لەبەر

---

([139]) (الأجازة:مۆڵەتدان) واتە: مۆڵەتدان بە ڕیوایەت کردن، جا ڕاوی ئەمەی لە مامۆستایەکەوە چنگ دەکەوێت کە پێی نەگەیشتووە، وەك ئەوەی کە ئەو مامۆستایە بڵێت: ئەوا بۆ

**ئەمە لێکۆڵەرەوەی سەنەد پێویستی بە زانینی مێژووی ڕاویەکان هەیە، چونکە لەو مێژووەدا ڕوونکردنەوەی مێژووی لەدایك بوونو، مردنو کاتەکانی زانست خواستنو بەشوێن زانست ڕۆشتنیدا دەزانرێ، وەزانایانی فەرموودە لەسەر ناونانی بەرکەوتنی ئاشکرا (السقط الظاهر) چوارناویان کردوەتە زاراوە بۆیان، ئەمەش بە گوێرەی جێگای داکەوتن (سقط)ە کەو یان ژمارەی ئەو ڕاویانەی کە بچڕاون، وە ئەو ناوانەش ئەمانەن:**

**١.المعلق: ماناکەی دێت لەمەودوا.**

**٢.المرسل: بەرەڵاکراو.**

**٣.المعضل: ئاڵۆزاو.**

**٤.المنقطع: بچڕاو.**

**ب.کەوتنی شاراوەو سووك (سقط خفي): ئەمە تەنها پێشەوایانی لێهاتوو لێزان:(حُذّاق)، دەی زانن، ئەوانەی کە ئاگادارن بەسەر ڕێبازەکانی فەرموودەو نەخۆشیەکانی سەنەددا، وە دوو ناوی هەیە، کە ئەمانەن:**

**١.المدلس: فێڵ تیاکراو.**

**٢.المرسل الخفي: مورسەلی شاراوە.**

**جا باسی ئەم شەش ناوەت بەدرێژی و یەك لەدوای یەك بۆ دەکەم.**

---

ڕیوایەت کردنی ئەوەی بیستوومە مۆڵەتم دا بەخەڵکانی سەردەمەکەم کە بیگێڕمەوە، **(الوجادة – دەستکەوتن)**: بەکەسری واوەکە ئەوەیە کەڕاویەکە کتێبێکی لە کتێبەکانی مامۆستاکەی دەست بکەوێت و خەتەکەی بناسێت، جا ئەوەی لەو کتێبەدایە لە مامۆستاکەیەوە ڕیوایەتی بکات، درێژەی باسی (الأجازة) و (الوجادة) لە بابی (طرق التحمل)، و (صيغ الأداء)دا دێت.

## المُعَلَّق

**١ – تعريفه:**

أ) لغة : هو اسم مفعول من " علق " الشيء بالشيء أي ناطه وربطه به وجعله معلقاً . وسمي هذا السند معلقاً بسبب اتصاله بالجهة العليا فقط ، وانقطاعه من الجهة الدنيا ، فصار كالشيء المعلق بالسقف ونحوه .

ب) اصطلاحاً : ما حُذف من مبدأ إسناده راو فأكثر على التوالي .

**٢– من صوره :**

أ) أن يحذف جميع السند ثم يقال مثلا " قال رسول الله صلي الله عليه وسلم : كذا "

ب) ومنها أن يحذف كل الإسناد إلا الصحابي، أو إلا الصحابي والتابعي [١٤٠]

**٣– مثاله:**

ما أخرجه البخاري في مقدمة باب ما يُذْكَر في الفَخِذ : " وقال أبو موسي : غَطَّي النبي صلى الله عليه وسلم ركبتيه حين دخل عثمان [١٤١] فهذا حديث معلق ، لأن البخاري حذف جميع إسناده إلا الصحابي وهو أبو موسي الأشعري .

**٤– حكمه :**

الحديث المعلق مردود ، لأنه فقد شرطا من شروط القبول وهو اتصال السند وذلك بحذف راو أو أكثر من إسناده مع عدم علمنا بحال ذلك المحذوف.

---

[١٤٠] شرح النخبة ص ٤٢

[١٤١] البخاري ـ كتاب الصلاة ـ جـ١ ـ ص٩٠

**٥- حكم المعلقات في الصحيحين :**

هذا الحكم ـ وهو أن المعلق مردود ـ هو للحديث المعلق مطلقاً، لكن أن وجد المعلق في كتاب التُزِمَتْ صحته ـ كالصحيحين فهذا له حكم خاص ، قد مر بنا في بحث الصحيح [١٤٢] ولا بأس بالتذكير به هنا وهو أنَّ :

أ) ما ذُكر بصيغة الجَزْم: كـ " قال " و " ذَكَرَ " و " حكي " فهو حُكْمٌ بصحته عن المضاف إليه .

ب) وما ذُكِرَ بصيغة التمريض : كـ " قِيل " و" ذُكِرَ " و" حُكِيَ " فليس فيه حُكْم بصحته عن المضاف إليه ، بل فيه الصحيح والحسن والضعيف ، لكن ليس فيه حديث واه لوجوده في الكتاب المسمي بالصحيح ، وطريق معرفة الصحيح من غيره هو البحث عن إسناد هذا الحديث والحكم عليه بما يليق به [١٤٣]

## فەرموودەی ( المعلق )

**١ .پێناسەکەی:**

**أ.لەڕووی زمانەوە:** ئیسمی مەفعولەو لە (علق الشئ بالشئ)، هەڵواسینی شتێك بە شتێکی ترەوە هاتووە، واتە: پێیدا هەڵخەنیو پەیوەستی کردوو هەڵی واسی، وە ئەم جۆرە سەنەدەیش بە (معلق) ناسراوە، بەهۆی پەیوەست بوونیەوەیە بە ئاڕاستەی سەرەوە، (الجهة العليا) وە بچڕاندنیەتی لە ئاڕاستەی خوارەوە(الجهة الدنيا) جا وەك شتێکی هەڵواسراوەی بەسەقفێکەوە یان هەر شتێکی ترەوە پێدێت.

---

[١٤٢] في الفقرة / ١١ / وهي " ما هو المحكوم بصحته مما رواه الشيخان ؟"

[١٤٣] قد بحث العلماء في المعلقات التي في صحيح البخاري ، وذكروا أسانيدها المتصلة ، وأحسن من جمع ذلك هو الحافظ ابن حجر في كتاب سماه " تغليق التعليق " .

ب.لەڕووی زاراوەوە: ئەو فەرموودەیە یە کە لەسەرەتای سەنەدەکەیەوە ڕاویەك یان زیاتر بەیەك لە دواییەکی قووت درا بێت.

## ٢.لە شێوازەکانی (معلق):

أ.وەك ئەوەی کە هەموو سەنەدەکە لاببرێت‌و پاشان بووترێت، بۆ نموونە: (قال رسول الله (ﷺ) کذا).

ب.جۆرێکی تر وەك ئەوەی کە سەرجەم سەنەدەکە لاببرێت، جگە لە تەنها هاوەڵێك‌ﷺ یان هاوەڵێك‌ﷺو تابیعیەك بمێنێتەوە.(١٤٤)

## ٣.نمونەی فەرمودەی (معلَقْ):

وەك ئەوەی کە (ألإمام البخاري) لە پێشەکی بابی (مايُذْكَر في الفَخِذ: ئەوەی دەربارەی ڕان باسکراوە)دا هێناویەتی: (وقال أبو موسى: غَطّى النبي (ﷺ) ركبتيه حين دخل عثمان...)[١٤٥] (أبو موسى) دەڵێت: پێغەمبەر (ﷺ)، کاتێك کە ئیمام عوسمان دەهات بۆلای قاچەکانی دادەپۆشی، ئەمە فەرمودەیەکی (معلق)ە، چونکە (الإمام البخاری) سەرجەم ڕشتەکەی لاداوە، جگە لە تەنها صەحابییەك کە ئەویش (أبو موسى)ی ئەشعەرییە.

## ٤.حوکمەکەی:

فەرمودەی (معلق) لادراو (مردود)ە، چونکە مەرجێك لەمەرجەکانی وەرگرتن (قبولّ)ی لە دەستداوە، کە ئەویش ڕشتە پەیوەستی (إتصال السند)ە، کە ئەویش بەحەزف کردنی ڕاوییەك یان زیاتر لە سەنەدەکەیدا، لەگەڵ بوونی بێ عیلمی ماندا بە حاڵەتی ئەو کەسە حەزف کراوە.

---

(١٤٤) شرح النخبة ص٤٢.

(١٤٥) البخاري – كتاب الصلاة ١/ ٩٠.

## ٥.حوكمی فەرموده (معلق)ـەكانی دوكتێبە صەحیحەكە:

**ئەم حوكمە:** واتە مەردود بوونی فەرمودەی (معلق): ئەمە بۆ فەرمودەی (معلق)ە بەگشتی، بەلاَم ئەگەر فەرموودەی (معلق) بینرا، لە كتێبێكدا كە پابەندی صەحیح بوون بوو، وەك:دوو كتێبە صەحیحەكە ئەمە حوكمێكی تایبەتی هەیە، كە لە باسی صەحیح دا بە سەریدا گوزەراین[١٤٦] ،وە یا دخستنەوەی لێرەدا ئاساییە، ئەویش ئەوەیە كە:

أ.ئەوەی كە بەدەستەواژەیەكی بێ چەندوچوون (صیغة الجزم) هاتبێ، وەك: (قال–وتی)و (ذكر – باسی كرد)و (حكی–گێڕایەوە) ئەمە حوكم دراوە لەسەر، صەحیح بوونی بەگوێرەی حاڵــی ئەوكەسەی كەشتەكەی دراوەتە پاڵ

ب.ئەوەی كە بەدەستەواژەیەكی دەرخستن (صیغة التعریض) باسكرا بێت، وەك (قیل – گوترا) و (ذُكِرَ: باسكرا)و، (حُكِيَ – گێڕدرایەوە)، كە هیچ حوكمێ نەدرابێ بە سەریدا بۆ صەحیح بوونی ئەوەی كە دراوە تە پاڵــی، بەڵكو ئەمە (صحیح) و (حسن) و (ضعیف)ی تیادایە.

بەلاَم فەرمودەی نەخۆشی تیادا نییە، چونكە لە كتێب گەلێكدان، كە بە (صحیح) ناوزەد كراون، وە ڕێگای ناسینی صەحیح لە غەیری خۆی بریتیە لە لێكۆڵینەوە كردن لەسەر سەنەدی ئەو فەرمودەیەو دانی حوكمێكی گونجاو بەسەریدا[١٤٧].

---

(١٤٦) لە برِگەی (١١) دا كە ئەویش ئەوەیە كە دوو شێخەكە (بوخاریو موسـلیم) حوكمیـان دابێت بە صەحیح بوونی.

(١٤٧) زانایان باسـیان لەسەر ئەو فەرموده (معلق)انـە كـردووە، كـە لــە (صـحیح البخـاری)دا هــەن، وە ســەنەدە پەیوەســتە كانیــان باســكردووە، وە چــاكترین لەوانــەی كــە ئــەو فەرمودانــەی كۆكردونەتەوە (حافظ إبن حجر)ە، لەو كتێبەیدا كە ناوی ناوەتە (تغلیق التعلیق).

## المُرْسَل

**١–تعريفه:**

أ)لغة: هو اسم مفعول من " أرسل " بمعنى " أطلق " فكأن المُرسِل أَطْلَقَ الإسناد ولم يقيده براوٍ معروف.

ب) اصطلاحاً : هو ما سقط من آخر إسناده مَنْ بَعْدَ التابعي [١٤٨]

**٢– صورته :**

وصورته أن يقول التابعي ـ سواء كان صغيراً أو كبيراً ـ قال رسول الله صلى الله عليه وسلم كذا، أو فعل كذا أو فُعِل بحضرته كذا وهذه صورة المرسل عند المحدثين.

**٣– مثاله:**

ما أخرجه مسلم في صحيحه في كتاب البيوع قال : " حدثني محمد بن رافع ثنا حُجَيْن ثنا الليث عن عُقَيْل عن ابن شهاب عن سعيد بن المسيب أن رسول الله صلى الله عليه وسلم نهي عن المُزَابَنَةِ " [١٤٩]

فسعيد بن المسيب تابعي كبير، روى هذا الحديث عن النبي صلي الله عليه وسلم بدون أن يذكر الواسطة بينه وبين النبي صلي الله عليه وسلم فقد أسقط من إسناد هذا الحديث آخِرَهُ وهو من بعد التابعي ، وأقل هذا السقط أن يكون قد سقط الصحابي ويحتمل أن يكون قد سقط معه غيره كتابعي مثلا .

---

[١٤٨] نزهة النظر ص ٤٣ . والتابعي هو من لقي الصحابي مسلماً ومات على الإسلام.

[١٤٩] مسلم ـ كتاب البيوع .

### ٤- المُرْسَل عند الفقهاء والأصوليين:

ما ذكرته من صورة المرسل هو المرسل عند المحدثين، أما المرسل عند الفقهاء والأصوليين فأعم من ذلك فعندهم أن كل منقطع مرسل على أي وجه كان انقطاعه، وهذا مذهب الخطيب أيضاً.

### ٥- حكمه :

المرسل في الأصل ضعيف مردود، لفقده شرطاً من شروط المقبول وهو اتصال السند، وللجهل بحال الراوي المحذوف لاحتمال أن يكون المحذوف غير صحابي، وفي هذه الحال يحتمل أن يكون ضعيفاً.

لكن العلماء من المحدثين وغيرهم اختلفوا في حكم المرسل والاحتجاج به، لأن هذا النوع من الانقطاع يختلف عن أي انقطاع آخر في السند، لأن الساقط منه غالبا ما يكون صحابياً، والصحابة كلهم عدول، لا تضر عدم معرفتهم.

ومجمل أقوال العلماء في المرسل ثلاثة أقوال هي:

أ) ضعيف مردود : عند جمهور المحدثين وكثير من أصحاب الأصول والفقهاء ، وحجة هؤلاء هو الجهل بحال الراوي المحذوف لاحتمال أن يكون غير صحابي .

ب) صحيح يُحْتَجّ به : عند الأئمة الثلاثة ـ أبو حنيفة ومالك وأحمد في المشهور عنه ـ وطائفة من العلماء بشرط أن يكون المرسل ثقة ولا يرسل إلا عن ثقة .

وحجتهم أن التابعي الثقة لا يستحل أن يقول : قال رسول الله صلي الله عليه وسلم إلا إذا سمعه من ثقة .

جـ)قبوله بشروط: أي يَصِحُ بشروط، وهذا عند الشافعي وبعض أهل العلم.

وهذه الشروط أربعة، ثلاثة في الراوي المرسِل، وواحد في الحديث المرسَل، وإليك هذه الشروط.

١–أن يكون المرسل من كبار التابعين .

٢–وإذا سَمَّى من أرسل عنه سَمَّى ثقة.

٣–وإذا شاركه الحفاظ المأمونون لم يخالفوه .

٤–وأن ينضم إلى هذه الشروط الثلاثة واحد مما يأتي:

(أ) أن يُرْوَى الحديث من وجه آخر مُسْنَداً .

(ب)أو يُرْوى من وجه آخر مرسَلاً أرسله من أخذ العلم عن غير رجال المرسل الأول.

(ج)أو يُوافِقَ قول صحابي .

(د) أو يُفْتِي بمقتضاه أكثر أهل العلم . [١٥٠]

فإذا تحققت هذه الشروط تبين صحة مَخْرَج المرسَل وما عَضَدَهُ، وأنهما صحيحان، لو عارضهما صحيح من طريق واحد رجحناهما عليه بتعدد الطرق إذا تعذر الجمع بينهما.

٦– مرسَل الصحابي:

هو ما أخبر به الصحابي عن قول الرسول صلى الله عليه وسلم أو فعله ، ولم يسمعه أو يشاهده ، إما لصغر سنه أو تأخر إسلامه أو غيابه ، ومن هذا النوع أحاديث كثيرة لصغار الصحابة كابن عباس وابن الزبير وغيرهما .

---

[١٥٠] انظر الرسالة للشافعي ص ٤٦١

٧- حكم مرسَل الصحابي :

الصحيح المشهور الذي قطع به الجمهور أنه صحيح محتج به ، لأن رواية الصحابة عن التابعين نادرة ، وإذا رووا عنهم بينوها ، فإذا لم يبينوا ، وقالوا : قال رسول الله ، فالأصل أنهم سمعوها من صحابي آخر ، وحذف الصحابي لا يضر ، كما تقدم .

وقل إن مرسل الصحابي كمرسل غيره في الحكم، وهذا القول ضعيف مردود.

٨- أشهر المصنفات فيه :

أ) المراسيل لأبي داود .

ب) المراسيل لابن أبي حاتم .

ج) جامع التحصيل لأحكام المراسيل للعلائي [١٥١]

## فەرموودەی بەرەڵاکراو ( المرسل )

### ١.پێناسەکەی:

**أ.لەڕووی زمانەوە:** ئیسمی مەفعولە و لە (أرسل)ەوە وەرگیراوە، کە بە مانای (أطلق) ڕەها کراوە، دێت جا فەرموودەی مورسەل سەنەدەکەی ڕەهایە، و تایبەت نەکراوە بە ڕاوییەکی ناسراوەوە.

**ب.لەڕوی زاراوەوە:**ئەو فەرمودەیەیە کە لە کۆتایی سەنەدەکەیەوە پاش کابرای شوێن کەوتە (تابعي) کەسێك پچڕا بێت[(١٥٢)].

---

[١٥١] الرسالة المستطرفة ص ٨٥-٨٦ ، والعلائي هو الحافظ المحقق صلاح الدين أبو سعيد خليل بن كيكلدي العلائي ولد بدمشق سنة ٦٩٤ هـ وتوفى في القدس سنة ٧٦١هـ .

([١٥٢]) نزهة النظر، ص٤٣، (تابعي: ئەو کەسەیە کە بەموسڵمانێتی چاوی بە صەحابییەك کەوتبێت و بەموسڵمانیەتیش مردبێت).

**٢.شێوازەکەی:**

شێوازەکەی ئەوەیە کە کابرای تابیعی بڵێت: ئیتر بچوك بێت یان گەورە چونیەکە پێغەمبەر (ﷺ) ئەوەی گوت، یان ئەوەی کرد، یان لەخزمەتیا ئەوەکرا، ئەمە شێوازو حاڵەتی فەرموودەی مورسەلە لەلای فەرمودە ناسان.

**٣.نمونەکەی:**

وەك ئەوەی کە ئیمام (مسلم) لە صەحیحەکەیدا لە کتێبی (البیوع)دا هێناویەتی، دەڵێت: (حدثني محمد بن رافع ثنا حجين ثنا الليث عن عُقَيْل عن إبن شهاب عن سعيد بن المسيب أن رسول الله (ﷺ) نهى عن المُزابنةِ)[١٥٣]، موحەممەدی کوڕی ڕافیع پێی وتم: کە (حُجين) پێی وتووە، و (الليث)یش بەوی وتووە، ئەویش لە (عُقَيل)ەوە، ئەویش لە (إبن شهاب)ەوە ئەویش لە سەعیدی کوڕی موسەییبەوە، قسەی بۆ کردم، بەوەی کە پێغەمبەر (ﷺ) نەهی کردووە لەسەوداگەری .

جا (سعيد بن المسيب) لە گەورەی تابیعییە، ئەم فەرموودەیەی لە پێغەمبەرەوە (ﷺ) ڕیوایەت کردووە، بەبێ ئەوەی کە بەرکار (واسطە)ەکەی نێوان خۆیو پێغەمبەر (ﷺ) باس بکات، جا لە کۆتایی سەنەدی ئەم فەرموودەیەوە ئەو کەسەی دوای تابیعییەکە پچڕاوە، جا کەمترینی ئەو بەرکەوتنەو پچڕانەکەشی ئەوەیە کەدەبێت صەحابی بێت، وە بۆیشی هەیە، کە کەسێکی تریش بۆ نمونە تابیعییەکیشی لەگەڵدا پچڕابێت.

---

(١٥٣) مسلم، كتاب البيوع.

## ٤.فەرموودەی مورسەل لەلای شەرع زانان و زانایانی ئوصول:

ئەوەی باسم کرد لە چۆنیەتیو شێوازی مورسەل ئەوە لەلای فەرموده ناسان (محدثین) بوو، بەڵام مورسەل لەلای (شەرعزانان) (فقهاء) و زانایانی ئوصولـی فیقهـ (ألأصولیین) لەمە گشتی ترە، جا لەلای ئەمان وایە کە هەموو (منقطع)ێکیش هەر مورسەلە، جا ئیتر پچڕان (أنقطاع)ـەکەی لەسەر هەر شێوازو ڕوویەك بێت، ئەمە مەزهەبی (خطیب)یشە.

## ٥.حوکمەکەی:

لە بنچینەدا مورسەل بەلاواز حیسابەو ڕەتکراوەیە، چونکە مەرجێك لەمەرجەکانی قبوڵ بوونی لەدەستداوە کە ئەویش ڕشتە پەیوەستی (إتصال السند)ـە، وە هەروەها چونکە حاڵەتی ئەو ڕاوییەش نەزانراوە کە لادراوە.

چونکە ئەگونجێ کە ئەوڕاوییەی کە ناونەبراوە، صەحابی نەبێت، جا لەم حاڵەتەشدا بۆی هەیە کە لاواز بێت، بەڵام زانایانی فەرمووده ناس و غەیری ئەوانیش ڕای جیاییان هەیە، لە حوکمی فەرموودەی مورسەل و بەبەڵگە کردن (ألأحتجاج) پێکردنیدا، چونکە ئەم جۆرە پچڕانە (إنقطاع)ـە، جیایە لە جۆرەکانی تری پچڕان، لە سەنەددا، چونکە بەزۆری ئەو پچڕاوە، صەحابییە، وە صەحابیش هەموویان ڕاستاڵ (عادل)ن، نەناسینیان زیان ناگەیەنێت، گوتەو فەرمایشتی زانایان لەسەر مورسەل سێ قسەیە:

**أ.لاوازەو ڕەدکراوەیە:**لەلای جەماوەری فەرموده ناسانو زۆرینەی زانایانی ئوصولو شەرعزانان، بەڵگەی ئەمانەش ئەوەیە کە حاڵەتی ئەو ڕاوییە باس نەکراوە، (محذوف)ە نازانرێت، چونکە بۆی هەیە، کە صەحابی نەبێت.

**ب.صەحیحەو دەشکرێتە بەڵگە:**لەلای سێ پێشەواکە: (أبو حنيفه — ماليك — ئەحمەد)، بۆ ئیمام ئەحمەد لە ڕای مەشهوریدا وایە، و هەندێکی ترلە زانایان، ئەمە بەمەرجێك ئەو مورسەلە متمانە دار (ثقه) بێت،و(أرسال)کردنەکەیش هەر لە متمانەپێکراوێکەوە بێت، بەڵگەشیان ئەوەیە کە تابیعی متمانەدار قەت ئەوە ڕونادات،کە بڵێت: (پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی) ئیلـلا کاتێ نەبێت کەلە متمانەپێکراوێکی بیستبێت.

**ج.وەر گرتنەکەی بەچەند مەرجێکە، واتە:**صەحیحە بە چەند مەرجێك، ئەمەش لەلای (ئیمام شافیعی)و هەندێ لە ئەهلی عیلم.

ئەو مەرجانەش چوارن، سیانیان دەبێت، لەڕاوی فەرمودە مورسەلەکەدا هەبن، و دانەیەکیشیان دەبێت، لەفەرمودە مورسەلەکەدا هەبێت، ئەمەش مەرجەکانن.

١.دەبێت کابرا لەگەورە تابیعی یەکان بێت.

٢.ئەو کەسانەی کە ئەم لێی وەرگرتووەو لێیانی دەگێڕێتەوە دەبێت متمانە پێکراو بێت.

٣.دەبێت کەسانێکی (حافظ)ی متمانەپێکراو لەو ڕیوایەتەدا هاوبەش بوونو گێڕاویانەوە، پێچەوانەیان نەبێتەوە.

٤.دەبێت لەپاڵ ئەو سێ مەرجەدا، یەکێك لەمانەشی تیادابێت:

أ.دەبێت ئەو فەرمودەیەی لەڕێیەکی ترەوە، بە سەنەدەوە گێڕابێتەوە.

ب.یان لەڕوویەکی ترەوە بە مورسەلیی گەڕێندرابێتەوە، کەسێکیش ئەو ئیرسالەی کردبێت، کە زانستی لە غەیری کەسەکانی مورسەلی یەکەمەوە وەرگرتبێت.

ج.یان فەرمایشتی صەحابیەك هاوڕێك یان پاڵپشتی بێت.

د.یان بەشی زۆری زانایان لەو بارەیەوە فەتوایان دابێت[١٥٤].

جائەگەرئەم مەرجانەهاتنەدی وصەحیحێتی مەخرەجی مورسەلەکە، دەرکەوت، کە هەردووکیان صەحیحن،ئەگەرصەحیحێك لە تەنهایەك ڕێگاوە پێچەوانەی بویەوە، ئەوا ئەمان بەسەریدا (ترجیح) دەدەین بەگوێرەی چەندێتی (تعدّد)ی ڕێگاکان، ئەمە ئەگەر نەمانتوانی بەیەکەوە کۆیان کەینەوە.

**٦.مورسەلی صەحابی:**

ئەوەیە کە صەحابیەك هەواڵ بدات لەسەر فەرمودەیەك یان کردارێکی پێغەمبەر (ﷺ) و نەیبیستبیێو نەی دیبیێ، جا لەبەر کەم تەمەنی بێت، یاخود لەبەر ئەوە بێت، کە درەنگ موسڵمان بووە، یا خود لەوێ نەبوبێت، جا فەرمودەی لەم جۆرە زۆرن، کەهی صەحابییە بچووکەکانن، وەك (إبن عباس، إبن الزبیر)و هتد.

**٧.حوکمی مورسەلی صەحابی:**

ئەو گوتە ساغ و ناسراوەی کە جەماوەری زانایان بڕاندویانەتەوە، ئەوەیە کە مورسەلی صەحابی صەحیحەو بەبەڵگەیش دادەنرێت، چونکە ڕیوایەتی صەحابی لە تابعییەوە دەگمەنە، وە ئەگەر ڕیوایەتیان کردبێت لێیانەوە، ئەوا ڕوونیان کردۆتەوە، جا ئەگەر ڕوونیان نەکردبێتەوە، وە بڵێن: پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی....ئەوا ئەصڵ لێرەدا ئەوەیە کە ئەوەیان لە صەحابییەکی ترەوە بیستووە، وە بە حەزف کردنی صەحابیش زیانی نییە، وەك ڕابوورد، وەگوتراویشە کە مورسەلی صەحابی حوکمەکەی وەك مورسەلی تروایە، وە ئەم گوتەیە لاوازەو مەردوودە.

---

[١٥٤] الرسالة للشافعي، ص ٤٦١.

## ٨.بەناوبانگترین کتێب لەم بارەیەوە:

أ.(المراسيل)، دانراوی (أبو داود).

ب.(المراسيل)، دانراوی (إبن أبي حاتم).

ج.(جامع التحصيل لأحكام المراسيل)ی دانراوی (الإمام العلائي)[١٥٥].

## المُعْضَل

### ١– تعريفه:

أ) لغة: اسم مفعول من " أعضله " بمعني أعياه.

ب) اصطلاحاً: ما سقط من إسناده اثنان فأكثر على التوالي.

### ٢– مثاله:

" ما رواه الحاكم في " معرفة علوم الحديث " بسنده إلى القَعْنَبي عن مالك أنه بلغه أن أبا هريرة قال : قال رسول الله صلى الله عليه وسلم : للمَمْلوك طعامُهُ وكسوتُهُ بالمعروف . ولا يُكَلَّف من العمل إلا ما يُطيق. قال الحاكم:هذا مُعْضَل عن مالك ، أعضله هكذا في الموطأ " [١٥٦]

---

(١٥٥) (الرسالة المستطرفة) ص٨٥ – ٨٦، (علائي: (حافظ) و (محقق)، (صلاح الدين) (أبو سعيد خليل بن كيكلدي العلائي)يە، لە دیمەشق لەساڵی (٦٩٤هـ) لەدایکبووە، و لەساڵی (٧٦١هـ) لە (قودس) کۆچی دوایی کردووە.

١٥٦ معرفة علوم الحديث ص ٤٦.

فهذا الحديث معضل لأنه سقط منه اثنان متواليان بين مالك وأبي هريرة وقد عرفنا أنه سقط منه اثنان متواليان من رواية الحديث خارج الموطأ هكذا"... عن مالك عن محمد بن عَجْلان عن أبيه عن أبي هريرة"[١٥٧].

### ٣- حكمه:

المعضل حديث ضعيف ، وهو أسوأ حالا من المرسل والمنقطع[١٥٨]، لكثرة المحذوفين من الإسناد ، وهذا الحكم على المعضل بالاتفاق بين العلماء .

### ٤- اجتماعه مع بعض صور المعلقّ :

أن بين المعضل وبين المعلق عموماً وخصوصاً من وجه .

أ)فيجتمع المعضل مع المعلق في صورة واحدة وهي : إذا حُذف من مبدأ إسناده راويان متواليان . فهو معضل ومعلق في آن واحد .

ب) ويفارقه في صورتين :

١- إذا حُذف من وسط الإسناد راويان متواليان ، فهو معضل وليس بمعلق.

٢- إذا حذف من مبدأ الإسناد راو فقط ، فهو معلق وليس بمعضل .

### ٥- من مظان المعضل :

قال السيوطي [١٥٩] : من مظان المعضل والمنقطع والمرسل :

أ) كتاب السنن لسعيد بن منصور .

ب) مؤلفات ابن أبي الدنيا .

---

[١٥٧] المصدر السابق ص ٤٧

[١٥٨] انظر الكفاية ص ٢١ والتدريب جـ١ — ص ٢٩٥.

[١٥٩] تدريب الراوي جـ١ ـ ص ٢١٤ .

## فەرموودەی ئاڵۆزاو (المُعْضَلْ)

**١.پێناسەکەی:**

**أ.لەڕووی زمانەوە:**(مُعْضَل) ئیسمی مەفعولە، لە (أعضله) وەرگیراوە، کە بەمانای (أعياه – ماندوی کرد) دێت.

**ب.لەڕووی زاراوەوە:**ئەوەیە کە لــە ســەنەدەکەی دا دوکــەس یــان زیــاتر بەیەك لە دوای یەك بچڕا بێت.

**٢.نمونەکەی:**

وەك ئەوەی کە (حاکم) لە کتێبی (معرفة علوم الحديث)دا ڕیوایەتی کردووە، بەسەنەدی خۆیەوە تا سەر (القَعْنَبــي) ئەویش لە (مالـك)ەوە، کە وا لە (ابو هريرة)ەوە پێی گەیشتووە، دەڵێت: پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: (للمملوك طعامه و کسوته بالمعروف، و لايكلف من العمل إلاّ ما يطيق) واتە: (بەندە دەبێت خواردن و جلو بەرگی چاکی بۆ بکرِدرێ، وە لە توانای خۆی زیاتر ئەرکی نەخرێتە سەر)،(حاکم) دەفەرموێت: ئەمە لە (مالـك)دا گرێ کوێرەی تێکەوتووە، وە هەر بەم جۆرەش لە (الموطأ)دا ئاڵۆز اندویەتی[١٦٠].

ئەم فەرمودەیە (معضل)ە، چونکە دووکەسی یەك لە دوای یەکی تیادا پچڕاوە، لەنێوان (مالـك)و (أبو هريرة)دا، وە زانیشمان کەوا دووکەسی یەك لەدوای یەك لەو ڕیوایەتەشدا کە لە غەیری (موطأ)دا هاتووە، هەر پچڕاون، بەم جۆرە(.....لە (مالـك)ەوە، ئەویش لە (محمد)ی کوڕی (عجلان)ەوە، ئەویش لە باوکیەوە، ئەویش لە (أبوهريرة)ەوە.....)[١٦١].

---

(١٦٠) معرفة علوم الحديث ص٤٦.

(١٦١) معرفة علوم الحديث ص٤٧.

**٣.حوکمەکەی:**

فەرمودەی (معضل) لاوازە، وە حاڵی لە فەرمودەی (مرسل) و (منقطع) خراپترە[١٦٢]، ئەمەش بەهۆی ئەو کەسە زۆرانەوە کە لە سەنەدەکەدا حەزف کراون، وە ئەم حوکمەی (معضل)ـە، کۆك بونی نێوان زانایانی لەسەرە.

**٤.کۆبونەوەی (معضل) لەگەڵ هەندێ لە شێوازەکانی فەرمودەی (معلق)دا:**

لەنێوان فەرمودەی (معضل)و (معلق)دا، گشتی بوون و تایبەت بوون لەرویەك (عموم و خصوص من وجه) هەیە:

أ.(معضل) و (معلق) کۆدەبنەوە، لەیەك شێوازدا کە ئەویش ئەوەیە، کە ئەگەر لەسەرەتای سەنەدەکەوە دوو ڕاوی یەك لەدوای یەك بچڕان، ئەوە (معضل)یشەو (معلق)یشە لەیەك کاتدا.

ب.وە جیا یە لە (معلق) لە دوو شێوازدا:

١.ئەگەر لەناوەڕاستی سەنەدەکەدا دوو ڕاوی یەك لەدوای یەك پچڕابوون، ئەوە (معضل)ەو (معلق)نییە.

٢.ئەگەرلەسەرەتای سەنەدەکەوە، تەنها یەك ڕاوی حەزف کرابوو، ئەوە (معلق)ەو (معضل) نییە.

٥.شوێن گەی فەرمودەی (معضل):

(إمام السيوطي)[١٦٣] دەفەرموێت: ئەو جێگاو شوێنانەی کە فەرمودەی (معضل)و (منقطع)و (مرسل)ی لـێیە:

---

(١٦٢) الكفاية ص٢١ و التدريب الراوي ج١/ ٢٩٥.

(١٦٣) تدريب الراوي ج١/ ٢١٤.

١ .(كتاب السنن)ى (سعيد بن منصور).

٢ .دانراوه كانى (إبن أبى دنيا).

## المُنقَطِع

**١- تعريفه:**

أ) لغة: هو اسم فاعل من " الانقطاع" ضد الاتصال.

ب) اصطلاحاً: ما لم يتصل إسنادُه، على أي وجه كان انقطاعه.

**٢- شرح التعريف :**

يعني أن كل إسناد انقطع من أي مكان كان ، سواء كان الانقطاع من أول الإسناد أو من آخره أو من وسطه ، فيدخل فيه ـ على هذا ـ المرسل والمعلق والمعضل ، لكن علماء المصطلح المتأخرين خصوا المنقطع بما لم تنطبق عليه صورة المرسل أو المعلق أو المعضل ، وكذلك كان استعمال المتقدمين في الغالب . ولذلك قال النووي: " وأكثر ما يستعمل في رواية مَنْ دون التابعي عن الصحابي، كمالك عن ابن عمر " [١٦٤]

**٣-المنقطع عند المتأخرين من أهل الحديث :**

هو ما لم يتصل إسناده مما لا يشمله اسم المرسل أو المعلق أو المعضل . فكأنَّ المنقطع اسم عام لكل انقطاع في السند ما عدا صوراً ثلاثاً من صور الانقطاع وهي :حذف أول الإسناد ، أو حذف آخره ، أو حذف اثنين

[١٦٤] التقريب مع التدريب جـ ١ ـ ص ٢٠٨ .

متوالين من أي مكان كان ، وهذا هو الذي مشي عليه الحافظ ابن حجر في النخبة وشرحها .[١٦٥]

ثم انه قد يكون الانقطاع في مكان واحد من الإسناد، وقد يكون في أكثر من مكان واحد، كأن يكون الانقطاع في مكانين أو ثلاثة مثلاً.

**٤- مثاله:**

" ما رواه عبدالرزاق عن الثوري عن أبي اسحق عن زيد بن يُثيع عن حُذيفة مرفوعاً : إنْ وليتموها أبا بكر فقوي أمين " [١٦٦]

فقد سقط من هذا الإسناد رجل من وسطه وهو " شريك " سقط من بين الثوري وأبي اسحق، إذ أن الثوري لم يسمع الحديث من أبي اسحق مباشرة وإنما سمعه من شريك، وشريك سمعه من أبي اسحق.

فهذا الانقطاع لا ينطبق عليه اسم المرسل ولا المعلق ولا المعضل فهو منقطع.

**٥- حكمه :**

المنقطع ضعيف بالاتفاق بين العلماء ، وذلك للجهل بحال الراوي المحذوف .

---

[١٦٥] أخرجه الحاكم في معرفة علوم الحديث ص ٣٦ ، وأخرجه أحمد والبزار والطبراني في الأوسط بمعناه . أنظر مجمع الزوائد جـ ٥ ـ ص ١٧٦

[١٦٦] أخرجه الحاكم في معرفة علوم الحديث ص٣٦، وأخرجه أحمد والبزار والطبراني في الأوسط بمعناه ، أنظر مجمع الزوائد جـ٥ ـ ص ١٧٦ .

## فەرمودەی پچڕاو (المُنْقَطِعْ)

### ١.پێناسەکەی:

أ.لەڕووی زمانەوانیەوە:ئیسمیی فاعیلە و لە (الإنقطاع – پچڕان)ەوە هاتووە، و دژی (الإتصال – پەیوەست بوون)ە.

ب.لەڕووی زاراوەوە:ئەوەیە کە سەنەدەکەی پەیوەست نەبێت، ئیتر پچڕانەکەی بەهەر جۆرێك بێت.

### ٢.شەرحی پێناسەکە:

واتە: هەموو سەنەدێك، کە پچڕانی تیادا بێت، ئیتر لە هەر جێگایەکدا بێت چونیەکە، ئەو پچڕانە لە سەرەتای سەنەدەکەوە بێت، یان لە کۆتایی یەوە یاخود لە ناوەڕاستەوە، لەڕوانگەی ئەمەوە فەرمودەی (مرسل)و (معلق) و (معضل)یش دەگرێتە خۆ، بەڵام زانایانی زاراوە ناسی ئەم دواییە (متأخرین)، فەرموودەی (منقطع)یان تایبەت کردووە بەوەی کە شێوازو صورەتی (مرسل)و (معلق)و (معضل)ی، بەسەردا تەتبیق نەبێت، بەکارهێنانی زانایانی پێشووش لەم مەسەلەیەدا بەزۆری بەم جۆرە بووە، هەر لە بەر ئەمەش (إمام نواوی) دەفەرموێت:(و أكثر ما يستعمل في رواية مَن دونَ التابعي من الصحابي كمالك عن ابن عمر)[١٦٧].

### ٣.فەرمودەی (منقطع) لەلای زانایانی ئەم دوايیە (متأخرین)ی فەرمودە:

ئەوەیە کە سەنەدەکەی پەیوەست نەبێت، ئەوەی کە ناوی (مرسل) و (معلق) و (معضل)یش، نەیگرێتەوە، وەك ئەوەی کە (منقطع) ناوێکی گشتی

---

(١٦٧) التقريب مع التدريب ج١/٢٠٨.

بێت، بۆ هەموو پچڕانێك لە سەنەدەکەدا جگە لەو سێ جۆرە پچڕانەی (الإنقطاع)، کە بریتین لە: حەزفی سەرەتای سەنەدەکە، یان حەزفکردنی کۆتاییەکەی، یاخود حەزف کردنی دووکەسی یەك لەدوای یەك ئیتر لەهەر جێگایەکدا بێت، ئەمەش ئەوەیە کە (حافظ إبن حجر) لە کتێبی (شرح نخبة الفکر)دا لەسەری ڕۆیشتووە[١٦٨].

پاشان دەبێت پچڕان لە تەنها یەك جێگادا بێت لە سەنەدەکەدا، وە دەشبێت کە لە چەند جێگایەکدا بێت، وەك ئەوەی کە پچڕانەکە بۆ نموونە لەدوو جێگا یان سێ جێگادا بێت.

٤.نموونەکەی:

وەك ئەوەی کە (عبدالرزاق) لە (ثوري)و ئەویش لە (أبو إسحاق) و ئەویش لە (زيد)و ئەویش لە (يُثيْع)و ئەویش لە (حُذيفة)ەوە، بەمەرفوعی ڕیوایەتی کردووە کە:

(أن وليّتموها أبابكر فقويٌ أمين)[١٦٩]، واتە: ئەگەر ئەبو بەکر جڵەوی کارو باریانی گرتە دەست...ئەوە ئەو کەسێکی بەهێزو بە متمانەیە.

جالەم سەنەدەدا کەسێك لەناوەڕاستەکەیدا پچڕاوە کە (شريك)ە، لە نێوان (ثوری) و (أبو إسحاق)دا پچڕاوە، چونکە (ثوري) فەرمودەکەی ڕاستەوخۆ لە (أبو إسحاق) نەژنەوتووە، بەڵکو لە (شريك)ی بیستووە، وە (شريك)یش لە (أبو إسحاق)ی بیستووە، ئەم پچڕانە ناوو، مۆرکی (مرسل)و (معلق)و (معضل)ی بەسەردا نابرِدرێ، بۆیە بە(منقطع) ناوزەد دەکرێ.

---

(١٦٨) النخبة و شرحها له ص٤٤.

(١٦٩) أخرجه الحاكم في معرفة علوم الحديث ص٣٦ و أخرجه أحمد و البزار و الطبراني في الأوسط بمعناه، أنظر مجمع الزوائد ج٥/ص١٧٦.

**٥.حوكمەكەی:**

فەرمودەی (منقطع) بەلاواز (ضعيف) دادەنرێت، بە رێکەوتن و کۆکبوونی نێوان زانایان، ئەمەش لەبەر بێ ئاگایی بوون بەحاڵـی ڕاوییە باس نەکراوە کە.

## المُدَلَّس

**١- تعريف التدليس:**

أ) لغة : المدلس اسم مفعول من " التدليس " والتدليس في اللغة : كِتْمان عَيْبِ السلعة عن المشتري ، وأصل التدليس مشتق من " الدَّلس " وهو الظلمة أو اختلاط الظلام كما في القاموس [١٧٠] ، فكأن المدلِّس لتغطيته على الواقف على الحديث أظلم أمره فصار الحديث مُدلَّسا .

ب) اصطلاحاً: إخفاء عيب في الإسناد. وتحسين لظاهره.

**٢- أقسام التدليس:**

للتدليس قسمان رئيسيان هما: تدليس الإسناد، وتدليس الشيوخ.

**٣- تدليس الإسناد:**

لقد عرف علماء الحديث هذا النوع من التدليس بتعريفات مختلفة ، وسأختار أصحها وأدقها ـ في نظري ـ وهو تعريف الإمامين أبي أحمد بن عمرو البزار وأبي الحسن بن القطان . وهذا التعريف هو :

---

[١٧٠] القاموس جـ٢ ـ ص ٢٢٤ .

أ) تعريفه: أن يَرْوِيَ الراوي عمن قد سمع منه ما لم يسمع منه من غير أن يذكر سمعه منه [١٧١]

ب) شرح التعريف : ومعنى هذا التعريف أن تدليس الإسناد أن يروي الراوي عن شيخ قد سَمِعَ منه بعض الأحاديث، لكن هذا الحديث الذي دلسه لم يسمعه منه ، وإنما سمعه من شيخ آخر عنه ، فيُسْقِطُ ذلك الشيخَ ويرويه عنه بلفظ محتمل للسماع وغيره ، كـ " قال " أو " عن " ليوهم غيره أنه سمعه منه ، لكن لا يصرح بأنه سمع منه هذا الحديث فلا يقول : " سمعت " أو " حدثني " حتى لا يصير كذاباً بذلك ، ثم قد يكون الذي أسقطه واحداً أو أكثر .

ت) الفرق بيه وبين الإرسال الخفي : قال أبو الحسن بن القطان بعد ذِكْرِهِ للتعريف السابق:" والفرق بينه وبين الإرسال هو : أن الإرسال روايته عمن لم يسمع منه " وإيضاح ذلك أن كلا من المدلّس والمرسل إرسالا خفياً يَرْوِي عن شيخ شيئاً لم يسمعه منه ، بلفظ يحتمل السماع وغيره ، لكن المدلِّس قد سمع من ذلك الشيخ أحاديث غير التي دلسها ، على حين أن المرسل إرسالا خفياً لم يسمع من ذلك الشيخ أبداً ، لا الأحاديث التي أرسلوها ولا غيرها لكنه عاصره أو لقيه .

ث) مثاله : ما أخرجه الحاكم[١٧٢] ، بسنده إلى على بن خَشْرَم قال : " قال لنا ابن عيينة : عن الزهري ـ فقبل له: سمعته من الزهري ؟ فقال : لا ، ولا ممن سمعه من الزهري ، حدثني عن عبدالرزاق عن مَعْمَر عن الزهري " ففي هذا المثال أسقط ابنُ عُيينة اثنين بينه وبن الزهري .

---

[١٧١] شرح ألفية العراقي له جـ١ ـ ص ١٨٠.

[١٧٢] في معرفة علوم الحديث ص ١٣٠ .

**٤- تدليس التسوية:**

هذا النوع من التدليس هو في الحقيقة نوع من أنواع تدليس الإسناد .

أ) تعريفه: هو رواية الراوي عن شيخه ، ثم إسقاط راو ضعيف بين ثقتين لقي أحدهما الآخر ،وصورة ذلك أن يروي الراوي حديثاً عن شيخ ثقة، وذلك الثقة يرويه عن ضعيف عن ثقة، ويكون الثقتان قد لقي أحدهما الآخر، فيأتي المدلس الذي سمع الحديث من الثقة الأول ، فيُسْقِط الضعيف الذي في السند ، ويجعل الإسناد عن شيخه الثقة عن الثقة الثاني بلفظ محتمل، فيُسَوّي الإسناد كله ثقات.

وهذا النوع من التدليس شر أنواع التدليس، لأن الثقة الأول قد لا يكون معروفاً بالتدليس، ويجده الواقف على السند كذلك بعد التسوية قد رواه عن ثقة آخر فيحكم له بالصحة، وفيه غرور شديد.

ب) أشهر من كان يفعله :

١- بَقّية بن الوليد . قال أبو مُسْهر : " أحاديث بَقِيَّة ليست نَقيَّه فكنْ منها على تُقِيَّة . [١٧٣]

٢- الوليد بن مسلم .

٣- مثاله : ما رواه ابن أبي حاتم في العلل قال : " سمعت أبي - وذَكَرَ الحديث الذي رواه اسحق بن راهويه عن بقية حدثني أبو وهب الأسدي عن نافع عن ابن عمر حديث لا تحمدوا إسلام المرء حتى تعرفوا عُقْدَةَ رأيه - قال أبي: هذا الحديث له أمر قل من يفهمه ، روى هذا الحديث عبيد الله بن عمرو

[١٧٣] ميزان الاعتدال جـ١ ـ ص ٣٣٢.

( ثقة ) عن اسحاق بن أبي فروة ( ضعيف ) عن نافع ( ثقة ) عن ابن عمر عن النبي صلي الله عليه وسلم . وعبيد الله ابن عمرو ، كنيته أبو وهب ، وهو أسدى ، فكناه بقيةُ ونسبه إلى بن أسد كي لا يفطن له ، حتى إذا ترك اسحق بن أبي فِروة لا يُهْتَدَى له " .[١٧٤]

**٥- تدليس الشيوخ:**

أ) تعريفه: هو أن يَرْوِي الراوي عن شيخ حديثاً سمعه منه، فيُسَمِّيهُ أو يَكْنَيهُ أو يَنْسِبَهُ أو يَصِفهُ بما لا يُعْرَفُ به كي لا يُعْرَفُ [١٧٥]

ب) مثاله : قول أبي بكر بن مجاهد أحد أئمة القراء : " حدثنا عبدالله بن أبي عبدالله ، يريد به أبا بكر بن أبي داود السجستاني "

**٦- حكم التدليس :**

أ) أما تدليس الإسناد: فمكروه جداً. ذمة أكثر العلماء وكان شعبة من أشدهم ذماً له فقال فيه أقوالا منها: "التدليس أخو الكذب ".

ب) وأما تدليس التسوية : فهو أشد كراهة منه ، حتى قال العراقي :" أنه قادح فيمن تَعَمَّدَ فعله "

ج) وأما تدليس الشيوخ : فكراهته أخف من تدليس الإسناد لأن المدلس لم يُسقط أحداً ، وإنما الكراهة بسبب تضييع المروي عنه ، وتوعير طريق معرفته على السامع وتختلف الحال في كراهته بحسب الغرض الحامل عليه .

---

[١٧٤] شرح الألفية للعراقي جـ١ ـ ص ١٩٠ والتدريب جـ١ ـ ص ٢٢٥ .

[١٧٥] علوم الحديث ص ٦٦.

### ٧- الأغراض الحاملة على التدليس :

أ) الأغراض الحاملة على تدليس الشيوخ أربعة هي:

١- ضعف الشيخ أو كونه غير ثقة .

٢- تأخر وفاته بحيث شاركه في السماع منه جماعة دونه.

٣- صغر سنه بحيث يكون أصغر من الراوي عنه .

٤- كثرة الرواية عنه، فلا يحب الإكثار من ذكر اسمه على صورة واحدة.

ب) الأغراض الحاملة على تدليس الإسناد خمسة وهي:

١- توهيم عُلُوِّ الإسناد .

٢- فَوَات شيء من الحديث عن شيخ سمع منه الكثير .

٣- ٤- ٥ - الأغراض الثلاثة الأولي المذكورة في تدليس الشيوخ.

### ٨- أسباب ذم المدلس: ثلاثة هي

أ) إيهامه السماع ممن لم يسمع عنه .

ب) عدوله عن الكشف إلى الاحتمال .

ج) علمه بأنه لو ذكر الذي دلس عنه لم يكن مَرْضِيًا [١٧٦]

### ٩- حكم رواية المدلّس :

اختلف العلماء في قبول رواية المدلّس على أقوال، أشهرها قولان.

أ) رد رواية المدلس مطلقا وإن بين السماع، لأن التدليس نفسه جرح. ( وهذا غير معتمد ).

ب) التفصيل: ( وهو الصحيح ).

---

[١٧٦] راجع الكفاية ص ٣٥٨.

١- إن صرح بالسماع قبلت روايته ، أي إن قال " سمعت" أو نحوها قبل حديثه .

٢- وان لم يصرح بالسماع لم تقبل روايته، أي إن قال " عن " ونحوها لم يقبل حديثه[١٧٧] .

**١٠- بم يعرف التدليس ؟**

يعرف التدليس بأحد أمرين :

أ) إخبار المدلس نفسه إذا سئل مثلا ، كما جرى لابن عيينة .

ب) نَصُّ إمام من أئمة هذا الشأن بناء على معرفته ذلك من البحث والتتبع.

**١١ - أشهر المصنفات في التدليس والمدلسين :**

هناك مصنفات في التدليس والمدلسين كثيرة أشهرها :

أ) ثلاثة مصنفات للخطيب البغدادي ، واحدا في أسماء المدلسين ، واسمه التبيين لأسماء المدلسين[١٧٨]، والآخران أفرد كلاً منهما لبيان نوع من أنواع التدليس[١٧٩] .

ب) التبيين لأسماء المدلسين : لبرهان الدين بن الحلبي (وقد طبعت هذه الرسالة ).

ت) تعريف أهل التقديس بمراتب الموصوفين بالتدليس للحافظ ابن حجر ( وقد طبعت أيضا).

---

[١٧٧] علوم الحديث ص ٦٧ – ٦٨

[١٧٨] الكفاية ص ٣٦١

[١٧٩] الكفاية ص ٣٥٧

## فەرموودەی فێڵ تیاکراو (مُدَلَّسْ)

### ١.پێناسەی (التدلیس):

**أ.لەڕوی زمانەوانیەوە:**(المدلَّس)ئیسمی مەفعولەولە(التدلیس)ەوە هاتووە، و (تدلیس)یش لە زماندا، بریتیە لە شاردنەوەی کەمو کورتی کالاّ لە کابرای کڕیار، وە بنەمای (تدلیس)یش لە (الدَّلس)ـەوە وەرگیراوە، کە مانای تاریکی و یاخود تێکەڵ بوونی تاریکی هەیە، هەروەك لە فەرهەنگی (القاموس) دا، وایە[١٨٠]، جا (مدلَّس)، بۆیە (فێڵ تیاکراو – مدلَّس)ـە، چونکە مەسەلەکە لەسەر ئەو کەسەی کە تێڕامان لەسەر فەرموودەکە دەکات نادیارەو پەردە پۆشی، فەرمانەکە تاریکەو ناڕوونە، جا بۆیە فەرمودەکە فێڵ تیاکراو (مدلَّس)ـە.

**ب.لەڕوی زاراوەوە:**بریتیە لە شاردنەوەی کەمو کورتی (عَیبْ)ێك لە سەنەدەکەدا، و جوانکاری کردن لەڕووکەش (ظاهر)ـەکەیدا.

### ٢.بەشەکانی (تدلیس):

(تدلیس) دووبەشی سەرەکی هەیە، کە ئەمانەن، فێڵ کردن لەسەنەددا (تدلیس ألإسناد)و فێڵ کردن لەدەربڕینی ناوی مامۆستادا (تدلیس الشیوخ).

### ٣.فێڵ کردن لە ڕشتەکەدا (تدلیس الأسناد):

زانایانی فەرمودە ئەم جۆرەی (تدلیس)ـە،یان بە چەندەها جۆری جیاواز پێناسە کردووە، جا من بەگوێرەی تێڕوانینی خۆم، ساغترین و ووردترینی ئەو پێناسانەتان بۆ هەڵدەبژێرم، کە ئەویش پێناسەی پێشەوایان (أبو أحمد بن عمرو البزار) و (أبو الحسن بن القطان)ـە، وە ئەو پێناسەیەش ئەمەیە:

---

(١٨٠) القاموس ج٢/ ص٢٢٤.

أ.پێناسەکەی:ئەوەیەکەڕاوییەکە شتێ ڕیوایەت بکات، لە کەسێکەوە،کە پێشتر شتی لێ بیستبێت، بەڵام ئەوەی شتێکیش کە لێی نەبیستبێ هەر بیداتە پاڵیو لێوەی ڕیوایەتی بکات.[١٨١]

ب.شەرحی پێناسەکە:

مانای ئەم پێناسەیە ئەوەیە: تەدلیسی سەنەد ئەوەیە کە ڕاوی شتێك ڕیوایەت بکات، لە مامۆستاکەیەوە، کە هەندێ فەرمودەی لێ بیستووە، بەڵام ئەو فەرموودەیەی کە فێڵی تیاکردووە، لێوەی نەبیستووە، بەڵکو لەمامۆستا (شێخ)ێکی ترەوە، بەڵام ناوی ئەو مامۆستایە ئەپچڕێنێ، ڕیوایەتی دەکات لێوەی بە لەفزێك کە ئەوەی لێوەردەگیرێو (إحتمال)دەکرێ، کە لێی بیستبێ، وەك (قال — وتی) یان (عن — لەوەوە) تا وابگەیەنێت بەکەسانی تر کەوا لێوەی بیستووە، بەڵام تەصریحی تەواو نادات بەوەی کە لێی بیستووە، جا ناڵێت: (سمعت — بیستم) یان (حدّثني — قسەی بۆ کردم)، تا بەم هۆیەوە نەبێتە درۆزن، پاشان هەندێ جار دەبێت، کە ئەو کەسەی کە پچڕاندویەتی یەکێك بێت، یان زیاتر لە یەکێك.

ج.جیاوازی نێوان (مدلّس) و (مرسل الخفي):

پێشەوا (أبو الحسن بن القطان) پاش هێنانی ئەو پێناسەیەی پێشوو، دەڵێت: (جیاوازای نێوان (مدلّس) و (مرسل) ئەوەیە کە (مرسل) ئەوەیە کە ڕیوایەتەکەی لە کەسێکەوە بێت، کە لێی نەبیستبێ، و لایەنی ڕونی ئەم باسە ئەوەیە کە هەموو دانیەك لە (مدّلس)و (مرسلي خفيّ) بریتین لە وەی کەشتێك لە مامۆستایەکەوە ڕیوایەت بکرێت کە ئەوەی لێ نەبیسترابێ،

---

(١٨١) شرح ألفية العراقي ج١/ص١٨٠.

ئممەش بەلـەفزێك كە ئیحتیمالـی بیستن و شتی تریشی لـێ بكرێت، بەڵام (فێڵكەر – مدلِّسْ) ئەوەیە كە فەرمودە گەلێكی غەیری ئەو فەرمودەیەی كە تەدلیسی كردووە، لـێی بیستووە، لە كاتێكدا كە لە (مرسلي خفي)دا ئەو كەسە لەو ماموٚستایەوە بەهیچ جوٚرێ‌و هەرگیز هیچی لـێ نەبیستووە، نەك تەنها ئەو فەرموودانەی لـێ نەبیستبـێ كە (أرسال)ی كردونەتە سەریان، بەڵام ئەوە هەیە هاوچەرخی بووە، یاخود پێی گەیشتووە.

**د.نموونەكەی:**

وەك ئەوەی كە (الحاكم)بەسەنەدی خوٚیەوە هێناویەتی، هەتا (علي بن خَشْرَم) دەڵێت[182]، (إبن عیینة) پێی گوتین، ئەویش لە (زهری)یەوە، جا پێی گوترا، توٚ لە زوهرییەوە بیستووتە، وتی: نەخێر، نە لە وەوە نە لـەوەیشەوە كە لە (زهری) بیستووە.

(عبدالرزاق) قسەی بوٚ كردم لە (مَعْمَر)ەوە، ئەویش لە (الزهری)یەوە! جا لـەم نمونەیەدا (إبن عیینة) دووكەسی لە نێوان خوٚی‌و (زهری)دا پچڕاندووە.

**٤.(تدلیس التسویة):**

لە ڕاستیدا ئەم جوٚرەی (تدلیس)، جوٚرێكە لە جوٚرەكانی تەدلیسی سەنەد:

**أ.پێناسەكەی:** بریتیە لە وەی كە ڕاوی شتێ لە ماموٚستاكەیەوە ڕیوایەت بكات، پاشان ڕاویەكی لاواز كەلـە نێوان دووكەسی متمانە پێكراو (ثقة) دایە، وە بەیەكتریش گەیشتوون، ببچرێنـێ، وە شێوازی ئەمەش بەو جوٚرەیە كە ڕاویەكە فەرمودەیەك لە ماموٚستایەكی متمانە پێكراوەوە ڕیوایەت بكات، وە ئەو متمانە پێكراوەش لە لاوازێكەوەو ئەویش لە متمانە پێكراوێكەوە ڕیوایەت

(١٨٢) معرفة علوم الحدیث ص١٣٠.

بکات، وە ئەو دووکەسە متمانە پێکراوەش بە یەکتر گەیشتبن، جا ئەو مرۆڤە (مُدَلِّس)ەی کە فەرمودەکەی لە کەسی متمانە پێکراوی یەکەم بیستووە، دێت، ئەو لاوازەی کەلە سەنەدەکەدا هەیە لادەبات، وە سەنەدەکە وا پێدەکات، کە لە مامۆستامتمانە پێکراوەکەیەوە دەیخاتە سەر کابرای متمانە پێکراوی دووەم بە لەفزێکی واش –دەری دەبڕێ– کە ئیحتیمالـی بکات، جا سەنەدەکە هاو ڕێكو یەکسان (تسوية) دەبێتەوەو وە هەموویان متمانە پێکراو (ثقة) دەردەچن.

وە ئەو جۆرە (تدلیس)ـە، خراپترین جۆرەکانیەتی، چونکە متمانە پێکراوی یەکەم جاری واهەیە، کە بە (تدلیس) کردن ناسراو نییە، وە ئەو کەسەی کە خەریکی تێڕامانە لەسەر سەنەدەکە هەربەو جۆرە دەیبینـێ، لەدوای ڕودانی (تسوية – هاورێك) بونەوەکە، کەوا لەکەسێکی متمانە پێکراو، وەری گرتووە، جا حوکمی صەحیح بوونی بەسەردا دەدات، ئەمەش غوروورێکی زۆری تیادایە.

**ب.بەناوبانگترین ئەوانەی ئەم کارەدەکەن:**

١.(بَقّية بن الوليد)، کە (أبو مسهر) دەڵێت:(أحاديث بَقِيَّة ليست نَقِيَّة، فكنْ منها على تَقِيَّة)[١٨٣]. واتە:(فەرمودەکانی (بقية)، پاك نین و لێیان بەترس بە)!

٢.(الوليد بن مسلم).

**ج.نمونەکەی:**

وەك ئەوەی کە (إبن أبي حاتم) لە (العلل)دا ڕیوایەتی دەکات، و دەڵێت: (سمعت أبي – و ذكر الحديث الذي رواه إسحاق بن راهويهِ عن بقّية حدثني

---

(١٨٣) ميزان الإعتدال، ج١/ص٣٣٢

أبو وهب الأسدي عن نافع عن إبن عمر حديث لاتحمدوا إسلام المرء حتى تعرفوا عُقْدَةَ رأيه– قال أبي (هذا الحديث له أمر قَلَّ من يفهمه، روي هذا الحديث عبيد الله بن عمرو (ثقة) عن إسحاق بن ابي فروة (ضعيف) عن نافع عن إبن عمر عن النبـي (ﷺ)و عبيد الله إبن عمرو، كنيته أبو وهب، وهو أسدي فكناه بقية ونسبه إلـى بني اسدِ كي لا يُفطن له، حتى إذا ترك إسحاق بن أبي فروة لا يُهْتَدى له)[184].

واته: (بيستم لـه باوكم، جا ئەو فەرمودەیەی باس کرد کە (إسحاق بن راهويه) لـه (بقية)ـەوە ڕیوایەتی دەکات و دەڵێت: (أبو وهب ألأسدي) قسەی بۆکردم لـه (نافع)ەوە، ئەویش لـه (إبن عمر)ەوە، کە ئەم فەرموودەیە بوو:(موسڵمان بوونی کەســێ ستایش مەکەن تا، بەتەواوی ڕاکانی نەزانن.

جا باوكم گوتی: ئەم فەرمودەیە فەرمانێکی تیادایە کە کەم کەس فامیان پـێی هەیە، ئەم فەرموودەیە (عبيد الله بن عمرو) کە کەسێکی متمانە پێکراوە، ئەویش لـه (إسحاق بن ابي فروة)ەوە، کە کەسێکی لاوازەو ئەویش لـه (نافع)ەوە کە کەسێکی متمانە پێکراوەو، و ئەویش لـه (إبن عمر)ەوە، وە ئەویش لـه پێغەمبەرەوە (ﷺ) ڕیوایەتی دەکات، جا (عبيد الله إبن عمرو) کونیەکەی (أبو وهب)ە، و (أسدی)یە، جا (بقية)هاتووە، کونیەی بۆ داناوەو نیسبەتی داوەتە لای (أسد) تاپەی پـێ نەبرێ، کاتێ کە ناوی (أسحاق بن ابي فروة)ی تەرك کرد، بەهۆی (عبيد الله)ەوە پێی نەزانرێت و نەدۆزرێتەوە.

---

([184]) شرح الفية العراقي/ج١/ ص١٩٠، و التدريب ج١/ ص٢٢٥.

**٥.فێڵ کردن له ناو هێنانی مامۆستادا (تدليس الشيوخ):**

**أ.پێناسەکەی:** بریتیه لەوەی کە گێڕەرەوە (الراوی) فەرمودەیەك لە مامۆستایەکەوە بگێڕێتەوە، کە لێیی بیستبێ جا ناوی بنێت، یاخود کونیەیەکی بۆ دابنێ یان نیسبەتی بداتە پاڵ شتێ، یاخود وەصفی بکات، بەشتێ کە پێی ناسراو نەبێت، بۆ ئەوەی کە نەناسرێت[١٨٥].

**ب.نمونەکەی:** وەك قسەکەی (أبو بكر بن مجاهد) کە یەکێکە لە پێشەوایانی قورئان خوێنان (القُرّاء) کە دەڵێت:(حدثناعبدالله بن أبي عبدالله، يريد به ابابكر بن أبي داود السجستاني) واتە: (عەبدوڵڵای کوڕی ئەبو عەبدوڵڵا قسەی بۆ کردین، کە مەبەستی پێی (ابو بکر بن أبو داود السجستانی)یە.

**٦.حوکمی تەدلیس:**

**أ.بۆ تەدلیسی سەنەد:** بێگومان زۆر خراپە (مكروه جداً) و زۆرینەی زانایان سەرزەنشتیان کردووە، وە (شعبة) لەهەموویان زیاتر زەمی کردووە، چەند قسەیەکی دەربارەی کردووە، لەوانە (التدليس أخو الكذب) تەدلیس برای درۆیە.

**ب.بەڵام بۆ (تدليس التسوّية):** ئەوە زۆر خراپترە لە تەدلیسی سەنەد، (أشد كراهة منه)، تەنانەت (العراقی) فەرموویەتی: (أنه قادح فيمن تعّمد فعله) واتە: (ئەمە برینداركەری كەسێكە كە بەتایبەتی دەیكات).

---

(١٨٥) علوم الحديث ص٦٦.

**ج.بەڵام بۆ تەدلیسی مامۆستا (شیوخ):**

ئەمەیان کەراهەتەکەی کەمترە لە هی تەدلیسی سەنەد، چونکە فێڵ کەرەکە لێرەدا کەسی نەشاردۆتەوە، بەڵکو کەراهەتەکەی بەهۆی شێواندنی کابرای لێوە گێڕدراوەیە (المروي عنه) بونی ڕێگاو سەختی ناسینەکەیەتی لەلایەن بیسەرەوە، وە کەراهەت بونەکەیش بەگوێرەی مەبەستو مەرامی ئەو کەسەی کە ئەنجامی دەدات، دەگۆڕێت.

**<u>٧.ئەو مەبەستانەی کە (تدلیس) یان بەهۆوە دەکرێت:</u>**

**أ.هۆکارەکانی تەدلیسی مامۆستا (شێخ)چوارن:**

١.لاوازی شێخە کە یاخود لەبەر ئەوەی کە متمانە پێکراو نییە.

٢.بەهۆی درەنگی مردنیەوە، بەجۆرێك کەخەڵکانێکی تر لە غەیری ئەم کابرا (مدلس)ـە، گوێیان لێی بووە.

٣.کەم تەمەنییەکەی،بەجۆرێك بچوکتر بێت لەوانەی کەریوایەتیان کردووە.

٤.بوونی ڕیوایەت کردنی زۆر لەو شێخەوە، چونکە زۆر ناوهێنانی بەیەك شێواز جوان نییە.

**ب.هۆکارەکانی کردنی تەدلیسی سەنەد پێنجن:**

١.بۆئەوەی وا لەبینەری ئەو دەقە بکات، کە گومان بەرێت سەنەدەکەی بەهێزە.

٢.لەدەست چوونی فەرموودەگەلێك لە شێخێکەوە کەشتی زۆری لێبیستووە.

٣.و ٤. و٥.لەگەڵ هۆکاری یەکەمو دووەم و سێهەمی تەدلیسی مامۆستا (شیوخ)دا.

**٨.هۆکارەکانی سەرزەنشت کردنی (مدّلس) سیانن:**

أ.چونکە وەهمی وات لادروست دەکات، بەوەی کە شتی بیستووە لە کەسێکی وا کە لێی نەبیستووە.

ب.لادانی لەشێوازی خۆی بۆ خۆپاراستن لە کەشف بوونی بۆ لای شتێك کە ئیحتیمالــی لــێ دەکرێت.

ج.عیلم بوون بەوەی کــە ئەگــەر بێــت و نــاوی ئــەو کابرایــە ببــات کــە تەدلیســـەکەی بەناویــەوە کــردووە، ئــەوا لـــە لـــێ ڕازی بــوان (مرضـــیا) نابێت[١٨٦].

**٩.حوکمی ڕیوایەتی (مُدَلِّس:فێڵکەر):**

زانایان لەسەر وەرگرتنی ڕیوایەتی کەسی فێڵباز جیاوازییان هەیە لەسەر چەند ڕایەك،، کە ناسراوترینیان دوانن:

أ.ڕەدکردنەوەی ڕیوایەتی کەسی (مُدّلس)بە ڕەهایی (مطلقاً) هەرچەند بیستنەکەشی دەرکەوێت، چونکە (تدلیس) خۆی لە خۆیدا برینداربوونی ئەو کەسەیە (جرح)ە، (ئەمەش پشت پێ بەستراو نییە).

ب.تێڕامان و درێژ کردنەوە، (التفصیل)ی دەوێ، کە ئەمەش صەحیحە:

١.ئەگەر بەڕاستەوخۆ (سماع – بیستن)ی دەربڕی، ئەوە ڕیوایەتەکەی وەردەگیرێ، واتە: ئەگەر وتی: (سمعتُ – بیستم) یان وێنەی ئەمە، ئەوە فەرمودەکەی وەردەگیرێ.

٢.بەڵام ئەگەر ڕاستەو خۆ (صریحاً)، (سماع – بیستن)ی دەرنەبڕی، ئەوە ڕیوایەتەکەی وەرناگیرێ.

---

(١٨٦) راجع الكفاية ص٣٥٨.

واته: ئەگەر وتی: (عن – لە) یان وێنەی ئەمە، ئەوە فەرمودەی وەرناگیرێ[١٨٧].

**١٠.بەچی (تدلیس) دەزانرێت:** بە دوو شت (تدلیس) دەزانرێت.

أ.هەواڵدانی خودی کابرای (مدلس) بۆ نمونە:

هەروەك لەمەسەلەکەی (إبن عیینة)دا رِأبورد.

ب.دەقی قسەی، پێشەوایەك، لە پێشەوایانی ئەم بابەتە، ئەویش لەبەر ئەو زانستەی کە لە ئەنجامی لێکۆڵینەوەو بەداوا داچونەوە دەستی کەوتووە.

**١١.بەناوبانگترینی کتێب لەسەر فێڵکردن (التدلیس) و فێڵبازان (المُدّلسین):**

لێرەدا چەند دانراوێکی زۆر لەسەر (تدلیس)و (مدّلس) هەیە، کە بەناو بانگ ترینیان ئەمانەن:

أ.سێ کتێبی (خطیب بغدادي) دانەیەکیان لەناوی (مُدّلس)ەکاندا، بە ناوی (التبیین لإسماء المدلسین)[١٨٨] ، وە دوانەکەی تر هەریەکە بەتایبەت لەسەر ڕوونکردنەوەی جۆرێك لە جۆرەکانی تەدلیسە[١٨٩].

ب.(التبیین لأسماء المدلسین)، دانراوی (برهان الدین بن الحلبی) کە چاپکراوە.

ج.(تعریف أهل التقدیس بمراتب الموضوعین بالتدلیس)، دانراوی (حافظ إبن حجر) کە ئەمەشیان چاپکراوە.

---

(١٨٧) علوم الحديث ص٦٧ – ٦٨.

(١٨٨) الكفاية، ص٣٦١.

(١٨٩) الكفاية، ص٣٧٥.

## المُرْسَلُ الخَفِيُّ

**١- تعريفه:**

أ) **لغة:** المرسل لغة اسم مفعول من الإرسال بمعنى الإطلاق، كأن المرسل أطلق الإسناد ولم يصله، والخفي: ضد الجلي، لأن هذا النوع من الإرسال غير ظاهر، فلا يدرك إلا بالبحث.

ب) **اصطلاحاً:** أن يَرْوِيَ عمن لقيه أو عاصره ما لم يسمع منه بلفظ يحتمل السماع وغيره كـ"قال"

**٢- مثاله :**

" ما رواه ابن ماجه من طريق عمر بن عبد العزيز عن عقبة ابن عامر مرفوعاً: رحم الله حارس الحرس* فان عمر لم يطلق عقبة كما قال المزي في الأطراف.

**٣- بم يعرف ؟**

يُعرف الإرسال الخفي بأحد أمور ثلاثة وهي :

أ) نَصُّ بعض الأئمة على أن هذا الراوي لم يلق من حدث عنه أو لم يسمع منه مطلقاً.

ب) إخباره عن نفسه بأنه لم يلق من حدث عنه أو لم يسمع منه شيئاً.

---

* ابن ماجه – كتاب الجهاد – جـ ٢ ص ٩٢٥ رقم الحديث / ٢٧٦٩/

ت) مجيء الحديث من وجه آخر فيه زيادة شخص بين هذا الراوي وبين من روي عنه. وهذا الأمر الثالث فيه خلاف للعلماء، لأنه قد يكون من نوع " المزيد في متصل الأسانيد".

**٤- حكمه :**

هو ضعيف ، لأنه من نوع المنقطع ، فإذا ظهر انقطاعه فحكمه حكم المنقطع.

**٥- أشهر المصنفات فيه :**

- كتاب التفصيل لمبهم المراسيل للخطيب البغدادي .

## (باسی مورسەلـی خەفی – بەرەڵڵاكراوی شاراوە)

**١. پێناسەكەی:**

**أ. لەڕووی زمانەوە:** (المرسل) ئیسمی مەفعولە،و لە (إرسال)ەوە هاتووە، كە بەمانای (إطلاق) ڕەها، بەرەڵڵاكراو، نەبەستراوە، دێت، وەك بڵێی ئەو كابرایە (مرسِل)ـەكە، سەنەدەكەی ڕەهاو بەرەڵڵاكردووەو پەیوەستی نەكردووە.

وە (خفي)یش دژی (جلي – ڕوون و ئاشكرا)یە، چونكە ئەم جۆرەی (إرسال) نادیارەو بە لێكۆڵینەوە نەبێت، نازانرێت.

**ب. لەڕووی زاراوەوە:** ئەوەیە كە شتێ ڕیوایەت بكات، لە كەسێكەوە كە پێی گەیشتووە، یاخود هاو چەرخی بووە، بەڵام هیچی لـێ نەبیستووە، بەڵام بە لەفزێ دەری ببڕێ كە ئیحتیمالـی (سماع – بیستن و شتی تری) لـێ بكرێ، وەك (قال – وتی).

**٢.نموونەکەی:**

وەك ئەمەی کە (إبن ماجة) لە ڕێگای (عمر بن عبدالعزیز)ەوە، ئەویش لە (عقبة إبن عامر)ەوە، بەمەڕفوعـی ڕیوایەتی دەکات، (رحم الله حارس الحرس)[١٩٠].

جا (عمر) بە (عقبة) نەگەیشتووە، هەروەك (المزّي)– کە مامۆستای ئیمام شافیعی بووە– لە (ألأطراف)دا باسی کردووە.

**٣.بەچیدا دەناسرێت؟**

مورسەلی خەفی بەیەکـێ لەم سێ شتەدا دەناسرێ.

أ.دەقی گوتەی هەندێ لە ئیمامەکان لەسەر ئەوە کە ئەو ڕاوییە بەو کەسە نەگەیشتووە، کە شتەکەی لـێ دەگێڕێتەوە، یاخود هەر بە موطلەقی شتی لێ نەبیستووە.

ب.هەواڵدانی خودی کەسەکە خۆی بەوەی کە بەو کەسە نەگەیشتووە، کە ئەم ڕیوایەتەی لێوە کردووە یاخود هیچی لـێ نەبیستووە.

ج.هاتنی فەرموودەکە لەلایەکی ترەوە کەوا کەسێکی زیادەی لەنێوان ڕیوایەت کەرەکەو ڕیوایەت لێکراوەکەدا هەبێت، وە ئەم سێیەمە ڕاجیایی نێوان زانایانی تیادایە، چونکە جارە جارە جۆرێکە لە فەرمودەی (المزید في متصل الأسانید)، کە باسەکەی دێت.

---

([١٩٠]) إبن ماجه، کتاب الجهاد، ج٢/ ص٩٢٥، رقم الحدیث /٢٧٦٩.

**٤.حوكمەكەی:**

لاوازە، چونكە جۆرێكە لە (منقطع)، كە پچڕان (أنقطاع)ەكەی دەركەوت، ئیتر حوكمەكەی حوكمی (منقطع)ی هەیە.

**٥.بەناوبانگ ترینی كتێب تیایدا.**

كتێبی (التفصيل لمبهم المراسيل)، دانراوی (الخطيب البغدادي)یە.

## المعَنْعنُ والمؤَنَنُ

**١- تمهيد:**

لقد انتهت أنواع المردود الستة التي سبب ردها سَقْطَ من الإسناد ، لكن لما كان المعنعن والمؤنن مُختَلفاً فيهما ، هل هما من نوع المنقطع أو المتصل ، لذا رأيت إلحاقهما بأنواع المردود بسبب سقط من الإسناد .

**٢-تعريف المعنعن :**

أ) لغة :المعنعن اسم مفعول من " عَنْعَن " بمعنى قال " عَنْ ، عَنْ " .

ب) اصطلاحاً: قول الراوي:فلان عن فلان.

**٣- مثاله:**

ما رواه ابن ماجه قال : " حدثنا عثمان بن أبي شيبة ثنا معاوية بن هشام ثنا سفيان عن أسامة بن زيد عن عثمان بن عروة عن عروة عن عائشة . قالت قال رسول الله صلي الله عليه وسلم : إن الله وملائكته يصلون على مَيَامِنِ الصفوف " [١٩١]

---

[١٩١] ابن ماجه ـ كتاب إقامة الصلاة والسنة فيها جـ١ ـ ص ٣٢١ رقم الحديث / ١٠٠٥ / .

**٤- هل هو من المتصل أو المنقطع ؟ :**

اختلف العلماء فيه على قولين:

أ) قيل أنه منقطع حتى يتبين اتصاله .

ب) والصحيح الذي عليه العمل ، وقاله الجماهير من أصحاب الحديث والفقه والأصول أنه متصل بشروط ، اتفقوا على شرطين منها ، واختلفوا في اشتراط ما عداهما ، أما الشرطان اللذان اتفقوا على أنه لا بد منهما - ومذهب مسلم الاكتفاء بهما - فهما :

١- أن لا يكون المُعَنْعِنُ مُدَلِّساً .

٢- أن يمكن لقاء بعضهم بعضا ، أي لقاء المُعَنْعِن بمن عَنْعَنَ عنه .

وأما الشروط التي اختلفوا في اشتراطها زيادة على الشرطين السابقين فهي:

١- ثبوت اللقاء: وهو قول البخاري وابن المديني والمحققين.

٢- طول الصحبة : وهو قول أبي المظفر السمعاني .

٣- معرفته بالرواية عنه : وهو قول أبي عمرو الداني .

**٥- تعريف المُؤَنَّن :**

أ) لغة : اسم مفعول من " أَنَّن " بمعني قال " أن ، أن " .

ب) اصطلاحاً: هو قول الراوي: حدثنا فلان أن فلاناً قال...

**٦- حكم المُؤَنَّن :**

أ) قال احمد وجماعة هو منقطع حتى يتبين اتصاله.

ب) وقال الجمهور: " أَنَّ " كـ " عَنْ " ومطلقه محمول على السماع بالشروط المتقدمة.

## فەرمودەی (مُعَنْعَن و مُؤَنَّنْ)

### ١.ڕێخۆشکردن:

ئەو شەش جۆرەی فەرمودەی ڕەدکراوە، تەواو بوو، کە ڕەدکردنەوەکەیان بەهۆی پچڕان لە سەنەدەکەیاندا بوو، بەڵام لەبەر ئەوەی کە (معنعن)و (مؤنن)ن جیان لێیان، کە ئایا لە جۆری (منقطع)ن، یان لە جۆری (متصل)ن، بۆیە لکاندنیان، بە جۆرەکانی مەردودەوە بەچاك زانی، بە هۆی پچڕان بوون لە سەنەدەکەیانا.

### ٢.پێناسەی (مُعَنْعَن):

**أ.لەڕووی زمانەوانیەوە:**(معنعن) ئیسمی مەفعولە، و لە (عنعن)ەوە هاتووە، بەمانای ئەوەی کە وتویەتی (عن، عن) —لەفلان ئەویش لە فلانەوە.

**ب.لەڕووی زاراوەوە:** ئەو گوتەیەی گێڕەوە(ڕاوی)یەکەیە، کە دەڵێت: (فلان عن فلان) فلانە کەس لە فلانە کەسەوە.

### ٣.نمونەکەی:

وەك ئەوەی کە (إبن ماجة) ڕیوایەتی دەکاتو دەڵێت:(حدّثنا عثمان بن أبي شيبة ثنا معاوية بن هشام ثنا سفيان عن أسامة بن زيد عن عثمان بن عروة عن عروة عن عائشة قالت: (قال رسول (ﷺ) أن الله و ملائكته يصلون على مَيَامِنِ الصفوف)[١٩٢]، خوداو فریشتەکانی، درورود دەنێرن بۆ سەر لای ڕاستی ڕیزەکان.

---

([١٩٢]) إبن ماجة، كتاب إقامة الصلاة و السنة فيها، ج١/ص٢٢١، رقم الحديث/ ١٠٠٥.

**٤.ئایا سەربە (متصل)ـە، یان سەربە (منقطع)ـە:**

زانایان جیاوازیان هەیە لە سەریو لەسەر دوو قسەن:

أ.گوتراوە سەربە (منقطع)ە، تا پەیوەستی (إتصال)ەکەی دەردەکەوێت.

ب.ئەو گوتە ساغەی کە کاری پێدەکرێت، و جەماوەری زانایانی فەرمووودەو فیقهـ و ئوصول لەسەری دەڕۆن، ئەوەیە کە بە (متصل) حیسابە، بەچەند مەرجێك، لەسەر دوو مەرجی ڕێك کەوتوون، وە لەسەر مەرجەکانی تریان جیاوازیان هەیە، بەڵام ئەو دوو مەرجەی کە هەموو ڕێکەوتوون لەسەری کە دەبێت هەبن، و مەزهەبی (ئیمام موسلیم) لەسەر ئەمەیە کە ئەو دوو مەرجە بەسن کە هەبن.

ئەمانەن:

١.نابێت ئەو کەسەی کە (عَنْ)، (عَنْ)ـەکەی، ئەنجامداوە، فێڵکار، و تەڵەکەباز (مُدّلس) بێت.

٢.دەبێت ئەوەی لـێ چاوەڕێ بکرێت کە هەندێکیان بەهەندێکی تریان گەیشتبن، واتە گەیشتنی ئەو کەسەی کە (عن عن)ەکەی کردووە، بەو کەسانەی کە (عن)ە کەیان لەسەر کراوە.

بەڵام ئەو مەرجانەی کە جیاوازیان هەیە لەسەری، ئەمە سەرەڕای دوو مەرجە پێشووەکە، کە ئەمانەن:

١.جێگیر بوونی بەیەك گەیشتن (ثبوت اللقاء):کە ئەمەش قسەی (بخاری) و (إبن المدینی)وتوێژەرەوان (محققین)ە.

٢.زۆر پێکەوە بوون (طول الصحبة)ـە،کە ئەمەش گوتەی (أبو المظفر السمعاني)یە.

٣.ئاگاداربوون بەوەی کە ڕیوایەتی لێوەکراوە: کە ئەمەش گوتەی (أبو عمرو الداني).

### ٥.پێناسەی (المؤنن):

أ.لەڕووی زمانەوە:ئیسمی مەفعولە و لە (أنن)ەوە هاتووە، بەمانای ئەوەیە کە وتویەتی (أن، أنَّ،...).

ب.لەڕووی زاراوەوە:ئەو گوتەیەی گێڕەرەوەیە کەدەڵێت: (حدّثنا فلان أن فلاناً قال – فلانەکەس بۆی باس کردین، کە فلانەکەس وتویەتی:...).

### ٦.حوکمی (مؤنّن):

أ.(إمام أحمد) و کۆمەڵێك دەڵێن: کە بە (منقطع –پچڕاو) حیسابە، تا (پێکەوە لکان – إتصال)ەکەی دەردەکەوێت.

ب.جەماوەری زانایان دەڵێن: (أنَّ) وەك (عَنْ) وایە، وە بە گشتی لەسەر (بیستن – سماع) حیسابکراوە، بەڵام بەو مەرجانەی پێشوو.

# المبحثُ الثالثِ

## المردود بسبب طعن في الراوي

### ١- المردود بالطعن في الراوي :

المراد بالطعن في الراوي جرحه باللسان، والتكلم فيه من ناحية عدالته ودينه ومن ناحية ضبطه وحفظه وتيقظه.

### ٢- أسباب الطعن في الراوي :

أسباب الطعن في الراوي عشرة أشياء، خمسة منها تتعلق بالعدالة، وخمسة منها تتعلق بالضبط.

أ) أما التي تتعلق بالطعن في العدالة فهي:

١- الكذب.

٢- التهمة بالكذب .

٣- الفسق.

٤- البدعة.

٥- الجهالة.

ب ) أما التي تتعلق بالطعن في الضبط فهي:

١- فُحْشُ الغلط .

٢- سوء الحفظ .

٣- الغفلة.

٤- كثرة الأوهام.

٥- مخالفة الثقات .

وسأذكر أنواع الحديث المردود بسبب من هذه الأسباب على التوالي مبتدئاً بالسبب الأشد طعناً.

## (باسی سێیەم)

## بەرپەرچ دراوە بەهۆی تانەدان لە گێڕەرەوە

## (المردود بسبب الطعن في الرّاوي)

### ١.مەبەست لە تانەدان لە گێڕەرەوە:

مەبەست لە تانەدان لە گێڕەرەوە، بریتیە لە بریندار (جَرْح)کردنی بە زوبان، وە قسەکردن لەسەری لەڕووی عەدالەتو دینەکەیەوە، وە لە ڕووی (ضبط) و هێزی لەبەر کردن و وریاییەوە.

### ٢.هۆکارەکانی تانەدان لە گێڕەرەوە:

هۆکارەکانی تانەدان لە گێڕەرەوە (١٠) دەشێن کە پێنجیان پەیوەستن بە عەدالەتەوە، وە پێنجیان پەیوەستن بەتوانای (ضبط)کردنەوە.

أ.بەڵام ئەوانەی کە پەیوەستن بە تانەدان لە عەدالەت، ئەمانەن:

١.درۆ.

٢.تۆمەتبارکردن بەدرۆ.

٣.خراپەکاری (الفسق).

٤.بیدعە چێتی.

٥.نەفامی (الجهالة):

ب.بەڵام ئەوانەی کە پەیوەستن بە تانەدان لە هێزی لەبەرکردن (الطعن في الضبط) ئەمانەن:

١.هەڵەی زەقو زۆرو بێتام (فحشْ الغلط).

٢.خراپی هێزی لەبەر کردن (سوء الحفظ).

٣.بـێ ئاگایی (الغفلة).

٤.زۆری وەهم (كثرة الأوهام).

٥.پێچەوانە بونەوە لـەگەڵ متمانە پێكراواندا (مُخالفة الثقات).

جا باسی جۆرەكانی فەرموودەی ڕەدكراوە دەكەم كە بەهۆی هۆكاریێ لـەم هۆكارانەوە مەڕدودە، بەشێوەیەكی یەك لـەدوای یەك، وە لـە هۆكارە زۆر تانە دارەكەوە (أشد طعناً)ـەوە دەست پـێ ئەكەم.

## المَوضُوع

إذا كان سبب الطعن في الراوي هو الكذب على رسول الله صلي الله عليه وسلم فحديثه يسمي الموضوع.

**١ – تعريفه:**

أ) لغة: هو اسم مفعول من " وَضَعَ الشيء " أي " حَطَّهُ " سُمي بذلك لانحطاط رتبته.

ب) اصطلاحاً: هو الكذب المُخْتَلَق المصنوع المنسوب إلى رسول الله صلي الله عليه وسلم.

**٢– رتبته :**

هو شر الأحاديث الضعيفة وأقبحها . وبعض العلماء يعتبره قسماً مستقلا وليس نوعاً من أنواع الأحاديث الضعيفة.

### ٣- حكم روايته :

أجمع العلماء على أنه لا تحل روايته لأحد عَلِمَ حالَهُ في أي معنى كان إلا مع بيان وضعه، لحديث مسلم: " مَنْ حَدَّثَ عني بحديث يُرَى أنه كَذِبٌ فهو أحد الكاذبين "[١٩٣]

### ٤- طرق الوضاعين في صياغة الحديث :

أ) إما أن يُنْشِئ الوضاع الكلام من عنده ، ثم يضع له إسنادا ويرويه .

ب) وإما أن يأخذ كلاماً لبعض الحكماء أو غيرهم ويضع له إسنادا .

### ٥- كيف يُعْرَفُ الحديث الموضوع ؟

يعرف بأمور منها :

أ) إقرار الواضع بالوضع : كإقرار أبي عِصْمَة نوحٍ بن أبي مريم بأنه وضع حديث فضائل سور القرآن سورة سورة عن ابن عباس .

ب) أو ما يَتَنَزَّلُ منزلة إقراره : كأَنْ يُحَدِّثَ عن شيخ ، فَيُسْأَلَ عن مولده ، فيذكرَ تاريخا تكون وفاةُ ذلك الشيخ قبلَ مولده هو ، ولا يُعْرَف ذلك الحديث إلا عنده .

ت) أو قرينة في الراوي:مثل أن يكون الراوي رافضياً والحديث في فضائل أهل البيت.

ث) أو قرينة في المَرْوِي: مثل كون الحديث ركيك اللفظ، أو مخالفاً للحس أو صريح القرآن.

---

[١٩٣] مقدمة مسلم بشرح النووي جـ ١ ـ ص ٦٢ .

### ٦- دواعي الوضع وأصناف الوضاعين :

أ) التقرب إلى الله تعالى : بوضع أحاديث ترغب الناس في الخيرات ، وأحاديث تخوفهم من فعل المنكرات ، وهؤلاء الوضاعون قوم ينتسبون إلى الزهد والصلاح، وهم شر الوضاعين لأن الناس قَبِلَتْ موضوعاتهم ثقة بهم ، ومن هؤلاء مَيْسَرَةٌ بن عبد ربه ، فقد روي ابن حبان في الضعفاء عن ابن مهدي قال : قلت لميسرة بن عبد ربه : من أين جئت بهذه الأحاديث، من قرأ كذا فله كذا ؟ قال : وضعتُها أُرَغّب الناسَ " [١٩٤]

ب) الانتصار للمذهب : لا سيما مذاهب الفرق السياسية بعد ظهور الفتنة وظهور الفرق السياسية كالخوارج والشيعة ، فقد وضعت كل فرقة من الأحاديث ما يؤيد مذهبها ، كحديث " عليٌّ خير البشر ، من شكٌ فيه كفر "

ج) الطعن في الإسلام : وهؤلاء قوم من الزنادقة لم يستطيعوا أن يَكيدوا للإسلام جهاراً ، فعمدوا إلى هذا الطريق الخبيث ، فوضعوا جملة من الأحاديث بقصد تشويه الإسلام والطعن فيه ، ومن هؤلاء محمد بن سعيد الشامي المصلوب في الزندقة ، فقد رَوَى عن حُمَيْد عن أنس مرفوعاً " أنا خاتم النبيين لا نبي بعدي إلا أن يشاء الله [١٩٥] " ولقد بين جهابذة الحديث أمر هذه الأحاديث ولله الحمد والمنة .

د) التَزَلُّف إلى الحكام : أي تقرب بعض ضعفاء الإيمان إلى بعض الحكام بوضع أحاديث تناسب ما عليه الحكام من الانحراف ، مثل قصة غياث بن إبراهيم النَّخَعي الكوفي مع أمير المؤمنين المهدي ، حين دخل عليه وهو يلعب

---

[١٩٤] تدريب الراوي جـ١ ـ ص ٢٨٣.

[١٩٥] تدريب الراوي جـ ١ ـ ص ٢٨٤.

بالحَمَام ، فساق بسنده على التوّ إلى النبي صلي الله عليه وسلم أنه قال : " لا سَبَق إلا في نَصْل أو خُفٍ أو حافر أو جَنَاح " فزاد كلمة " أو جَنَاح " لأجل المهدي ، فعرف المهدي ذلك ، فأمر بذبح الحَمَام، وقال : أنا حملته على ذلك .

ه) التكسب وطلب الرزق : كبعض القُصَّاص الذين يتكسبون بالتحدث إلى الناس ، فيوردون بعض القصص المسلية والعجيبة حتى يستمع إليهم الناس ويعطوهم ، كأبي سعيد المدائني .

و) قصد الشهرة : وذلك بإيراد الأحاديث الغريبة التي لا توجد عند أحد من شيوخ الحديث، فيقبلون سند الحديث لِيُستَغربَ ، فيرغب في سماعه منهم ، كابن أبي دحية وحماد النَّصِيبي " [١٩٦]

### ٧- مذاهب الكَرَّامِيَّة في وضع الحديث :

زعمت فرقة من المبتدعة سُمُّوا بالكرامية جواز وضع الأحاديث في باب الترغيب والترهيب فقط ، واستدلوا على ذلك بما رُوي في بعض طرق حديث " من كذب على متعمداً " من زيادة جملة " ليضل الناس " ولكن هذه الزيادة لم تثبت عند حفاظ الحديث .

وقال بعضهم " نحن نكذب له لا عليه " وهذا استدلال في غاية السخف ، فان النبي صلي الله عليه وسلم لا يحتاج شرعه إلى كذابين ليروجوه .

وهذا الزعم خلاف إجماع المسلمين ، حتى بالغ الشيخ أبو محمد الجويني فجزم بتكفير واضع الحديث .

---

[١٩٦] المصدر السابق جـ١ ـ ص ٢٨٦ .

**٨- خطأ بعض المفسرين في ذكر الأحاديث الموضوعة :**

لقد أخطأ بعض المفسرين في ذكرهم أحاديث موضوعة في تفاسيرهم من غير بيان وضعها ، لا سيما الحديث المروي عن أُبَيّ ابن كعب في فضائل القرآن سورة سورة ، ومن هؤلاء المفسرين :

أ) الثعلبي.

ب) الواحدي .

ت) الزمخشري .

ث) البيضاوي.

ج) الشوكاني .

**٩-أشهر المصنفات فيه :**

أ) كتاب الموضوعات : لابن الجوزي ، وهو من أقدم ما صنف في هذا الفن . لكنه متساهل في الحكم على الحديث بالوضع ، لذا انتقده العلماء وتعقبوه .

ب) اللآليء المصنوعة في الأحاديث الموضوعة : للسيوطي ، هو اختصار لكتاب ابن الجوزي وتعقيب عليه ، وزيادات لم يذكرها ابن الجوزي .

ج) تنزيه الشريعة المرفوعة عن الأحاديث الشنيعة الموضوعة : لابن عراق الكناني ، وهو كتاب تلخيص لسابقيه ، وهو كتاب حافل مهذب مفيد .

## فەرموودەی هەڵبەستراو ( الموضوع )

هۆكاری تانەدان لـە گێڕەرەوەكە درۆكردن بوو بەدەم پێغەمبەرەوە(ﷺ) ئەوە فەرموودەكەی بەهەڵبەستراو (موضوع) دادەنرێ، و ناوزەددەكرێ.

### ١.پێناسەکەی:

**أ.لەڕوی زمانەوە:**ئیسمی مەفعولە لە (وَضَعَ الشيَ)ەوە، وەرگیراوە، واتە: (حطُّ – دای ڕوخان) بەمە ناونراوە، چونکە ڕوخانی پلەکەیی تیادایە.

**ب.لەڕوی زاراوەوە:**ئەو درۆ هەڵبەستراو، و دروستکرا وەیە، کە دراوەتە پاڵ پێغەمبەر (ﷺ).

### ٢.پلەکەی:

خراپترینی فەرموودەی لاوازەو ناشیرینترینیانە، وەهەندێ لە زانایان بەبەشێکی سەربەخۆی دادەنێن، و بە جۆرێك لە جۆرەکانی فەرموودەی لاوازی دانانێن.

### ٣.حوکمی گێڕانەوەی:

زانایان یەکدەنگن لەسەر ئەوەی کە ڕیوایەت کردنی دروست نییە، بۆ کەسێك کە حاڵەتەکەی بزانێت ئیتر بەهەر مانایەك بێت، مەگەر لەگەڵ ڕوونکردنەوەو دەرخستنی هەڵبەستنەکەی دا لەبەر ئەم فەرمودەیەی ئیمام (مسلم): (من حدث عني بحديث يُرى أنه كذب فهو أحد الكاذبَيْن)[١٩٧] ئەوەی فەرمودەیەکم لێوە بگێڕێتەوە و بزانێت کە درۆیەو هەڵبەستراوە، ئەوە بە یەکێك لەو دوو درۆزنانە حیساب دەکرێت.

---

(١٩٧) مقدمة مسلم بشرح النواوي ج١/ ص٦٢

**٤.ڕێبازی دروستکەران (الوضاعين) لە دەقو شێواز (صياغة)ی فەرمودەدا:**

أ.یان ئەوەیە کە کابرای دروستکەری فەرمودەکە، ئەو فەرمودەیەی لەلای خۆیەوە دروستی دەکات، و پاشان سەنەدی بۆ دادەنێت و ڕیوایەتی دەکات.

ب.وەیان قسەی هەندێ لە مرۆڤە حەکیمەکان (الحكماء)و، ...هتد، دەهێنێت و سەنەدی بۆدادەنێت.

**٥.فەرمودەی هەڵبەستراو چۆن دەناسرێتەوە؟**

بەهۆی چەند شتێکەوە دەناسرێتەوە لەوانە:

أ.دان پێداهێنانی کابرای دروستکەر لەسەر دروست کردنی ئەو فەرمودەیە (إقرار الواضع بالوضع):وەك دان پێداهێنانەکەی (أبو عصمة نوح بن أبي مريم) بەمەی فەرمودەکانی فەزڵـی سورەتەکانی قورئانی سورەت بەسورەت لە (إبن عباس)ەوە دروست کردووەو هەڵواسیوە.

ب.یاخود بە هۆی شتێکەوە دەرکەوێت، کەلەدان پێداهێنانەکەی پلەکـەی نزمتر بێت، (ما ينزل منزلة إقراره):وەك ئەوەی کـە لـە مامۆسـتایەکەوە شـتێ بهێنێ‌و بیڵـێ، جـا پرسـیاری لـێ بکـرێ لـە ساڵـی لـەدایکبوونی ئـەو مامۆستایە، مێژوویەك بڵێت کە ئەو مامۆستایە لەو مێژووەدا وەفاتی کردبێـت و پێش لەدایك بونی خۆی بێت، وە ئەو فەرمودەیەش تەنها لەلای ئەو هـەبێت و بزانرێت.

ج.یاخود بەدەرکەوتنی نیشانەیەك لە گێڕەرەوەکەدا، (قرينة في الرّاوي):

وەك ئەوەی کە ڕاوییەکە شیعە (رافضي) بێت، و فەرمودەکە دەربارەی پلەو پایەی (أهل البيت) بێت.

د.یان بەهۆی بوونی نیشانەیەکەوە لە گێڕانەوەکەدا، (قرينة في المروي): وەك ئەوەی کە فەرمودەکە بێ پێزو، و بێتام (ركيك اللفظ) بێت، یان پێچەوانە بێت لەگەڵ هەست دا یاخود دژی ڕێسای قورئان بێت.

## ٦.هۆکارەکانی هەڵبەستنی فەرمودە (دواعي الوضع) و پۆلێنی دروست کەران (أصناف الوضاعين):

أ.بۆ لەخوا نزیك کەوتنەوە (التقرب إلى الله):کە فەرمودە گەلێك دادەنرێت بۆ هەڵ نانی خەڵك لەسەر چاکە کاری، وە فەرموودە گەلێك خەڵکی بترسێنن لە خراپەکاری، ئەم فەرمودە دروست کەرانە، خەڵکانێکن کە بەزوهدو پیاو چاکی (الصّلاح) ناسراون، بەڵام خراپترینی فەرموودە دروستکەرانن، چونکە خەڵکی متمانەی پێیانەو فەرمودە دروست کراوەکانیان وەردەگرێت.

لەم جۆرە کەسانە (ميسرةَ بن عبد رَبه) جا (إبن حبان) لە (الضعفاء) دا لە (إبن مهدي)یەوە دەگێڕێتەوەو دەڵێت:وتم بە (ميسرة بن عبد رَبَه) ئەم فەرمودانەت لە کوێ هێنا، ئەوەی ئەوە بخوێنێ واتە لە قورئان– ئەوەو ئەوەی هەیە، واتە: لە پاداشت– وتی:هەڵم بەستوون، تا خەڵکیان پێ هاندەم[١٩٨].

ب.بۆ سەرخستنی ڕێڕەوی ئەو کەسە خۆی (ألأنتصار لمذهب) بەتایبەت مەزهەبەکانی دەستەو تاقمە سیاسییەکان، پاش دەرکەوتنی فیتنەو سەرهەڵدانی دەستەو تاقمە سیاسییەکان وەك (خوارج) و (شيعة) جا هەر دەستەو تاقمە و فەرمودە گەلێکی دروست کرد، بۆ پشتیوانی مەزهەبەکەی خۆی، وەك

(١٩٨) تدريب الرّاوي ج١/ص٢٨٣.

فەرمودەی(عليّ خير البشر، من شك فيه كفر) (ئیمام علی) چاکترین مرۆڤە، و ئەوەی گومانی لەسەری هەبێــت کافرە!

**ج.بۆ تانەدان لە ئیسلام (الطعن في الإسلام):**

ئەمە خەڵکانێك بوون لە بــێدینەکان (زنادقة) کە نەیان دەتوانی کە بە ئاشکرا فێڵ لە ئیسلام بکەن، بۆیە پەنایان بردە بەر ئەم ڕێبازە پیسە، کۆمەڵێك فەرموودەیان دروست کرد، بە مەبەستی تەشویش خستنەسەر ئیسلام و تانەدان لێی، لەوانە (محّمد بن سعيد الشامي) ڕۆچوو لە بــێ دینی دا.. المسلوب في الزندقة).

لە (حُمَيْد) و ئەویش لە (أنس)ەوە بەمەرفوعی ڕیوایەت کراوە کە (أنا خاتم النبيين لا نبي بعدي ألاّ أن يشاء الله)[199] واتە:من کۆتایی پێغەمبەرانم و لە دوامەوە پێغەمبەر نایەت، مەگەر خوا بیەوێت، کە لێزانان (جهابذة)ی فەرمودە کێشەی ئەم فەرموودانەیان ڕوون کردۆتەوە، ولله الحمد، والمنة.

**د.ماستاوچێتی بۆ کاربەدەستان (التزلف إلــى الحكام):** واتە:بۆنزیك کەوتنەوەی هەندێ لە ئیمان لاوازەکان لەهەندێ لە کاربەدەستان، ئەویش بەدروست کردنی فەرمودە گەلێك کە گونجاو بن لەگەڵ ئەو بارودۆخە خوارو خێچەدا کە کاربەدەستانی تیادایە، وەك چیرۆکەکەی (غياث)ی کوڕی (إبراهيم النخعي الكوفي) لەگەڵ پێشەوای ئیمانداران (مهدی)دا، کە کاتێ ڕۆشتە ژوورەوە بۆ لای، خەریکی کۆتر بازی بوو، جا سەنەدێکی ڕێك خست یەك لە دوای یەك تا پێغەمبەر (ﷺ) بەوەی کە فەرمویەتی: (لا سبق ألاّ في نَصل أو خف أو حافر أو جناح) واتە: دروست نییە پارە وەرگرتن لە

---

([199]) تدريب الرّاوي ج١/ ص٢٨٤.

پێشبڕکـێدا جگە لەم سێ جۆرە، تیر هاویشتن، غاردانی ئەسپو مایین، غاردانی وشتر- جا کۆتربازی-و وشەی (جناح:کۆتر بازی) بۆ زیاد کرد، لەبەرخاتری (مهدی)لێرەدا (مهدی) بەمەی زانی وتی: من ئەمەم پێکرد.

**ه.بەمەبەستی کاسپیو نان پەیداکردن:**وەك هەندێ لەچیرۆك خوانەکان، ئەوانەی بەقسەکردن بۆ خەڵکی نان پەیدا دەکەن، جا هەندێ چیرۆکی سەرسوڕهێنەر دەهێنن، تا خەڵکی گوێی لـێ بگرنو شاباشیان بکەن وەك (أبو سعيد المدائني).

**ز.بۆ ناوبانگ دەرکردن، (قصد الشهرة):**ئەمەش بەدانانی فەرمودەگەلێکی غەریب و نامۆی وا کە لەلای هیچ شێخێکی فەرمودە دەست نەکەون، جا سەنەدی فەرمودەکە وەردەگێڕنەوە، تا غەریب ببێتو خەڵکی ڕەغبەتی هەبێت لە گوێ بۆ گرتنیدا، وەك (إبن ابي دحية)و (حماد النصيبي)[٢٠٠].

**٧.ڕێڕەوی (الكرّامية)کان لەدانانی فەرمودەدا:**

تاقمێك لە بیدعەچیەکان کە بە (كرّامية) ناوزەدن، بانگەشەی ئەوەیان کرد، کە هەڵبەستنی فەرمودە، بۆ تەنها هاندانو ترساندنی خەڵکی (ترغيب و ترهيب) دروستە، بەڵگەشیان بۆ ئەمە ئەوەیە کە لەهەندێ لە ڕێگاکانی فەرمودەی (من كذب علي متعمداً)دا ڕستەی زیادکراوی (ليضل الناس) ڕیوایەت کراوە، بەڵام ئەم زیادەیە لەلای شارەزایان (حافظ)ی فەرمودە ثابت نەبووە..

وە هەندێکیان دەڵێن: (نحن نكذب لـه لا عليـه) ئێمـە درۆی بـۆ دەکـەین، درۆی بەدەمەوە ناکەین، بـەڵام بەبەڵگـە کـردن (أسـتدلال)ێکی خوێڕوانەیـە،

---

(٢٠٠) تدريب الرّاوي ج١/ص٢٨٦.

چونکە پێغەمبەر(ﷺ) بەرنامەکەی پێویستی بەو درۆزنانە نییە، تا ڕەواجی پــێ بدەن، وەئەم بانگەشەیە پێچەوانەی ئیجماعی موسلّمانانە، تەنانەت (الشيخ أبـو محمد الجويني) تیایدا ڕۆچووە،و دانی تەواوی نـاوە، بـەکافرێتی دروسـتکەری فەرمودەدا.

## ٨.هەڵــەی هەنــدێ لــە موفەســیرەکان، لــە هێنــانی فەرموودەگــەلێکی هەڵبەستراودا:

هەندێ لە توێژەرەوانی قورئـان لـە هێنـانی فـەرمودەی هەڵبەسـتراودا لـە تەفسـیرەکانیاندا بەهەڵــەدا چــوونو هەڵبەستنەکەشـیان ڕوون نەکردۆتـەوە، بەتایبـەت ئـەو فەرموودانـەی کـە لـە (أبـی إبـن کعـب)ەوە گێڕدراونەتـەوە، دەربارەی فەزڵـی سورەت بە سورەتی قورئان،لەو موفەسیرانە:

أ.الثعلبي.

ب.الواحدي.

ج.الزمخشري.

د.البيضاوي.

هـ.الشوكاني.

## ٩.بەناوبانگ تریی کتێبەکان لەم بارەیەوە:

أ.(كتاب الموضوعات)ی (إبن الجوزی) کە لــە پێشـین ترینــی کتێبەکانەلــەم زانستەدا، بەڵام ئاسانکار (متساهل)ــە، لە حـوکم دان بەسـەر هەڵبەسـتیارانی فەرموودەدا، بۆیە زانایان ڕەخنەیان لێگرتووەو بەدواداچونیان بۆ کردووە.

ب.(اللآئي المصـنوعة في الأحاديـث الموضـوعة)ی (ألإمـام السـيوطي) کـە کورتەی کتێبەکەی (إبن الجوزی)یە، و بەدواداچونە بـۆی، و زیـادە گـەلێکی تیادایە کە (إبن الجوزی) باسی نەکردووە.

جـ.(تنزيه الشريعة المرفوعة عن الأحاديث الشنيعة الموضوعة)ی (إبن عـراق الكناني) كە ئەمە کتێبێکە پوختەی ئـەو دوو کتێبـەی تـرە، وە کتێبێکـی پـڕو پاکو پوختەکراوو بەسوودە.

## المَتْرُوكْ

إذا كان سبب الطعن في الراوي هو التهمة بالكذب ـ وهو السبب الثاني ـ سمي حديثه المتروك .

١ – تعريفه:

أ) لغة : اسم مفعول من " التَّركِ " وتسمي العرب البيضة بعد أن يخرج منها الفرخ "التَّرِيكة" أي متروكة لا فائدة منها .[٢٠١]

ب) اصطلاحاً : هو الحديث الذي في إسناده راو متهم بالكذب .

٢– أسباب اتهام الراوي بالكذب أحد أمرين وهما:

أ) أن لا يُروي ذلك الحديث إلا من جهته ، ويكون مخالفاً للقواعد المعلومة[٢٠٢]

ب) أن يُعْرَف بالكذب في كلامه العادي ، لكن لم يظهر منه الكذب في الحديث النبوي .

---

[٢٠١] انظر القاموس جـ ٣ – ص ٣٠٦

[٢٠٢] القواعد العامة: هي القواعد العامة التي استنبطها العلماء من مجموع نصوص عامة صحيحة مثل قاعدة" الأصل براءة الذمة"

**٣- مثاله:**

حديث عمرو بن شَمِر الجُعْفي الكوفي الشيعي ،عن جابر عن أبي الطفيل عن علي وعمار قالا : كان النبي صلي الله عليه وسلم يقنت في الفجر ، ويكبر يوم عرفة من صلاة الغَداة ، ويقطع صلاة العصر آخر أيام التشريق "

وقد قال النسائي والدارقطني وغيرهما عن عمرو بن شَمِر : " متروك الحديث .[٢٠٣]

**٤- رتبته :**

مر بنا أن شر الضعيف الموضوع، ويليه المتروك، ثم المنكر ثم المعلل، ثم المدرج، ثم المقلوب، ثم المضطرب، كذا رتبه الحافظ ابن حجر.[٢٠٤]

## فەرموودەی وازلێهێنراو ( المتروك )[(٢٠٥)]

ئەگەر هاتوو هۆکاری تانەدان لە گێڕەرەوە (الطعن في الراوي) تۆمەتبار بوون بوو، بە (درۆ:کە هۆکاری دووەمە)، ئەوا فەرموودەکەی بە (متروك) ناوزەد دەکرێ.

**١.پێناسەکەی:**

**أ.لەڕووی زمانەوە:** ئیسمی مەفعولە و لە (الترك)ەوە هاتووە، وە عەرەب هێلکەدوای ئەوەی کە جوجکەکەی تیادا دەرهات، پێی دەڵێن (التريكة)

---

[٢٠٣] ميزان الاعتدال جـ٣ ـ ص ٢٦٨.

[٢٠٤] انظر التدريب جـ١ ـ ص ٢٩٥ والنخبة وشرحها ص ٤٦ وما بعدها .

(٢٠٥) ئەم جۆرە (حافظ إبن حجر) لە (نخبة الفكر)دا باسی کردووەو پێش ئەو هیچ یەکێ لە (إبن الصلاح)و (الإمام النواوی) باسیان نەکردووە.

واتە: وازلێهێنراوە، هیچ سودی نییەو، بێ کەڵکە[٢٠٦].

**ب.لەڕووی زاراوەوە:**ئەو فەرمودەیە یە کەلە سەنەدەکەیدا ڕاویەکی تۆمەتبار بەدرۆی تیادا بێت.

**٢.هۆکارەکانی تۆمەتبار کرانی گێڕەرەوە، بەدرۆ، یەکێ لەم دوو شتانەیە:**

**أ.**ئەمەیە کە ئەو فەرمودەیە ڕیوایەت نەکرابێ، تەنها لە ڕێگای ئەوەوە نەبێت، وە دژایەتی هەبێت لەگەڵ یاسازانراوەکان (القواعد المعلومة)دا*.

**ب.**ناسراوبێت بەدرۆ، لەقسەکردنیی ئاساییدا، بەڵام درۆی لێ دەرنەکەوتبێت لەفەرمودەی پێغەمبەردا (ﷺ).

**٣.نمونەکەی:**

وەك ئەو فەرمودەیەی (عمرو بن شَمِر الجُعْفي الكوفي الشيعي) لە (جابر)ەوە و لە (ابي الطفيل)و لە (علي و عمّار)ەوە، کە ووتویانە: كان النبي (ﷺ) يقنت في الفجر، و يكبّر يوم عرفة من صلاة الغداة، و يقطع صلاة العصر أخر أيام التشريق)،واتە: پێغەمبەرﷺلەنوێژی بەیانیدا قونوتی دەخوێند، ولەبەیانی ڕۆژی عەرەفەوە تا کۆتایی سێ ڕۆژەی دوای جەژنی قوربان، (الله أكبر)ی لەدوای نوێژەکاندا دەخوێند.

جا (ئیمام النسائی) و (الدارقطني) و هی تریش لەسەر (عمرو بن شمر) دەڵێن: (متروك الحديث) واتە: ئەو فەرمودانەی ئەو دەیانگێڕێتەوە واز لێهێنراون[٢٠٧].

---

(٢٠٦) القاموس.ج٣،ص٣٠٦.

(*) ڕێسا زانراوەکان (القواعد المعلومة):ئەو یاسا گشتی یانەن کە زانایان هەڵیان هێنجاون لە دەقە گشتییە ساغەکانەوە، وەك یاسای (الأصل براءة الذمّة...).

(٢٠٧) ميزان الإعتدال ج٣/ ص٢٦٨.

**٤.پلەکەی:**

بەسەر ئەوەدا گوزەراین کە خراپترینی لاواز فەرمودەی دروستکراو (موضوع)ە، جا دوای ئەمیش (متروك)و پاشان (منكر)و (معلّل)و (مدرج)و (مقلوب)و (مضطرب) دێن، جا بەم جۆرە پلە بەندی یەیە، هەروەك (حافظ إبن حجر) پلە بەندی بۆ كردووە(٢٠٨).

## المُنكَر

إذا كان سب الطعن في الراوي فحش الغلط أو كثرة الغفلة أو الفسق ـ وهو السبب الثالث والرابع والخامس ـ فحديثه يسمي المنكر .

**١ – تعريفه:**

أ) لغة : هو اسم مفعول من " الإنكار " ضد الإقرار .

ب) اصطلاحاً: عرف علماء الحديث المنكر بتعريفات متعددة أشهرها تعريفان وهما:

١ – هو الحديث الذي في إسناده راو فَحُشَ غلطُه أو كثرت غفلته أو ظهر فسقه.

وهذا التعريف ذكره الحافظ ابن حجر ونسبه لغيره [٢٠٩]

ومشي على هذا التعريف البيقوني في منظومته فقال :

**ومنكر الفرد به راو غدا  تعديله لا يحمل التفردا**

٢–هو ما رواه الضعيف مخالفاً لما رواه الثقة.

---

(٢٠٨) التدريب الرّاوي ج١/ ص٢٩٥، و النخبة و شرحها ص٤٦ وما بعدها.

[٢٠٩] انظر النخبة وشرحها ص ٤٧ .

وهذا التعريف هو الذي ذكره الحافظ ابن حجر واعتمده ، وفيه زيادة على التعريف الأول وهي قيد مخالفة الضعيف لما رواه الثقة .

**٢–الفرق بينه وبين الشاذ :**

أ) أن الشاذ ما رواه المقبول [٢١٠] مخالفاً لمن هو أولى منه.

ب) أن المنكر ما رواه الضعيف مخالفاً للثقة.

فيُعْلَم من هذا أنهما يشتركان في اشتراط المخالفة ويفترقان في أن الشاذ رَاوِيْه مقبول ، والمنكر راويه ضعيف . قال ابن حجر : " وقد غفل من سَوَّى بينهما " . [٢١١]

**٣– مثاله:**

أ) مثال للتعريف الأول: ما رواه النسائي وابن ماجة من رواية أبي زُكَيْر يحيي بن محمد بن قيس عن هشام بن عروة عن أبيه عن عائشة مرفوعاً " كلوا البَلَح بالتمر فان ابن آدم إذا أكله غضب الشيطان "

قال النسائي : " هذا حديث منكر ، تفرد به أبو زُكَيْر وهو شيخ صالح ، أخرجه له مسلم في المتابعات ، غير أنه لم يبلغ مبلغ من يُحْتَمَل تَفَرُّدُهُ " [٢١٢]

ب) مثال للتعريف الثاني : ما رواه ابن أبي حاتم من طريق حُبيب بن حَبِيب الزيات عن أبي اسحق عن العيزار بن حُرَيْث عن ابن عباس عن النبي صلي الله

---

[٢١٠] المراد بالمقبول هنا ما يشمل راوي الصحيح وراوي الحسن ( أي العدل التام الضبط ـ أو العدل الذي خف ضبطه ).

[٢١١] انظر النخبة وشرحها ص ٣٧ ويعني بقوله هذا ابن الصلاح، فقد سوى بين الشاذ والمنكر في " علوم الحديث " ص ٧٢ إذ قال " المنكر ينقسم قسمين على ما ذكرناه في الشاذ فأنه بمعناه "

[٢١٢] التدريب جـ١ ـ ص ٢٤٠

عليه وسلم قال : " من أقام الصلاة وآتي الزكاة وحج البيت وصام وقَرَى الضيف دخل الجنة " .

قال أبو حاتم : " هو منكر لأن غيره من الثقات رواه عن أبي اسحق موقوفاً . وهو المعروف"

٤- رتبته :

يتبين من تعريفي المنكر المذكورين آنفاً أن المنكر من أنواع الضعيف جداً لأنه إما راويه ضعيف موصوف بفحش الغلط أو كثرة الغفلة أو الفسق ، وإما راويه ضعيف مخالف في روايته تلك لرواية الثقة ، وكلا القسمين فيه ضعف شديد ، لذلك مر بنا في بحث " المتروك " أن المنكر يأتي في شدة الضعف بعد مرتبة المتروك .

## فەرموودەی نەناسراو ( المنكر )

ئەگەر هۆکاری تانەدران لە گێڕەرەوە (الطعن في الراوي)، هەڵەی گەورەو زۆر، وزۆر بـێئاگاییو کردنی خراپە (فسق) بێت، کە ئەمەش هۆکاری سێهەم و چوارەم و پێنجەمن، ئەوە فەرمودەکەی بە (منکر — نەناسراو) ناودەبرێت.

١.پێناسەکەی:

أ.لەڕووی زمانەوانیەوە:ئیسمی مەفعولە و لە (إنکار — دان پێدا نەهێنان)ەوە هاتووە، ودژی (أقرار — دان پێدا هێنان)ـە.

ب.لەڕووی زاراوەوە:زانایانی فەرموودە (منکر)یان بە چەند پێناسەیەك پێناسەکردووە، ناسراو ترینیان دوانن: کە ئەمانەن:

١.ئەو فەرمودەیەیەکەلەسەنەدەکەی دا ڕاویەك هەبێت کە هەڵەی گەورەو زۆر (فَحُشَ غِلطُه)و بێ ئاگایی (غفلة)ی زۆری هەبێت و خراپە (فسق)ی لێ دەربکەوێت.

وە ئەم پێناسەیەش (حافظ إبن حجر) باسی کردووەو داویەتیە پاڵ زانایانی غەیری خۆی[٢١٣].

وە (ألإمام البیقوني) لە (هەڵبەست – منظومة)ەکەیدا لەسەر ئەم پێناسەیە ڕۆیشتووەو دەڵێت...

**ومنكر الفرد به راو غداً تعديله لايحمل التفردّا**

٢.ئەو فەرمودەیەیە کە کەسێکی لاواز (ضعیف) ڕیوایەتی بکاتو دژایەتی هەبێت لەگەڵ ڕیوایەتی کەسێکی متمانە پێکراو (ثقة)دا، ئەم پێناسەیەش ئەوەیە کە (حافظ إبن حجر) باسی کردووە، و پشتی پێ بەستووە، وەزیادەیەکی تیادایە لەسەر پێناسەی یەکەم کە ئەویش پەیوەستە (قَیْد)ی (مخالفة الضعیف لماروا‌ه الثقة)یە.

**٢.جیاوازی نێوان (منكر) و (شاذ):**

أ.(شاذ):ئەوەیە کە کەسێکی متمانەدار (مقبول) ڕیوایەتی بکات[٢١٤]، بەڵام دژایەتی هەبێت لەگەڵ ڕیوایەتی کەسێکدا کەلەو پلەکەی بەرزترە.

ب.(منكر):ئەوەیە کە کەسێکی لاواز (ضعیف) دەیگێڕێتەوە، ودژایەتی

---

(٢١٣) النخبة و شرحها ص٤٧.

(٢١٤) مەبەست لە (مقبول) لێرەدا ئەوەیە کەڕاوی فەرمودەی (صحیح و حسن) دەگرێتەوە، واتە کەسێکی عادلی بیر تیژ و تەواو (العدل التام الضبط) یاخود کەسێکی عادل بەڵام (ضبط)ەکەی کەمتر بێت.

هەیە لەگەڵ گێڕانەوەی متمانەپێکراو (ثقة) یەکدا.

بەمەدا دەزانرێ، کە هەردووکیان هاوبەشن، لەبەمەرج گرتنی دژایەتی (مخالفة)کردندا بەڵام جیادەبنەوە لەمەدا کە (شاذ) ڕاوییەکەی (مقبول)ە، بەڵام (منکر) ڕاوی یەکەی لاوازە، وە (إبن حجر) دەفەرموێت: (و قد غفل من سوّى بينهما) ئەوەی کە بەیەك چاو سەیریان دەکات، لەبێ ئاگاییدایە[٢١٥].

## ٣.نمونەکەی:

أ.نمونە بۆ پێناسەی یەکەم، وەك ئەوەی کە (إمام نسائی) و (إبن ماجة) ڕیوایەتی دەکەن لە ڕیوایەتەکەی (أبي زُكَيرْ يحيى بن محمد بن قيس) لە (هشام بن عروة)ەوە ئەویش لە باوکییەوە، ئەویش لە (عائشة)ەوە بەمەرفوعی: (كلو البَلَح بالتمر فإن إبن آدم إذا أكله غضب الشيطان)،واتە:ووشکە خورما بخۆن، چونکە بەخواردنی شەیتان زویر دەبێت!

(إمام نسائی) دەفەرموێت: (ئەمە فەرمودەیەکی (منکر)ـە، کە (أبو زَكير) تیایدا تاك بۆتەوە کە شێخێکی صالحە.

وە (إمام مسلم) لە (متابعات)دا بۆیی هێناوە، بەڵام نەگەیشتۆتە پلەی ئەوانەی کە ئیحتیمالی تاك بونەوە (تفرّد) یان لێ دەکرێ[٢١٦].

ب.نمونە بۆ پێناسەی دووەم:وەك ئەوەی کە (إبن أبي حاتم) لە ڕێی (حُبَيِّب

---

(٢١٥) النخبة و شرحها، ص٣٧، واتە: بەم قسەیەی ئەو (إبن الصلاح) بەیەکسانی سەیری (شاذ)و (منکر)ی کردووە، لە (علوم الحديث)دا ص٧٢، کە دەفەرموێت: (المنكر ينقسم قسمين على ماذكرنا في الشاذ فإنه بمعناه) واتە: (منکر) دەبێتە دووبەشەوە، بەگوێرەی ئەوەی کە باسمان کرد، لە (شاذ)دا، جا (شاذ) یش هەر بەمانای (منکر)ە.

(٢١٦) تدريب الراوي ج١/ ٢٤٠.

بن حَبِیبْ الزیات)ەوە ئەویش لە (أبی أسحاق)و ئەویش لە (عَیْزار بن حُرَیْث)ئەویش لە (إبن عباس)و ئەویش لە پێغەمبەرەوە (ﷺ) ڕیوایەتی دەکات،کە دەفەرمویێت: (من اقام الصلاة و آتیَ الزکاة و حج البیت و صامَ و قری الضیف دخل الجنة).

واتە: کەسێك نوێژ بکاتو زەکات بدات، حەج بکات، وە بەڕۆژوبێو میوانداری بکات، دەچێتە بەهەشتەوە).

(أبو حاتم) دەڵێت: ئەم فەرمودەیە (منکر)ە، چونکە کەسانی تری متمانە پێکراو کە ڕیوایەتیان کردووە، لە (ابو إسحاق)دا وەستاون، وە ئەمەش لە جۆری فەرمودەی (مَعروُف)ە، بۆیە ئیتر باسی (عَیْزار)و (إبن عباس)یان نەکردووە، لەبەر ئەوە قسەکەی ئەوانە وەردەگیرێ، و ڕیوایەتەکەی (إبن حبیب) دەدرێتە دواوە.

## ٤.پلەکەی:

لەدوو پێناسە باسکرا وەکەی ئێستای (منکر)ەوە دەردەکەوێ کە (منکر)جۆرەکانی لاواز (ضعیف)ە، -کە لاوازییەکەی زۆر بێت- بێگومان چونکە یان گێڕانەوەکەی کەسێکی لاوازی وایە،کە بە هەڵەی زۆر بێتامو بێ ئاگایی زۆر و خراپەکاری وەصف کراوە، یان گێڕانەوەی کەسێکی لاوازە کەدژایەتی هەبێت لەگەڵ گێڕانەوەی کەسانی متمانە پێکراودا، وە ئەم دوو بەشەیش هەردووکیان لاوازی توند (ضعیف شدید)یان هەیە، بۆیە بەسەرماندا گوزەرا لە باسی (متروك)دا کە (منکر) لە پلەی لاوازییەکەیدا لە دوای پلەی (متروك)ەوە دێت.

## المَعْروف [٢١٧]

**١- تعريفه:**

أ) لغة: هو اسم مفعول من " عَرَفَ "

ب) اصطلاحاً : ما رواه الثقة مخالفاً لما رواه الضعيف فهو بهذا المعنى مقابل للمنكر ، أو بتعبير أدق ، هو مقابل لتعريف المنكر الذي اعتمده الحافظ ابن حجر .

**٢- مثاله:**

أما مثاله فهو المثال الثاني الذي مر في نوع المنكر ، لكن من طريق الثقات الذين رووه موقوفاً على ابن عباس . لأن ابن أبي حاتم قال : ـ بعد أن ساق حديث حُبَيِّب المرفوع ـ " هو منكر ، لأن غيره من الثقات رواه عن أبي اسحق موقوفاً ، وهو المعروف ".

## فەرموودەی ناسراو ( معروف )[٢١٨]

**١.پێناسەکەی:**

أ.لەڕووی زمانەوە:ئیسمی مەفعولەو لە (عَرَفَ)ەوە هاتووە واتە:(ناسین).

ب.لەڕووی زاراوەوە:ئەو فەرمودەیەیە کە کەسێکی بڕواپێکراو (ثقة) دەیگێڕێتەوە، کە دژایەتی هەبێت لەگەڵ گێڕانەوەی کەسێکی لاواز (ضعیف)دا.

---

[٢١٧] لم يذكر المعروف هنا لأنه من أنواع المردود ، وإنما ذكر هنا لمناسبة قسيمه " المنكر " هذا و "المعروف " من أقسام المقبول الذي يحتج به كما هو معروف .

([٢١٨]) لێرەدا (معروف) بۆ ئەوە باس نەکراوە، لەبەر ئەوەی کە لە جۆرەکانی (مردود – وەرنەگیراو)بێت، بەڵکو لێرەدا بەموناسەبەی (منکر)ەوە هاتوە، دەنا (معروف) لە بەشەکانی (مقبول – – وەرگیراو) ەوە، دەشکرێتە بەڵگە هەروەك زانراوە.

بەم مانایە (معروف) بەرابەری: (منكر)ە، یاخود بە تەعبیرێکی ووردتر بلێین، (معروف) بەرابەرو هاورێکی ئەو پێناسەیەی (منكر)ەیە، کە (حافظ إبن حجر) پشتی پێ بەستووە.

**٢.نمونەکەی:**

نمونەی ئەم جۆرە، ئەو نمونەیەیە کە لەنمونەی دووەمی جۆری (منكر)دا ڕابورد، بەلاَم لەڕێی کەسە متمانە پێکراوەکانەوە، ئەوانەی کە ڕیوایەتیان کردبوو، بەلاَم لەسەر (إبن عباس) وەستێنرابوون، چونکە (إبن أبي حاتم) گوتی: بعد أن ساق حديث حُبيب المرفوع، (هو منكر، لأن غيره من الثقات رواه عن أبي إسحاق موقوفاً، وهو المعروف).

دوای ئەوەی کە فەرمودەکەی (حُبيب)بە مەرفوعی هێنرا ئەوە (منكر)ە چونکە: کەسانی تری متمانە پێکراو ڕیوایەتیان کردووە، بەلاَم لەسەر (أبي إسحاق) وەستاون، ئەمە جۆری فەرمودەی (معروف)ە.

## المعلّل

إذا كان سبب الطعن في الراوي هو " الوهم " فحديثه يسمي المعلل وهو السبب السادس .

**١ – تعريفه:**

أ) لغة : اسم مفعول من " أَعَلَّهُ " بكذا فهو " مُعَلٌّ " وهو القياس الصرفي المشهور ، وهو اللغة الفصيحة ، لكن التعبير بـ " المعلل " من أهل الحديث جاء

على غير المشهور في اللغة، [219] ومن المحدثين من عبر عنه بـ " المعلول " وهو ضعيف مرذول عند أهل العربية واللغة . [220]

ب) اصطلاحاً: هو الحديث الذي اُطِّلِعَ فيه على علة تقدح في صحته مع أن الظاهر السلامة منها.

**٢- تعريف العلة:**

هي سبب غامض خفي قادح في صحة الحديث . فيؤخذ من تعريف العلة هذا أن العلة عند علماء الحديث لا بد أن يتحقق فيها شرطان وهما.

أ) الغموض والخفاء.

ب) والقدح في صحة الحديث .

فان اختل واحد منهماـ كأن تكون العلة ظاهرة أو غير قادحةـ فلا تسمى عندئذ علة اصطلاحاً.

**٣-قد تطلق العلة على غير معناها الاصطلاحي:**

إن ما ذكرته من تعريف العلة في الفقرة السابقة هو المراد بالعلة في اصطلاح المحدثين لكن قد يطلقون العلة أحياناً على أي طعن موجه للحديث وان لم يكن هذا الطعن خفياً أو قادحاً :

أ) فمن النوع الأول: التعليل بكذب الراوي، أو غفلته، أو سوء حفظه، أو نحو ذلك. حتى لقد سمي الترمذي النسخ علة .

---

[219] لأن المعلل اسم مفعول من " علله " بمعني ألهاه ، ومنه تعليل الام ولدها .

[220] لأن اسم المفعول من الرباعي لا يكون على وزن مفعول، وانظر علوم الحديث ص ٨١

ب) ومن النوع الثاني: التعليل بمخالفة لا تقدح في صحة الحديث، كإرسال ما وصله الثقة، وبناء على ذلك قال بعضهم: من الحديث الصحيح ما هو صحيح معلل.

**٤- جلالته ودقته ومن يتمكن منه :**

معرفة علل الحديث من أجلِّ علوم الحديث وأدقها ، لأنه يحتاج إلى كشف العلل الغامضة الخفية التي لا تظهر إلا للجهابذة في علوم الحديث ، وإنما يتمكن منه ويقوي على معرفته أهل الحفظ والخبرة والفهم الثاقب ، ولهذا لم يَخُضْ غماره إلا القليل من الأئمة كابن المديني وأحمد والبخاري وأبي حاتم والدارقطني

**٥- إلى أي إسناد يتطرق التعليل ؟**

يتطرق التعليل إلى الإسناد الجامع شروط الصحة ظاهراً، لأن الحديث الضعيف لا يحتاج إلى البحث عن علله إذ أنه مردود لا يعمل به .

**٦- بِمَ يُستَعان على إدراك العلة ؟**

يُستعان على إدراك العلة بأمور منها :

أ) تفرُّد الراوي .

ب) مخالفة غيره له .

ت) قرائن أخرى تنضم إلى ما تقدم في الفقرتين ( أ ، ب ) .

هذه الأمور تنبه المعارف بهذا الفن على وهم وقع من راوي الحديث ، إما بكشف إرسال في حديث رواه موصولاً أو وقف في حديث رواه مرفوعاً أو إدخاله حديثاً في حديث أو غير ذلك من الأوهام ، بحيث يغلب على ظنه ذلك فيحكم بعدم صحة الحديث.

**٧- ما هو الطريق إلى معرفة المُعَلّل ؟**

الطريق إلى معرفته هو جمع طرق الحديث، والنظر في اختلاف رواته، والموازنة بين ضبطهم وإتقانهم، ثم الحكم على الرواية المعلولة.

**٨- أين تقع العلة ؟**

أ) تقع في الإسناد ـ وهو الأكثر ـ كالتعليل بالوقف والإرسال.

ب) وتقع في المتن ـ وهو الأقل ـ مثل حديث نفي قراءة البسملة في الصلاة.

**٩- هل العلة في الإسناد تقدح في المتن ؟**

أ) قد تقدح في المتن مع قدحها في الإسناد ، وذلك مثل التعليل بالإرسال.

ب) وقد تقدح في الإسناد خاصة ، ويكون المتن صحيحاً مثل حديث يَعْلَي بن عُبَيْد، عن الثوري عن عمرو بن دينار عن ابن عمر مرفوعاً " اَلبَيِّعَان بالخِيار " فقد وهم يَعْلَي على سفيان الثوري في قوله " عمرو بن دينار " إنما هو عبدالله بن دينار ، فهذا المتن صحيح ، وان كان في الإسناد علة الغَلَط ، لأن كُلّاً من عمرو وعبد الله بن دينار ثقة . فإبدال ثقة بثقة لا يضر صحة المتن ، وان كان سياق الإسناد خطأ .

**١٠ – أشهر المصنفات فيه :**

أ) كتاب العلل لابن المديني .

ب) علل الحديث لابن أبي حاتم .

ج) العلل ومعرفة الرجال لأحمد بن حنبل .

د) العلل الكبير، والعلل الصغير، للترمذي .

هـ) العلل الواردة في الأحاديث النبوية للدارقطني ، وهو أجمعها وأوسعها .

## فەرموودەی عەیبدار ( المُعَلّلْ )

کە هۆکاری تانەدان لە گێڕەرەوە (الطعن في الرّاوي) بریتی بوو لە (الوهم)ئەوەفەرمودەکەی بە (عەیبدار – معلّل) ناوزەددەکرێ، کە هۆکاری شەشەمە.

### ١.پێناسەکەی:

**أ.لەڕووی زمانەوانیەوە:** ئیسمی مەفعولەولە(أَعلّه، كذافهو، مُعِلُّ) هاتووەکە ئەمەش قیاس کردنێکی زانستی (صرف)ە، و مەشهوریشە، و زمانی پوخت (فصيح)ـە، بەڵام هاتنی تەعبیرەکە بە ووشەی (مُعلل) لەلایەن زانایانی فەرمودەوە لەسەر غەیری یاسای مەشهوری زمانی – عەرەبی–یە[٢٢١] وە لەو فەرمودە ناسانەیش کە بە (معلول) دەریان بڕیوە ئەمە شتێکی لاوازو پووچە لەلای زانایانی زمانی عەرەبی[٢٢٢].

**ب.لەڕووی زاراوەوە:** ئەو فەرمودەیەیە کە عەیبێکی وای تیادا زانرابێت، کە کاربکاتە سەر صەحیحیەتیەکەی لەگەڵ ئەمەدا کە بە ڕوکەش (ظاهر) ساغ و سەلامەت بێت.

### ٢.پێناسەی (العلة: عەیب):

بریتییەلەعەیبێکی ناڕوون (غامض)و شاراوە (خفی) کەلە صەحیحێتی فەرمودەکە کەم بکاتەوە.

---

(٢٢١) چونکە (معلل) ئیسمی مەفعولە و لە (علَّلَه)ەوە هاتووە، بەمانای (ألهاه) دێت، هەر لەمەشەوە (تعليل: خجلاندنی) منداڵ لەلایەن دایکەوە هاتووە.

(٢٢٢) چونکە ئیسمی مەفعول لەفیعلی ڕوباعی (چوارپیتی)دا لەسەر وەزنی (مەفعول) نابێت، بڕوانە: علوم الحديث، ص٨١.

جا لە پێناسەی (علة)ەوە ئەمە وەردەگیرێت، کە (علة) لەلای زانایانی فەرموودە پێویستە دوو مەرجی تیادا بێتــەدی کە ئەمانەن:

أ.نادیاریو شاراوەیی (الغموض و الخفاء).

ب.کارکردن لەسەر صەحیحی فەرموودەکە (القدح في صحة الحديث).

ئەگەر یەکێك لەم مەرجانەی تیادا نەهاتەدی وەك ئەوەی کە عیللـەتەکە ڕوون بێت، یاخود کار لە صەحیحێتی فەرموودەکە نەکات ئەوا لەڕوی زاروە (ألإصطلاح)ــەوە، بە (علة) دانانرێ.

٣.جاری وا هەیە، کە (علة) بۆ غەیری مانا زاراوەیی (إصطلاح)یەکەی بەکاردێت:

ئەمەی کە باسم کرد لە پێناسەی (علة)دا، لەو بەندەی ڕابردوودا ئەوە مەبەست لە (علة)ە لە ئیصطیلاحی فەرموودەناساندا، بەڵام جاری واهەیە، وشەی (علة) بۆ هەر تانەدانێك لەفەرموودە بەکاردەهێنن، هەرچەندە ئەو عیللـەتەش شاراوە نەبێت، یاخود کاریش نەکاتە سەر صەحیحی فەرموودەکە – کە دوومەرجی پێویست بوون، لە (علة)دا –.

أ.لە جۆری یەکەم:

عەیبدار کردنە بەهۆی درۆزنی ڕاویەکەوە، یاخود بەهۆی بێ ئاگاییەوە، یاخود بەهۆی خراپی هێزی لەبەرکردنیەوە...هتد، تا تەنانەت (إمام ترمذي) نەسخیشی بە (علة) داناوە.

ب.وه لە جۆری دووەم:

عەیبدار كردن بەهۆی دژایەتی كردنێكەوه كەكار نەكاتە سەر صەحیحێتی فەرمودەكە، وەك (مورسەل) بوونی فەرمودەیەك كە كەسێكی متمانە پێكراو (ثقة) گەیاندبێتی، لەبەر ئەمەش هەندێكیان وتوویانە: لەفەرمودەی صەحیحدا هەیە، كە صەحیحی (معلل)یش بێت.

## ٤.گرنگی و وردەكای (علة)و ئەو كەسەی كە بالآدەستە تیایدا:

ناسینی عیللەتەكانی فەرمودە، لە گرنگترین و شكۆمەندترین و وردترینی زانستەكانی فەرمودەیە، چونكە پێویستی بەدەرخستنی عیللەت گەلێكی نادیارو شاراوەی وا هەیە، كە مەگەر هەر كەڵە زانایان (جهابذة)ی زانستەكانی فەرموودە بتوانن ئاشكرایان بكەن، وە كەسی بالآدەست تیایدا، و بەتوانا لەناسینیدا ئەهلی لەبەر كردنی باش و ڕابردوو (خبْرَةْ) و تێگەیشتنی تیژ (فهم ثاقب) دەبێت، هەر بۆ یەش جگە لە هەندێكی كەم لە پێشەواكان، وەك (إبن المديني) و (أحمد) و (البخاري) و (أبو حاتم) و (الدار قطني)،كەسانی تر نەیان توانیوە خۆیان لەقەرەی بدەن؟

## ٥.(علة) ڕووبەڕووی چ سەنەدێك دەبێتەوە؟

عیللەت ڕووبەڕووی سەنەدێك دەبێتەوە كە سەرجەم مەرجەكانی صەحیحیەتی بەڕوكەش (ظاهراً) تیادابێت، چونكە فەرمودەی لاواز (ضعیف) پێویستی بەلێكۆڵینەوە لەعیللەتەكەی نییە، چونكە ڕەدكراوەیەو كاری پێ ناكرێ.

## ٦.بۆ پێ زانینی عەیب (إدراك العلة) پشت بە چی دەبەسترێ؟

بۆ دەرك كردن بە عیللەت پشت بە چەند شتێ دەبەسترێ، لەوانە:

أ.تاكەوە بوونی گێڕەرەوە (تفرّد الراوي).

ب.دژایەتی کردنی کەسانی تر بۆی (مخالفة غيره له).

ج.چەند نیشانەیەکی تر، کە لە دوو بەندی (أ و ب) ی، ڕابردوداو لێرەشدا دەی گرێتە خۆی.

ئەم چەند شتە کەسی ئاگادار بەم زانستە ئاگادار دەکاتەوە، لەسەر وەهمێ کە توشی گێڕەرەوەی فەرمودەکە بووە، ئەمەشیان بەکەشف کردنی (مورسەل)ێتی فەرمودەیەکی وا کە کەسێك بە (مەوصول) ڕیوایەتی بکات، یاخود بە وەستان لەسەر فەرمودەیەك کە بە مەرفوعی ڕیوایەت کرابێت، یاخود بە کردنی فەرموودەیەك بە ناو فەرمودەیەکی تردا، و چەندەهای تر لە جۆرەکانی وەهم، بە جۆرێك کە ئەو وەهمە بەسەر گومان (ظن)ـەکەی دا زاڵ ببێت، ئیتر حوکم بدرێت بەسەر صەحیح نەبوونی فەرمودەکەدا.

## ٧.ڕێگای ناسینی (مُعَلَّلْ) کامەیە؟

ڕێگای ناسینەکەی بریتیە لە کۆکردنەوەی ڕێگاکانی فەرمودەکەو سەیرکردنی ڕیوایەتە جیاجیاکانی، وە بەراورد (موزانە)کردن لە نێوان (ضبط)و ووردەکاری (أتقان)یاندا، پاشان حوکم دان بەسەر ڕیوایەتە عەیبدار (معلولة)ەکەدا.

## ٨.عیللەت تووشی کوێ دەبێت؟

أ.تووشی سەنەد دەبێت، بەزۆری! وە عەیبدار بوون بە (وقف)و (ارسال).

ب.تووشی (متن) دەبێت بەکەمی، وەك ئەو فەرمودەیەی کە نەفی خوێندنی (بسم الله الرحمن الرحيم) دەکات لە نوێژدا.

**٩.ئایا(علة) لەسەنەددا، كاردەكاتە سەر (علة) لە مەتن دا؟**

أ.جار جار كاردەكاتە سەر مەتنەكە، لەگەڵ كاركردنە سەر سەنەدەكە، ئەمەش وەك عەیبدار بوون بە (إرسال).

ب.جاری وا هەیە، كە كاردەكاتە سەر سەنەد –بەتایبەت– وە مەتنەكەیش صەحیحە، وەك فەرمودەكەی (يَعلی بن عُبَيْد) لە (ثوري)و لە (عمرو بن دینار)و لە (إبن عمر)ەوە بە مەرفوعی (البَيِّعانِ بِالخِيارِ) كڕیارو فرۆشیار مافی پەشیمانییان هەیە، جا (یعلی) وەهمی بۆ پەیدابووە، لەسەر (سفیان الثوري) لە سەر گوتەی (عمرو بن دینار)دا، چونكە ئەمە (عبدالله بن دینار)ە، ئەم مەتنە صەحیحە، هەرچەند لە سەنەدەكەدا عەیبی بەهەڵەدا چوون (غلط)ی تیادایە، چونكە هەریەك لە (عمرو) و (عبدالله بن دینار) متمانە دار (ثقة)ن، جا گۆڕینی متمانە پێكراو بە متمانە پێكراوێكی تر زیان ناگەیەنێت، بە صەحیحی مەتنەكە، هەرچەندە سیاقی سەنەدەكەش هەڵەیە.

**١٠.بەناوبانگترین كتێب تیایدا:**

أ.(كتاب العلل)ی (إبن المديني).

ب.(علل الحديث)ی (إبن أبي حاتم).

جـ.(العلل و معرفة الرجال)ی (أحمد بن حنبل).

د.(العلل الكبير) و (العلل الصغير)ی (الترمذي).

و.(العلل الواردة في الأحاديث النبوية)ی (الدار قطني) كە ئەمەیان كۆكەرەوەی هەموویانەو فراوانترینیانە.

## المخالفة للثقات

إذا كان سبب الطعن في الراوي مخالفته للثقات ـ وهو السبب السابع ـ فينتج عن مخالفته للثقات خمسة أنواع من علوم الحديث ، وهي : " المُدْرَج ، والمَقْلوب ، والمَزِيْد في متصل الأسانيد والمُضطِّرِب والمُصَحَّف "

١- فان كانت المخالفة بتغيير سياق الإسناد أو بدمج موقوف بمرفوع فيسمي " المُدْرَج ".

٢-وان كانت المخالفة بتقديم أو تأخير فيسمي " المقلوب ".

٣-وان كانت المخالفة بزيادة راوٍ فيسمي " المزيد في متصل الأسانيد "

٤-وان كانت المخالفة بإبدال راو براو أو بحصول التدافع في المتن ولا مُرَجِّح فيسمي "المُضْطَّرب "

٥-وان كانت المخالفة بتغيير اللفظ مع بقاء السياق فيسمي " المُصَحَّف "[٢٢٣]

وإليك تفصيل البحث فيها على التوالي

## دژایەتی کردنی متمانە پێکراوان (المخالفة للثقات)

ئەگەر هۆکاری تانەدان لەگێڕەرەوە (الطعن في الراوي) دژ بوونەوە بێت لەگەڵ متمانە پێکراوێکدا کە -هۆکاری حەوتەمە- ئەوا لە ئەنجامی ئەم دژایەتی کردنەی متمانە پێکراوان (ثقات)ەدا، پێنج جۆر لە جۆرەکانی زانستی فەرمودە بەرهەم دێت، کە ئەوانیش (المدرج، المقلوب، المزيد في متصل الأسانيد، المضطرب، المصحف)ن.

---

[٢٢٣] انظر النخبة وشرحها ص ٤٨-٤٩ .

١.ئەگەر دژایەتی کردنەکە بەهۆی گۆڕانی سیاقی سەنەدەکەوە بێت، یان بەهۆی بەدەمەوەدانی (موقوف)ێکەوە بێت بە (مرفوع)ێکەوە، ئەوە بە (مدرج) ناو دەبرێ.

٢.ئەگەر دژایەتی کردنەکە بە هۆی پێش خستن یان دواخستن (تقديم و تأخير)ەوە بێت، ئەوە بە (مقلوب) ناوزەد دەکرێت.

٣.وە ئەگەر دژایەتی کردنەکە بەهۆی زیادکردنی ڕاویەکەوە بێت، ئەوە بە(المزيد في متصل الأسانيد) ناودەبرێت.

٤.وە ئەگەر دژایەتی کردنەکەی بەهۆی لەجێ دانانی ڕاوییەك لەجێی ڕاوییەکی تردا بێت، یان بەهۆی شلّەقان لە مەتنەکەدا بێت، و کەچی یەك لاکەرەوە (مرجح)ێکیش نەبێت، ئەوە بە (مضطرب) ناوزەد دەکرێت.

٥.وە ئەگەر دژایەتی کردنەکە بە گۆڕانی لەفزەکە لەگەڵ مانەوەی سیاقەکەدا بێت، ئەوە ناو دەبرێ بە (المصحف)، جا درێژەی ئەم باسەت، بە ڕیزو یەك لەدوای یەك بۆ باس دەکەم.

## المُدْرَج

**١ - تعريفه:**

أ) لغة : اسم مفعول من " أدرجت " الشيء في الشيء ، إذا أدخلته فيه وضمنته إياه

ب) اصطلاحاً: ما غير سياق إسناده، أو أدخل في متنه ما ليس منه بلا فصل.

٢- أقسامه:

المدرج قسمان، مُدْرَج الإسناد، ومُدْرَج المتن.

أ) مدرج الإسناد.

١- تعريفه: هو ما غير سياق إسناده.

٢- من صوره : أن يسوق الراوي الإسناد ، فيعرض له عارض ، فيقول كلاماً من قبل نفسه، فيظن بعض من سمعه أن ذلك الكلام هو متن ذلك الإسناد ، فيرويه عنه كذلك .

٣- مثاله : قصة ثابت بن موسى الزاهد في روايته : " من كثرت صلاته بالليل حَسُنَ وجهه بالنهار [٢٢٤] " وأصل القصة أن ثابت بن موسى دخل على شريك بن عبدالله القاضي وهو يُمْلِي ويقول : " حدثنا الأعمش عن أبي سفيان عن جابر قال : قال رسول الله صلى الله عليه وسلم .... " وسكت ليكتب المُسْتَمْلِي [٢٢٥]، فلما نظر إلى ثابت قال : " من كثرت صلاته بالليل حسن وجهه بالنهار " وقصد بذلك ثابتاً لزهده وورعه، فظن ثابت أنه متن ذلك الإسناد ، فكان يحدث به .

ب) مدرج المتن :

١- تعريفه: ما أُدْخِلَ في متنه ما ليس منه بلا فَصْل.

٢- أقسامه: ثلاثة وهي:

---

[٢٢٤] أخرجه ابن ماجة ـ باب قيام الليل ـ جـ١ ص ٤٢٢ رقم الحديث / ١٣٣٣/ .

[٢٢٥] المستملي هو الذي يبلغ صوته المحدث إذا كثر الطلاب في المجلس .

أ) أن يكون الإدراج في أول الحديث، وهو القليل، لكنه أكثر من وقوعه في وسطه

ب) أن يكون الإدراج في وسط الحديث، وهو أقل من الأول.

ت) أن يكون الإدراج في آخر الحديث ، وهو الغالب .

٣- أمثلة له :

أ) مثال لوقوع الإدراج في أول الحديث : وسببه أن الراوي يقول كلاماً يريد أن يستدل عليه بالحديث فيأتي به بلا فصل ، فيتوهم السامع أن الكل حديث ، مثل " ما رواه الخطيب من رواية أبي قَطَن وشَبَابَةَ ـ فَرَّقَهُما ـ عن شعبة عن محمد بن زياد عن أبي هريرة قال : قال رسول الله صلي الله عليه وسلم : " أَسْبِغوا الوضوء ، ويل للأعقاب من النار " فقوله :"أسبغوا الوضوء " مُدْرَج من كلام أبي هريرة كما بُيِّنَ في رواية البخاري عن آدم عن شعبة عن محمد بن زياد عن أبي هريرة قال : " أسبغوا الوضوء ، فإن أبا القاسم صلى الله عليه وسلم قال : " ويل للأعقاب من النار " .

قال الخطيب : " وهم أبو قَطَنٍ وشَبَابَةٌ في روايتهما له عن شعبة على ما سقناه ، وقد رواه الجَمٌّ الغَفير عنه كرواية آدم " [٢٢٦]

ت) مثال لوقوع الإدراج في وسط الحديث : حديث عائشة في بدء الوحي : " كان النبي صلى الله عليه وسلم يَتَحَنَّثُ في غار حراء ـ وهو التَعَبُّدُ ـ الليالي ذوات العدد "[٢٢٧] فقوله : " وهو التعبد " مدرج من كلام الزهري .

---

[٢٢٦] تدريب الراوي جـ ١ ـ ص ٢٧٠

[٢٢٧] البخاري ـ باب بدء الوحي .

ث) مثال لوقوع الإدراج في آخر الحديث : حديث أبي هريرة مرفوعاً " للعبد المملوك أجران ، والذي نفسي بيده لولا الجهاد في سبيل الله والحج وبِرُّ أمي لأحببت أن أموت وأنا مملوك " [228]

فقوله : " والذي نفسي بيده .... الخ " من كلام أبي هريرة، لأنه يستحيل أن يصدر ذلك منه صلى الله عليه وسلم. لأنه لا يمكن أن يتمنى الرِّقَّ، ولأن أمه لم تكن موجودة حتى يَبَرَّها.

**٣- دواعي الإدراج:**

دواعي الإدراج متعددة أشهرها ما يلي:

أ) بيان حكم شرعي .
ب) استنباط حكم شرعي من الحديث قبل أن يتم الحديث.
ت) شرح لفظ غريب في الحديث .

**٤- كيف يُدْرَك الإدراج ؟**

يُدَرك الإدراج بأمور منها .

أ) وروده منفصلا في رواية أخري .
ب) التنصيص عليه من بعض الأئمة المطلعين .
ت) إقرار الراوي نفسه أنه أدرج هذا الكلام .
ث) استحالة كونه صلي الله عليه وسلم ذلك.

---

[228] البخاري في العنق .

**٥- حكم الإدراج :**

الإدراج حرام بإجماع العلماء من المحدثين والفقهاء وغيرهم ، ويستثني من ذلك ما كان لتفسير غريب ، فانه غير ممنوع ، ولذلك فعله الزهري وغيره من الأئمة .

**٦- أشهر المصنفات فيه :**

أ) " الفَصْلُ للوَصْل المُدْرَج في النَّقْل " للخطيب البغدادي.

ب) " تقريب المَنْهَج بترتيب المُدْرَج " لابن حجر، وهو تلخيص لكتاب الخطيب وزيادة عليه .

## باسی (المُدْرَجْ)

**١.پێناسەکەی:**

**أ.لەڕووی زمانەوانیەوە:**ئیسمی مەفعولە و لە (أَدْرَجْتُ الشئ بالشئ) وەرگیراوە، کە مانای (أدخلته فيه و ضَمَّنْتُهُ أياه)ی هەیە، واتە: کردمە ناویەوەو تێکەڵیم کرد.

**ب.لەڕووی زاراوەوە:**ئەوفەرمودەیەیەکە سیاقی سەنەدەکەی گۆڕدرابێت، یاخود شتێکی وا خرابێتە ناو مەتنەکەیەوە کە سەربەو نەبێت بەبێ جیاکاری.

**٢.بەشەکانی:**

(مدرج) دووبەشە: (مُدرج الإسناد) و (مدرج المتن):

**أ.مدرج الإسناد:** زیادە خستنەناو سەنەدەوە.

**١.پێناسەکەی:**ئەو فەرمودەیە یە کە سیاقی سەنەدەکەی گۆڕا بێت.

**٢.لەم شێوازەیدا:**ئەوەیە کە گێڕەرەوە سەنەدێ بهێنێ جا شتەکی لێ هەلّتۆقێ و قسەیەکی خودی خۆیی تێکەلّ بکات، جا هەندێ لەوانەی کە بیستوویانە وا گومان دەبەن کە ئەو گوتەیە بریتیە لە مەتنی ئەو سەنەدە، جا هەر بەو شێوازە لێوەی ڕیوایەتی دەکات.

**٣.نمونەکەی:**وەك چیرۆکەکەی (ثابت بن موسى الزاهد) کە لە ڕیوایەتەکەیدا هەیە: (من كثرت صلاته بالليل حَسُنَ و جهه بالنهار)[٢٢٩] واتە: ئەوەی بەشەو زۆر شەو نوێژ بکات، لە ڕۆژدا، ڕووی جوانو نورانی دەبێت، کە ئەصلّـی ئەم چیرۆکە ئەوەیە کە (ثابت بن موسى) چووە لای (شريك بن عبدالله القاضي) کاری نووسینی دەکرد —و جا وتی: (أعمش) لە (أبو سفيان) و ئەویش لە (جابر)ەوە بۆی باسکردین کە دەیگوت، کە پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمویەتی: (........وسكت ليكتب المُستملي)، جا بێدەنگ بوو تا (مستملی)، یەکە بینوسێت.

*(مستملی) کەسێکە کە دەنگ دەگەیەنێت، بۆنمونە کە مامۆستا قوتابی زۆر بووە، دەنگی بەهەموویان نەدەگەیشت ئەوا یەکێکیان ئەو دەنگەی دەگەیەنێت– جا کە سەیری (ثابت)ی کرد، وتی: ئەوەی شەو نوێژی زۆر بێت، کە مەبەستی بەمە (ثابت) بوو، لەبەر خاتری زوهدو لەخوا ترسییەکەی، جا (ثابت) وا گومانی برد، کە ئەوە مەتنی ئەو سەنەدەیە، بۆیە باسی کرد، و گێڕایەوە!

**ب.مدرج المتن:**

**١.پێناسەکەی:**ئەو فەرمودەیەیە کە شتێکی وا تێکەلّ بەمەتنەکەی کراوە، کەلەو نییە، بەبێ جیاکردنەوەشی.

---

(٢٢٩) أخرجه أبن ماجة، باب قيام الليل/ ج١ص٤٢٢ رقم الحديث/ ١٣٣٣.

**٢.سێ بەشی هەیە کە ئەمانەن:**

**أ.**دەبێت (أدراج)ەکە لە سەرەتای فەرمودەکەوە بێت، کە ئەمەیان کەمە بەڵام لەو جۆرەی زیاترە کە لەناوەڕاست دەکەوێت..

**ب.**ئەوەیە کە (أدراج)ەکە، بکەوێتە ناوەڕاستی فەرمودەکەوە، کە ئەمەشیان لەیەکەم کەمترە.

**جـ.**ئەمەیە کە (إدراج)ەکە لە کۆتایی فەرمودەکەوە بێت، کە ئەمەیان زۆر ترە.

**٣.نمونە بۆی:**

**أ.نمونە بۆ ڕوودانی (إدراج) لە سەرەتای فەرموودەوە:** هۆکەیشی ئەوەیە کە ڕاوییەکە قسەیەك دەکات، کە دەیەوێت بەفەرمودەیەك بەڵگەداری بکات، جا فەرمودەکە بەبێ جیاکردنەوە لەگەڵ قسەکەدا دەهێنێ، جا گوێگر گومان دەبات، کە هەموو ئەو —دەستەواژەیە— فەرمودەیە، وەك ئەوەی کە (خطیب) دەیگێڕێتەوە لە ڕیوایەتەکەی (أبي قَطَن) و (شَبابة) —فَرَّقَهُما: کە جیای کردونەتەوە— لە (شعبة)ەوە، ئەویش لە (محمد بن زیاد)ەوە، ئەویش لە (ابو هریرة)ەوە، دەڵێت: پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: (أَسبِغوا الوضوء، ویل للأعقاب من النّار) واتە: دەستنوێژ چاك بگرن، هاوار بۆ پاژنە پێیان لە ئاگر!چاك نەشۆردنی پاژنەپێ هۆی چوونە ئاگرە— جا (أسبغوا الوضوء) مودرەجەو قسەی (أبو هریرة)ەیە، هەروەك ڕونكراوەتەوە لە گێڕانەوەکەی (بخاری)یەوە لە (آدم)ەوە، ئەویش لە (شعبة)ەوە، ئەویش لە (محمد بن زیاد) و ئەویش لە (أبو هریرة)، کە دەڵێت: (أسبغوا الوضوء) دەستنوێژ چاك بگرن، چونکە (أبو القاسم: پێغەمبەری خوا (ﷺ) : دەیفەرموو: (ویل للأعقاب من النار).

(خطيب) دەفەرموێ: (أبو قطن و شبابة) بەوەهم و گومان دا چوون، لەریوایەتەکەیاندا، لە (شعبة) بەگوێرەی ئەوەی کە ئێمە کردمان، وە (الجمّ الغفير – ژمارەیەکی زۆر) ریوایەتی یان کردووە، لێیەوە هەروەك ریوایەتەکەی (آدم) [٢٣٠].

**ب.نمونەی روداڵی (إدراج) لە ناوەراستی فەرمودەدا:**

وەك فەرمودەکەی (عائیشە) دەربارەی دەست پـێکردنی سەرەتاکانی وەحییەوە: (كان النبـي (ﷺ) يتحنث في غار حراء –وهو التَّعَبُّد – الليالـي ذوات العدد)[٢٣١] واتە: پێغەمبەر (ﷺ) دەمایەوە لە ئەشکەوتی (حراء)دا، – کە ئەمە پەرستش بوو– کە چەند شەوێکی دەبرد، جا دەستەواژەی (وهو التعبد) مودرەجەو شتێکە تێکەڵ کراوە، و قسەی (الزهری)یە.

**ج.نمونەی روداڵی (إدراج) لە کۆتایی فەرمودەوە:**

وەك فەرمودەکەی (أبو هريرة)کە بەمەرفوعی هاتووە: (للعبد المملوك أجران، و الذي نفسي بيده لولا الجهاد في سبيل الله و الحج و برُّ أمـي لأحببت أن أموت و أنا مملوك)[٢٣٢].

واتە: عەبدێکی (فرۆشراو) کە بووە تە ماڵـی کەسێك دوو پاداشتی بۆ هەیە، سوێند بەوەی گیانی منی بەدەستە، ئەگەر جیهادو حەج و چاکە لەگەڵ دایکدا نەبوایە، پێم خۆشبوو کاتێ دەمرم، موڵکی کەسێ بومایەو بەندە بوومایە، جا (و الذي نفسي بيده...الخ) لە قسەی (أبو هريرة)ەیە،چونکە

---

(٢٣٠) تدريب الرّاوي ج١/ ص٢٧٠.
(٢٣١) البخاري – باب بدء الوحي.
(٢٣٢) البخاري في العتق.

ئەوە دووره لە پێغەمبەرەوە(ﷺ) چونکە ئەوە نابێت، کە پێغەمبەر (ﷺ) ئاواتی کۆیلەیەتی بخوازێ، لەو کاتەشدا پێغەمبەر (ﷺ) دایکی نەما بوو، تاچاکەی لەگەڵ بکات.

**٣.هۆکارەکانی (إدراج): هۆکارەکانی (إدراج) زۆرن، بەناوبانگترینیان ئەمانەن:**

أ.ڕونکردنەوەی حوکمێکی شەرعی.

ب.دەرهێنانی حوکمێکی شەرعی لە فەرموودەکەوە پێش ئەوەی فەرمودەکە تەواو بکات.

ج.ڕونکردنەوەی وشەیەکی نامۆ (غریب) لە فەرمودەکەدا.

**٤.چۆن هەست بە (إدراج) دەکرێت؟**

(إدراج) هەستی پێ دەکرێت بە یەکێ لەم شتانە:

أ.هاتنی بە جیاکراوەیی لە ڕیوایەتێکی تردا.

ب.هاتنی دەقی قسەیەکی پێشەوایانی ئاگادار لەسەری.

ج.دان پێداهێنانی خودی گێڕەرەوە لەسەر ئەوەی کە قسەیەکی (إدراج) کردووە لەو فەرمودەیەدا.

د.دوور بوون و (مستحیل)بوونی ئەوەی کە پێغەمبەر (ﷺ) شتی وا بفەرموێت.

**٥.حوکمی (إدراج):**

(إدراج) قێزەونە بە کۆڕای زانایانی فەرموده ناس و شەرعزانو...هتد، جگە لەوەی کە بۆ لێکدانەوەی وشەیەکی نامۆ بێت، ئەمەیان قەدەغە نییە، هەربۆیەش (زهری)و...هی تریش لە پێشەوایان کردوویانە.

**٦.بەناوبانگ ترین کتێب لەم بارەیەوە:**

أ.(الفَصْلُ لِلوَصْل المُدْرَجُ في النَّقْل) كه دانراوى (خطيب البغدادي)يه.

ب.(تقريب المنهج بترتيب المدرج)،كه دانراوى (إبن حجر)ە، كه پوختەى كتێبەكەى (خطيب)ە و زيادەيشى لەسەر نوسيوە.

## المَقلوب

**١- تعريفه:**

أ) لغة: هو اسم مفعول من " القَلْب " وهو تحويل الشيء عن وجهه[٢٣٣]

ب) اصطلاحاً: إبدال لفظ بآخر في سند الحديث أو متنه، بتقديم أو تأخير ونحوه.

**٢- أقسامه:**

ينقسم المقلوب إلى قسمين رئيسيين هما:

مقلوب السند، ومقلوب المتن.

أ) مقلوب السند : وهو ما وقع الإبدال في سنده ، وله صورتان .

١- أن يُقَدِّم الراوي ويؤخر في اسم أحد الرواة واسم أبيه ، كحديث مروي عن " كعب بن مُرَّة " فيرويه الراوي عن " مُرَّة بن كعب " .

٢- أن يُبْدِل الراوي شخصاً بآخر بقصد الإغراب : كحديث مشهور عن " سالم " فيجعله الراوي عن " نافع "

---

[٢٣٣] انظر القاموس جـ ١ ـ ص ١٢٣ .

وممن كان يفعل ذلك من الرواة " حماد بن عمرو النصيبي " وهذا مثاله : حديث رواه حماد النصيبي عن الأعمش عن أبي صالح عن أبي هريرة مرفوعاً : " إذا لقيتم المشركين في طريق فلا تبدءوهم بالسلام " فهذا حديث مقلوب ، قلبه حماد ، فجعله عن الأعمش ، وإنما هو معروف عن سهيل بن أبي صالح عن أبيه عن أبي هريرة . هكذا أخرجه مسلم في صحيحه.

وهذا النوع من القلب هو الذي يُطْلَق على راويه أنه يسرق الحديث .

ب) مقلوب المتن: وهو ما وقع الإبدال في متنه، وله صورتان أيضاً.

١- أن يُقَدِّم الراوي ويؤخر في بعض متن الحديث

ومثاله : حديث أبي هريرة عند مسلم في السبعة الذين يظلهم الله في ظله يوم لا ظل إلا ظله، ففيه " ورجل تصدق بصدقة فأخفاها حتى لا تعلم يمينه ما تنفق شماله " فهذا مما انقلب على بعض الرواة وإنما هو : " حتى لا تعلم شماله ما تنفق يمينه " [٢٣٤] .

٢- أن يَجعل الراوي متن هذا الحديث على إسناد آخر، ويجعل إسناده لمتن آخر، وذلك بقصد الامتحان وغيره.

مثاله : ما فعل أهل بغداد مع الإمام البخاري ، إذ قلبوا له مائة حديث ، وسألوه عنها امتحاناً لحفظه ، فرَدَّها على ما كانت عليه قبل القلب ، ولم يخطئ في واحد منها [٢٣٥]

---

[٢٣٤] البخاري في الجماعة ، ومسلم في الزكاة ـ باب فضل إخفاء الصدقة حـ٧ ـ ص ١٢٠ من شرح النووي على مسلم ، ومالك في الموطأ ـ كتاب الشعر باب ما جاء في المتحابين في الله ، جـ٢ ـ ٩٥٢ .

[٢٣٥] انظر تفاصيل القصة في تاريخ بغداد جـ٢ ـ ص ٢٠

### ٣- الأسباب الحاملة على القَلْب :

تختلف الأسباب التي تحمل بعض الرواة على القلب، وهذه الأسباب هي:

أ) قصد الإغراب ليرغب الناس في رواية حديثه والأخذ عنه .

ب) قصد الامتحان والتأكد من حفظ المحدث وتمام ضبطه .

ج)الوقوع في الخطأ والغلط من غير قصد .

### ٤- حكم القلب :

أ) إن كان القلب بقصد الإغراب فلا شك في أنه لا يجوز لأن فيه تغييراً للحديث ، وهذا من عمل الوضاعين .

ب) وإن كان بقصد الامتحان، فهو جائز للتثبت من حفظ المحدث وأهليته، وهذا بشرط أن يُبَيَّنَ الصحيح قبل انفضاض المجلس.

ج) وان كان عن خطأ وسهو ، فلا شك أن فاعله معذور في خطئه ، لكن إذا كثر ذلك منه فانه يُخِلُّ بضبطه ، ويجعله ضعيفاً .

أما الحديث المقلوب فهو من أنواع الضعيف المردود كما هو معلوم.

### ٥- أشهر المصنفات فيه :

أ) كتاب "رافع الارتياب في المقلوب من الأسماء والألقاب " للخطيب البغدادي، والظاهر من اسم الكتاب أنه خاص بقسم المقلوب الواقع في السند فقط.

## فەرمودەی وەرگەڕاو ( المقلوب )

### ١. پێناسەکەی:

**أ.لەڕووی زمانەوانیەوە:** ئیسمی مەفعولە ولە (القلب)ەوە، وەرگیراوە کە بریتیە لە (گۆڕینی شتێك لەو ڕووەی کە لە سەریەتی (تحویل الشئ عن وجه)[٢٣٦].

**ب.لەڕووی زاراوەوە:** بریتیە لە جێ گۆڕکێ پێکردنی ووشەیەك (لفظ)ێك، بە یەکێکی تر، لە سەنەد یاخود مەتنی فەرمودەکەدا، بە پێشخستن یاخود دواخستنیان ...هتد.

### ٢.بەشەکانی:

فەرمودەی (مقلوب) دەبێتە دووبەشی سەرەکییەوە:

(مقلوب السند)، (مقلوب المتن).

**أ.سەنەدی هەڵگێردراوە: (مقلوب السند):**

ئەو فەرمودەیە یە کە هەڵ گەڕانەکە لەسەنەدەکەیدا ڕووی دابێت، وە دوو شێوازی هەیە:

١.ئەوە یە کە ڕاوییەکە ناوی یەکێك لە ڕاوییەکانو ناوی باوکی ئەو ڕاویە پێش و دوای پێ بکات، وەك ئەو فەرمودەی لە (کعب بن مرة) ڕیوایەت بکرێت،کە چی گێڕەرەوە بە (مُرَّة بن کعب) بیگێڕێتەوە.

٢.ئەوەیە کە گێڕەرەوە (الراوی) کەسێك بگۆڕێت بەکەسێکی تر

---

(٢٣٦) القاموس ج١/ ١٢٣.

بمەبەستی نامۆ بوون، بایەخدارکردن، و —سەرسوڕمان— (ألأغراب)،وەك فەرمودەی ناسراوی —گێڕدراوە—لە (سالم)ەوە، بکات، بە (نافع).

وە لەو ڕاوی یانەی کە لەم جۆرەکارانەی دەکەن، (حماد بن عمرو النصیبی) کە ئەمە نمونەکەیەتی:فەرموودەیەك کە (حماد النصیبی) لە (ألأعمش)وە ئەویش لە (أبی صالح) و ئەویش لە (ابو هریرة)ەوە، بەمەرفوعی ڕیوایەتی دەکات: (إذا لقيتم المشركين في طريق فلا تبدءوهم بالسلام) ئەگەر لە ڕێگادا بەهاوەڵ پەیداکەران گەیشتن لەپێشیانەوە سەلام مەکەن) واتە: (بالە پێشدا ئەوان سەلامتان لـێ بکەن) ئەمە فەرمودەیەکی وەرگەڕاوە (مقلوب)ە، کە (حَمَاد) هەڵـیگێڕاوەتەوە،و کردوویەتی بە (أعمش) دەنا ئەمە فەرمودەیەکی ناسراوە (معروف)ە.

لە (سهیل بن أبی صالح) و ئەویش لە باوکییەوە، ئەویش لە (أبو هریرة)ەوەیە، هەر بەم شێوازەش (مسلم) لە صەحیحەکەیدا هێناویەتی.

ئەم جۆرە (قلب)ــە، ئەوەیە کە گێڕەرەوەکەی بەوەناوزەد دەکرێ، کە (أنه یسرق الحدیث — فەرمودە دەدزێت).

ب.مەتنی هەڵگێڕدراوە (مقلوب المتن): ئەو فەرموودەیە کە جێگۆڕکـێ پـێکردن لە مەتنەکەی دا ڕوودات، ئەویش دیسانەوە دوو شێوازی هەیە:

١.ئەوەیە کە ڕاوی هەندێ لە مەتنی فەرمودەکە پێش‌و دوا پـێ بکات. بۆ نمونە:ئەو فەرمودەیەی (أبو هریرة)ەیە، کە لەلای (إمام مسلم)ە، دەربارەی ئەو حەوت کەسەی کە خوای گەورە لە ژێر سێبەری ڕەحمی خۆیدا جێیان دەکاتەوە، لەو ڕۆژەدا کە هیچ سێبەرێ نییە، جگە لە سێبەری ڕەحمی خودا، جا ئەم بڕگەیەی تیادایە: (ورجل تصدق بصدقة فأخفاها حتى لا تعلم يمينه ماتنفق شماله).

**یەکێ**: لەوانە کەسێکە کە خێرێك بکات، هێندە بەنهێنی بیکات، تا کە دەستی ڕاستی بەو خێرە نەزانێت کە بەدەستی چەپی کردویەتی، ئەمە لەلای هەندێ لە ڕاوییەکان (وەرگەڕان — قلب)ی بەسەردا هاتووە، کە ئەویش لەوەدایە (حتی لا تعلم شماله ماتنفق یمینه)[٢٣٧]،واتە: (شمالە)، (یمینە) یان جێگۆڕکێ پێ کردووە..

٢.ئەوەیە کە گێڕەرەوی مەتنی ئەو فەرمودەیە بەسەنەدێکی تر بیهێنــێ، وە سەنەدی ئەم بۆ مەتنێکی تر بەکاربهێنــێ، واتە (جێگۆڕکێیان پــێ بکات) ئەمەش بەمەبەستی تاقیکردنەوەو شتی تر، وەك ئەوەی کە خەڵکی بەغداد کردیان لە (إمام بخاری) کە (١٠٠) فەرمودەیان بۆ هەڵەو گەڕاو کردەوە، وە بۆ تاقیکردنەوەی هێزی لەبەرکردنی پرسیاریان لــێ کرد، جا بەرپەرچی دانەوەو بەو شێوەیەی کردنەوە کە پێش وەرگەڕانەکە بوون، وە لەهیچ کامیاندا هەڵەی نەکرد[٢٣٨].

**٣.ئەو هۆ کارانەی دەبنە هۆی (قلب) کردن:**

ئەو هۆکارانەی کە هەندی ڕاوی تووشی (قلب) کردن دەکەن، جیاوازن، کە ئەمانەن:

**أ.بەمەبەستی هاندان‌وسەرسوڕماندن(ألأغراب):** بۆ ئەوەی خەڵکی هان بدات و ڕەغبەت پەیدابکەن لە ڕیوایەت کردن‌و وەرگرتنی فەرمودەکەدا.

---

(٢٣٧) البخاري في الجماعة و مسلم في الزكاة، بـاب فضـل أخفـاء الصـدقة ج٧/ ص١٢٠ مـن شرح النواوي على مسلم، و مالك في الموطأ — كتاب الشـعر- بـاب ماجـاء في المتحـابين في الله ج٢/ ٩٥٢.

(٢٣٨) تفاصيل القصة في تأريخ بغداد ج٢/ص٢٠.

ب.بەمەبەستی تاقیکردنەوەو جەخت کردنەوە لەسەر هێزی لەبەرکردنی فەرمودە ناسەکەو کاملـی (ضبط)ەکەی.

ج.کەوتنە ناو هەڵەو (غلط)ی بـێ مەبەست.

## ٤.حوکمی (قلب)کردن:

أ.ئەگەر ئەو قەلب کردنە بەمەبەستی ڕەغبەت پـێ پەیداکردنی بێت، گومانی تیادا نییە کە دروست نییە، چونکە گۆڕینی فەرمودەی تیادایە، ئەمەش کاری هەڵەبەستەرانی فەرموودە (الوضاعین)ە.

ب.وە ئەگەر بەمەبەستی تاقیکردنەوە بێت، ئەوە دروستە بۆ (ثابت)کردنی هێزی لەبەرکردنی فەرمودە ناسانو (ثابت)کردنی ئەوەش کە ئەهلـی ئەم زانستەیە، ئەمەش بەو مەرجە کە حاڵەتە سەحیحەکە دەربخات پێش شێواندنو هەڵسان لە مەجلیسەکەدا.

ج.وە ئەگەر لە ڕێی هەڵەو لـێ تێکچوونەوە بوو، گومانی تیادا نییە، کە بکەرەکەی عوزرداره لەو هەڵەیەیدا، بەڵام ئەگەر ئەم هەڵەیەی لـێ زۆر بوو، ئەوە لە پلەی (ضبط)ەکەی کەم دەکاتەوەو پاشان بەلاواز (ضعیف) دادەنرێ.

بەڵام فەرمودەی هەڵگەڕاوە (مقلوب) لە جۆرەکانی لاواز (ضعیف)ەو ڕەدکراوەیە، هەروەك زانراوە.

## ٥.بەناو بانگترین کتێب لەم بابەتەدا:

أ.کتێبی (رافع ألأرتياب في المقلوب من ألأسماء و ألألقاب)ی(الخطیب البغدادي)یە، بەڵام بەڕوکەشی ناوی کتێبەکەدا وا دەردەکەوێ کە تایبەتە بە تەنها بەشی (مقلوب) لە سەنەددا.

## المَزِيد في مُتَّصِلِ الأسانيد

**١ – تعريفه:**

أ) لغة: المزيد اسم مفعول من " الزيادة ". والمتصل ضد المنقطع ، والأسانيد جمع إسناد .

ب) اصطلاحاً : زيادة راوٍ في أثناء سند ظاهره الاتصال .

**٢ – مثاله:**

ما روي ابن المبارك قال : حدثنا سفيان عن عبد الرحمن بن يزيد ، حدثني بُسْر بن عُبيد الله، قال سمعت أبا إدريس قال سمعت واثلة يقول سمعت أبا مَرْثد يقول سمعت رسول الله صلى الله عليه وسلم يقول : " لا تجلسوا على القبور ولا تُصَلّوا إليها " [٢٣٩]

**٣ – الزيادة في هذا المثال :**

الزيادة في هذا المثال في موضعين ، الموضع الأول في لفظ " سفيان " والموضع الثاني في لفظ " أبا إدريس " وسبب الزيادة في الموضعين هو الوهم .

أ) أما زيادة " سفيان " فوهم ممن دون ابن المبارك ، لأن عدداً من الثقات رووا الحديث عن ابن المبارك عن عبد الرحمن بن يزيد ، ومنهم من صرح فيه بالإخْبار.

[٢٣٩] رواه مسلم ـ كتاب الجنائز جـ٧ ـ ص ٣٨ والترمذي جـ٣ ـ ص ٣٦٧ كلاهما بزيادة أبي ادريس وحذفها .

ب) وأما الزيادة " أبا إدريس " فوهم من ابن المبارك ، لأن عدداً من الثقات رووا الحديث عن عبد الرحمن بن يزيد فلم يذكروا أبا إدريس، ومنهم من صرح بسماع بُسْر من واثلة.

**٤- شروط رد الزيادة:**

يشترط لِرَدِّ الزيادة واعتبارها وهماً ممن زادها شرطان وهما:

أ) أن يكون من لم يزدها أتقن ممن زادها .

ب) أن يقع التصريح بالسماع في موضع الزيادة .

فان اختل الشرطان أو واحد منهما ترجحت الزيادة وقُبِلَتْ ، واعتبر الإسناد الخالي من تلك الزيادة منقطعاً ، لكن انقطاعه خَفِيٌّ وهو الذي يسمى " المرسل الخفي " .

**٥- الاعتراضات الواردة على ادِّعاء وقوع الزيادة :**

يُعْتَرَض على ادعاء وقوع الزيادة باعتراضين هما

أ) إن كان الإسناد الخالي عن الزيادة بحرف "عن "في موضع الزيادة، فينبغي أن يُجْعَل منطقاً.

ب) وان كان مصرَّحا فيه بالسماع، أُحتُمِل أن يكون سَمِعَهُ من رجل عن أولاً، ثم سمعه منه مباشرة، ويمكن أن يُجاب عن ذلك بما يلي:

أ) أما الاعتراض الأول فهو كما قال المعترض.

ب) وأما الاعتراض الثاني، فالاحتمال المذكور فيه ممكن لكن العلماء لا يحكمون على الزيادة بأنها وهم إلا مع قرينة تدل على ذلك.

**٦- أشهر المصنفات فيه :**

كتاب " تمييز المزيد في متصل الأسانيد " للخطيب البغدادي.

## باسی زیادەلەسەنەدی پەیوەست دا

## (المزيد في متصل الأسانيد)

### ١.پێناسەکەی:

**أ.لەڕووی زمانەوە:**(المزيد – زیادکراوە) ئیسمی مەفعولەو لە (الزيادة)ەوە هاتووە، وە (المتصل – پەیوەست) دژی (المنقطع – پچڕاو)ە، وە (ألأسانيد – سەنەدەکان) کۆی (سند)ـە.

**ب.لـەڕووی زاراوەوە:** زیـادکردنی گێـڕەرەوە (الراوي)یەکـە، لـەدەقی سەنەدێکدا کە بە ڕووکەش (ظاهراً) پەیوەستە و موتتەصیلە.

### ٢.نمونەکەی:

وەك ئەوەی کە (إبن المبارك) ڕیوایەتی دەکاتو دەڵێت: (سفيان) بۆی گێڕاینەوە لە (عبدالرحمن بن يزيد) ئەویش لە (بسر بن عبيدالله) کە دەڵێت: لە (أبو إدريس)م بیست، و ئەویش دەڵـێ لە (واثله)م بیست کە دەیگوت: لە (ابو مرثد)م بیستووە، دەیگوت بیستومە لە پێغەمبەری خواوە (ﷺ) کە دەیفەرموو: (لاتجلسوا على القبور و لاتُصَلّوا إليها)[٢٤٠] واتە: لەسەر گۆڕ دامەنیشن و بەرامبەری نوێژ مەکەن.

### ٣.زیادەکە لەم نمونەیەدا:

زیادییەکە لەم نمونەیەدا لە دوو جێگاوەیە، جێگای یەکەم لە لەفزی (سفيان)دایەو جێگای دووەم لە لەفزی (أبا أدريس) دایە، وە هۆی زیادەکەش لەم دوو جێگایەدا بریتیە لە گومان (وهم).

---

(٢٤٠) رواه مسلم – كتاب الجنائز– ج٧/ص٣٨، والترمذي ج٣/ص٣٦٧ كلاهما بزيـادة أبـي أدريس و حذفها.

أ.بەڵام زیادەی (سفیان) ئەوە خەتای وەهمەکە لە خوار (إبن المبارك)ەوەیە.

چونکە ژمارەیەك لە متمانە پێکراوان (الثقات)، ئەو فەرمودەیەیان لە (إبن المبارك)ەوەو ئەویش لە (عبدالرحمن بن یزید)ەوە، ڕیوایەتی کردووە، وە هەندێکیشیان بەڕاستەوخۆی وەرگرتنی خەبەرەکە (التصریح باختبار)، دەرکاندوویانە.

ب.بەڵام زیادەی (أبو إدریس) خەتاو وەهمەکە لە خودی (إبن المبارك)ەوەیە، چونکە ژمارەیەك لە متمانە پێکراوان (الثقات) ئەو فەرمودەیە یان لە (عبدالرحمن بن یزید)ـە، وە ڕیوایەت کردووەو ناوی (أبو إدریس)یان نەهێناوە، وە هەندێکیشیان تەصریحی بیستنی (بُسر) یان لە (واثلە)ە وە ، داوە.

## ٤.مەرجەکانی بەرپەرچ دانەوەی زیادە:

بۆ بەرپەرچ دانەوەی زیادەو دانانی بە وەهم و خەتا بەمەرج گیراوە، لەسەر ئەوانەی کە زیادەکە دەکەن، دوو مەرج:

أ.دەبێت ئەوەی کە زیادەکەی نەکردووە، وردتر (متقن) تربێت لەوەی کە زیادەکەی کردووە.

ب.دەبێت تەصریح بدرێت، لەسەر بیستنی ئەو شتە لە جێگای زیادەکەدا.

ئەگەر ئەم دوومەرجە یان یەکێکیانی تیادا نەبوو، ئەوە زیادە کە تەرجیح دەدرێت و وەردەگیرێ، سەنەدی خاڵــی لەو زیادەیە بە (منقطع)دا دەنرێ، بەڵام (إنقطا ع)ەکەی خەفی یە، کە ئەمەش ئەوەیە کە پێی دەوترێ (المرسل الخفی).

**٥.ئەو ڕەخنانەی کە هاتوون لەسەر ڕودانی زیادە دووانن:**

**أ.**ئەگەر سەنەدەکە خاڵی بوو لە زیادکردن بەپێتی (عن) لە مۆڵگای زیادەکەدا ئەوە پێویستە کە بکرێتە (منقطع).

**ب.**ئەگەر تەصریحی بیستن (سماع)ی تیادا درابوو، ئەوە چاوەڕێی ئەوەی لێدەکرێ کە بیستبێتی لە پیاوێکەوە هەر لە سەرەتاوە، پاشان بەڕاستەوخۆیی لێوەی بیستبێ، دەکرێ، وەڵامی ئەمە بدرێتەوە بەم جۆرەی خوارەوە:

**أ.ڕەخنەی یەکەم:**ئەوە لە جێی خۆیدایە.

**ب.بەڵام ڕەخنەی دووەم:** ئەو ئیحتیمالەی باس کرا تیایدا بۆی هەیە ڕووبدات، بەڵام زانایان حوکم نادەن بەسەر زیادەکەدا بەوەی کە وەهمی تیادایە، مەگەر لەگەڵ بوونی نیشانەیەك (قرينة)یەك لەسەری.

**٦.بەناوبانگ ترین دانراو تیایدا:**

*کتێبی (تمييز المزيد في متصل الأسانيد)، دانراوی (خطيب البغدادي).

## المُضْطَّرِب

**١ – تعريفه:**

أ) لغة: هو اسم فاعل من " الاضطراب " وهو اختلال الأمر وفساد نظامه، وأصله من اضطراب الموج ، إذا كثرت حركته وضرب بعضه بعضاً .

ب) اصطلاحاً: ما رُوِيَ على أَوْجُهٍ مختلفة متساوية في القوة.

**٢- شرح التعريف :**

أي هو الحديث الذي يُرْوَي على أشكال متعارضة متدافعة، بحيث لا يمكن التوفيق بينها أبداً، وتكون جميع تلك الروايات متساوية في القوة من جميع الوجوه، بحيث لا يمكن ترجيح أحدهما على الأخرى بوجه من وجوه الترجيح.

**٣- شروط تحقق الاضطراب:**

يتبين من النظر في تعريف المضطرب وشرحه أنه لا يسمي الحديث مضطرباً إلا إذا تحقق فيه شرطان وهما:

أ) اختلاف روايات الحديث بحيث لا يمكن الجمع بينهما.

ب) تساوي الروايات في القوة بحيث لا يمكن ترجيح رواية على أخري .

أما إذا ترجحت إحدى الروايات على الأخرى، أو أمكن الجمع بينها بشكل مقبول فان صفة الاضطراب. تزول عن الحديث، ونعمل بالرواية الراجحة في حالة الترجيح ، أو نعمل بجميع الروايات في حالة إمكان الجمع بينها .

**٤- أقسامه:**

ينقسم المضطرب بحسب موقع الاضطراب فيه إلى قسمين مضطرب السند ومضطرب المتن، ووقوع الاضطراب في السند أكثر .

أ) مضطرب السند : ومثاله : حديث أبي بكر رضي الله عنه أنه قال : يا رسول الله أَرَاكَ شِبْتَ ، قال " شَيَّبَتْنِي هُوْدٌ وأخواتها " [٢٤١]

[٢٤١] رواه الترمذي ـ كتاب التفسير ـ تفسير سورة الواقعة جـ٩ ـ ص ١٨٤ مع شرح التحفة ، لكن رواه بلفظ " شيبتني هود والواقعة والمرسلات ...... الحديث " وقال عنه " حسن غريب ".

**٦.پێگەکانی (موقوف) و (مقطوع):**

**واته:**ئەو کتێبانەی کە فەرمودەی (موقوف)و (مقطوع)یان تیادا زۆره، و دەست دەکەوێت.

**أ.**مصنف إبن ابي شيبة.

**ب.**مصنف عبد الرزاق.

**جـ.**تەفسیرەکانی (إبن جرير)و (إبن ابي حاتم)و (إبن منذر).

# المبْحَثُ الثَاني

# أنواع أخري مشتركة بين المقبول والمردود

## المُسْنَد

**١ – تعريفه:**

أ) لغة: اسم مفعول من " أَسْنَدَ " بمعنى أضاف، أو نَسَبَ

ب) اصطلاحاً: ما اتصل سنده مرفوعاً إلى النبي صلي الله عليه وسلم [٢٨٥]

**٢ – مثاله:**

ما أخرجه البخاري قال : " حدثنا عبدالله بن يوسف عن مالك عن أبي الزناد عن الأعرج عن أبي هريرة قال : أن رسول الله صلي الله عليه وسلم قال : إذا شرب الكلب في إناء أحدكم فليغسله سبعاً "[٢٨٦]

فهذا حديث اتصل سنده من أوله إلى منتهاه، وهو مرفوع إلى النبي صلي الله عليه وسلم.

---

[٢٨٥] هذا التعريف هو الذي قطع به الحاكم ، وجزم به ابن حجر في النخبة وهناك تعريفات أخري للمسند .

[٢٨٦] البخاري جـ١ ص ٤٧ .

# باسی دووەم

چەند جۆرێکی جیاجیای هاوبەش

– لە نێوان وەرگرتن‌و بەرپەرچ دانەوە دا –

## فەرموودەی ( مُسْنَد )

**١.پێناسەکەی:**

**أ.لەڕووی زاراوەوە:** ئیسمی مەفعولەو لە (أسند)ەوە هاتووە... کە بەمانای (درانە پاڵ‌و ئاماژە بۆدان) (أضاف أو نَسبَ) هاتووە.

**ب.لەڕووی زاراوەوە:** ئەو فەرمودەیە یە کەسەنەدەکەی بەپەیوەستی بێت‌و بەرزکرابێتەوە بۆ لای پێغەمبەر (ﷺ)[٢٨٧].

**٢.نمونەکەی:**

وەك ئەوەی کە (البخاری) هێناویەتی، دەڵێت: (عبدالله بن یوسف) لە (مالك) و ئەویش لە (ابو الزناد)و ئەویش لە (ألأعرج)و ئەویش لە (أبو هريرة) پێمانی گووتوە: کە پێغەمبەر (ﷺ) فەرمویەتی: (إذا شرب الكلب في أناء أحدكم فليغسله سبعاً[٢٨٨] – واتە: ئەگەر سەگێك لە قاپێکتاندا ئاوی خواردەوە، ئەوا حەوت جار بیشۆن).

ئەم فەرمودەیە کەسەنەدەکەی هەر لەسەرەتاوە بۆ کۆتاییەکەی پەیوەستەو بەرزیش کراوەتەوە بۆ لای پێغەمبەر (ﷺ).

---

([٢٨٧]) ئەم پێناسەیە ئەوەیە کە (حاکم) لەسەریەتی‌و (ابن حجر) لە (نخبة الفكر)دا دانی پێداناوە، وە لێرەدا چەند پێناسەیەکی تر بۆ (مسند) هەیە.

([٢٨٨]) البخاري ج١/ ٤٧

## المُتَصِل

**١- تعريفه:**

أ) لغة: اسم فاعل من " اتَّصَل " ضده " انْقَطَعَ " ويسمى هذا النوع بـ " الموصول " أيضاً.

ب) اصطلاحاً: ما اتصل سنده مرفوعاً كان أو موقوفاً.

**٢- مثاله:**

أ) مثال المتصل المرفوع : " مالك عن ابن شهاب عن سالم بن عبدالله عن أبيه عن رسول الله صلي الله عليه وسلم أنه قال : كذا ....... "

ب) مثال المتصل الموقوف : " مالك عن نافع عن ابن عمر أنه قال كذا ..... "

**٣- هل يسمى قول التابعي متصلا ؟**

قال العراقي : " وأما أقوال التابعين ـ إذا اتصلت الأسانيد إليهم ـ فلا يسمونها متصلة في حالة الإطلاق ، أما مع التقييد فجائز ، وواقع في كلامهم ، كقولهم هذا متصل إلى سعيد بن المسيب أو إلى الزهري أو إلى مالك ونحو ذلك ، قيل والنكتة في ذلك أنها تسمي " مقاطيع " فإطلاق المتصل عليها كالوصف لشيء واحد بمتضادين لغة " .

## فەرموودەی پەیوەست ( المتصل )

### ١.پێناسەکەی:

أ.لەڕووی زمانەوە:ئیسمی فاعیلە، و لە -(أتَّصل) پەیوەست بوو- هاتووەو دژی (أنقطع – پچڕا)وەیە، ئەم جۆرە بە (موصول)یش ناوزەد کراوە.

ب.لەڕووی زاراوەوە:ئەو فەرموودەیە یە کە سەنەدەکەی پەیوەست بێت ئیتر (مرفوع)بێت یان (موقوف).

### ٢.نموونەکەی:

أ.نمونەی (المتّصل المرفوع) وەك ئەوەی (مالك) لە (إبن شهاب)ەوە ئەویش لە (سالم بن عبدالله) ئەویش لە باوکیەوە ئەویش لە پێغەمبەرەوە (ﷺ) بەوەی کە فلاّن شتی فەرمووە.

ب.نمونەی (المتصل الموقوف): وەك ئەوەی کە (مالك) لە (نافع) لە (إبن عمر)ەوە، کە فلاّن شتی فەرمووە.

### ٣.ئایا گوتەی (تابعی) بە (متصل) ناودەبرێت؟

(الإمام العراقي) دەڵێت: بەڵام گوتەی تابعییەکان – ئەگەر سەنەدەکەیان پەیوەست بوو تالای ئەوان– ئەوا (إطلاقاً) بە پەیوەست دانانرێ، بەڵام لەگەڵ پەیوەست کردن (تقييد)دا دروستە، وە واقعی ئەو گوتەیەیان کە دەڵێت: (هذا متصل إلى سعيد بن المسيب أو إلى الزهري أو إلى مالك و نحو ذلك– ئەو فەرمودەیە پەیوەستە تالای (سعید بن مسیب) یان تالای (الزهری) یان تالای (مالك)و وێنەی ئەمانە.

گوتراوە خاڵێك لێرەدا هەیە، ئەویش ئەوەیە کە ئەمانەن بە (مقاطيع) ناو دەبرێن، وە بڕینی ناوی (متصل) بە سەریاندا، وەك وەصفێك وایە بۆ تەنها شتێك کە لە کاتێکا لە ڕووی زمانەوە دژ یەکن.

## زيادات الثقات

### ١- المراد بزيادات الثقات :

الزيادات جمع زيادة ، والثقات جمع ثقة ، والثقة هو العدل الضابط ، والمراد بزيادة الثقة ما نراه زائداً من الألفاظ في رواية بعض الثقات لحديث ما عما رواه الثقات الآخرون لذلك الحديث.

### ٢- أشهر من اعتنى بها :

هذه الزيادات من بعض الثقات في بعض الأحاديث لفتت أنظار العلماء ، فتتبعوها واعتنوا بجمعها ومعرفتها ، وممن اشتهر بذلك الأئمة :

أ) أبو بكر عبدالله بن محمد بن زياد النيسابوري .
ب) أبو نُعَيم الجُرْجَاني .
ت) أبو الوليد حسان بن محمد القرشي .

### ٣- مكان وقوعها:

أ) في المتن: بزيادة كلمة أو جملة.
ب) في الإسناد: برفع موقوف، أو وصل مرسل.

### ٤- حكم الزيادة في المتن :

أما الزيادة في المتن فقد اختلف العلماء في حكمها على أقوال:

أ) فمنهم من قبلها مطلقاً .

ب) ومنهم من ردها مطلقاً .

ج) ومنهم من رد الزيادة من راوي الحديث الذي رواه أولاً بغير زيادة، وقبلها من غيره.[٢٨٩]

وقد قسم ابن الصلاح الزيادة بحسب قبولها وردها إلى ثلاثة أقسام ، وهو تقسيم حسن ، وافقه عليه النووي وغيره ، وهذا التقسيم هو :

أ) زيادة ليس فيها منافاة لما رواه الثقات أو الأوثق ، فهذه حكمها القبول ، لأنها كحديث تفرد برواية جملته ثقة من الثقات .

ب) زيادة منافية لما رواه الثقات أو الأوثق فهذه حكمها الرد ، كما سبق في الشاذ.

ت) زيادة فيها نوع منافاة لما رواه الثقات أو الأوثق وتنحصر هذه المنافاة في أمرين .

١ – تقييد المطلق.

٢ – تخصيص العام.

وهذا القسم سكت عن حكمه ابن الصلاح ،وقال عنه النووي : " والصحيح قبول هذا الأخير"[٢٩٠]

**٥– أمثلة للزيادة في المتن :**

أ) مثال للزيادة التي ليس فيها منافاة : ما رواه مسلم [٢٩١]من طريق على بن مُسْهِر عن الأعمش عن أبي رَزين وأبي صالح عن أبي هريرة رضي الله عنه من

---

[٢٨٩]انظر علوم الحديث ص ٧٧ والكفاية ص ٤٢٤ وما بعدها .

[٢٩٠]انظر التقريب مع التدريب جـ١ ـ ص ٢٤٧ ، هذا ومذهب الشافعي ومالك قبول هذا النوع من الزيادة ومذهب الحنفية رده .

زيادة كلمة " فلْيُرِقْهُ " في حديث ولوغ الكلب ، ولم يذكرها سائر الحفاظ من أصحاب الأعمش ، وإنما رووه هكذا " إذا ولغ الكلب في إناء أحدكم فليغسله سبع مرات " فتكون هذه الزيادة كخبر تفرد به علي بن مُسْهِرَ ، وهو ثقة، فتقبل تلك الزيادة .

ب) مثال للزيادة المنافية:

زيادة "يوم عرفة" ، في حديث "يوم عرفة ويوم النحر وأيام التشريق عِيْدُنا أهل الإسلام ، وهي أيام أَكْل وشُرْب " فان الحديث من جميع طرقه بدونها ، وإنما جاء بها موسى بن على بن رباح عن أبيه عن عقبة بن عامر ، والحديث أخرجه الترمذي وأبو داود وغيرهما .

جـ) مثال للزيادة التي فيها نوع منافاة : ما رواه مسلم من طريق أبي مالك الأشجعي عن رِبْعِي عن حذيفة قال : قال رسول الله صلى الله عليه وسلم : " .. وجعلت لنا الأرض كلها مسجداً وجعلت تربتها لنا طهوراً " فقد تفرد أبو مالك الأشجعي بزيادة "تربتها" ولم يذكرها غيره من الرواة ، وإنما رووا الحديث هكذا " وجعلت لنا الأرض مسجداً طهوراً " [٢٩٢]

### ٦- حكم الزيادة في الإسناد :

أما الزيادة في الإسناد فَتَنْصَبُّ هنا على مسألتين رئيسيتين يكثر وقوعهما، وهما تعارض الوصل مع الإرسال، وتعارض الرفع مع الوقف، أما باقي صور الزيادة في الإسناد فقد أفرد العلماء لها أبحاثاً خاصة مثل " المزيد في متصل الأسانيد "

---

[٢٩١] انظر روايات الحديث في صحيح مسلم بشرح النووي جـ٣ ص ١٨٢ وما بعدها.

[٢٩٢] المصدر السابق جـ ٥ ـ ص ٤ وما بعدها.

هذا وقد اختلف العلماء في قبول الزيادة وردها على أربعة أقوال وهي :

أ) الحُكْمُ لمن وصله أو رفعه ( أي قبول الزيادة ) وهو قول جمهور الفقهاء والأصوليين[٢٩٣].

ب) الحكم لمن أرسله أو وقفه ( أي ردُّ الزيادة ) وهو قول أكثر أصحاب الحديث .

ج) الحكم للأكثر: وهو قول بعض أصحاب الحديث.

د) الحكم للأحفظ : وهو قول بعض أصحاب الحديث .

ومثاله: حديث " لا نكاح إلا بولي " فقد رواه يونس بن أبي اسحق السَّبِيعي ، وابنُه إسرائيل وقيس بن الربيع عن أبي اسحق مسنداً متصلا ، ورواه سفيان الثوري وشعبة بن الحجاج عن أبي اسحق مرسَلا [٢٩٤]

## زیادەی کەسانی بڕوا پێکراو

## ( زيادات الثقات )

### ١.مەبەست لە زیادەی کەسانی باوەڕپێکراو:

(الزيادات) کۆی (الزيادة)یە، وە (الثقات) کۆی (الثقة)یە، وە (الثقة) بریتییە لە کەسی ڕاستاڵی بیر چاك (العدل الضابط)، وە مەبەست لە زیادەی بڕواپێکراو ئەو لەفزە زیادانەیە کە ئێمە دەیانبینین لە ڕیوایەتی هەندێ کەسی بڕواپێکراودا بۆ هەر فەرموودەیەك،کەسانی بڕوا پێکراوی تر " هەر ئەو فەرمودەیە" گێڕابێتیانەوە.

---

[٢٩٣] قال الخطيب: " هذا القول هو الصحيح عندنا " الكفاية ص ٤١١

[٢٩٤] انظر المثال واختلاف الرواة في إرساله ووصله في الكفاية ص ٤٠٩ وما بعدها.

**٢.بەناوبانگترینی ئەوانەی بایەخیان پێی داوە:**

ئەم زیادانە لە هەندێ لە بڕوا پێکراوانەوەیە لەهەندێ فەرمودەداو جێگای تێڕوانینی زانایانن، بۆیە شوێنیان کەوتوون و بایەخیان پێداوە، بۆ کۆکردنەوە یان و ناسینیان، لەو پێشەوایانەی کە بەمەوە بەناو بانگن.

أ.أبو بكر عبدالله بن محمد بن زياد النيسابورى.

ب.أبو نُعَيْمْ الجرْجاني.

جـ.أبو الوليد حسان بن محمد القُريشى.

**٣.جێگای ڕوودانی ئەم زیادەیە:**

أ.لەمەتندایە، بە زیادکردنی وشەیەك یان ڕستەیەك.

ب.لە سەنەددایە بە بەرزکردنەوەی مەوقوفێك (رفع موقوف) یان هێنانی مورسەلێك (وصل مرسل).

**٤.حوکمی زیادە لە مەتندا:**

بەڵام زیادە لە مەتندا، زانایان جیاوازییان هەیە لە حوکمەکەیدا، بەچەند گوتەیەك:

أ.هەندێکیان بە موتڵەقی وەریان گرتووە.

ب.هەندێکیان بە موتڵەقی بەرپەرچیان داوەتەوە.

جـ.وە هەندێکیان ئەو زیادەیەیان بەرپەرچ داوەتەوە، ئەگەر لە گێڕەرەوەی فەرمودەکەوە بێت، کە یەکەمجار بەبێ زیادە گێڕا بێتیەوە، وە لە غەیری خۆیەوە ئەو زیادەیەی وەرگرتبێ[٢٩٥].

[٢٩٥] علوم الحديث ص٧٧، الكفاية، ص٤٢٤ وما بعدها.

(إبن الصلاح) زیادەی بە گوێرەی وەرگرتن و بەرپەرچ دانەوە بۆ سێ بەش دابەش کردووە، کە ئەمەش دابەش کردنێکی باشە، (إمام النواوي)و غەیری ئەویش لەگەڵـیدان لەسەر ئەوە، ئەم بەش کردنەش بەم جۆرەیە.:

أ.زیادەیەك کە پێچەوانەگەری تیادا نەبێت، لەگەڵ ئەو گێڕانانەوەدا کە کەسانی متمانە پێکراوی تر (ثقات) یان پلە بەرز تر لە متمانەدا (ألأوثق) گێڕاویانەتەوە، ئەمە حوکمەکەی وەرگرتنیەتی، چونکە وەك فەرمودەیەك وایەکە گێڕانەوەکەی بەگشتی لە متمانە پێکراوێکەوەیە کە ئەویش لە متمانە پێکراوێکی ترەوە بە تەنهایی گێڕاویەتیەوە.

ب.زیادەیەك کە پێچەوانە بوونەوەی تیادا بێت، لەگەڵ ئەو ڕیوایەتانەدا کە کەسانێکی متمانە پێکراو (ثقات) یان پلە بەرز تر لە متمانەدا (ألأوثق) گێڕابێتیانەوە، ئەمە حوکمەکەی بەرپەرچ دانەوەیەتی، هەروەك لە باسی (شاذ)دا ڕابورد.

جـ.زیادەیەك کە جۆرێك لە پێچەوانەگەری تیادا بێت بۆ کەسانی بڕواپێکراو، یان پلە بەرز لە متمانەدا، ئەم پێچەوانەگەریەش لە دوو شێوازدا کورت هەڵهێنراوە.

١.لە پەیوەست کردنی شتێکی ڕەهادا (تقييد المطلق).

٢.لە تایبەت کردنی شتێکی گشتی دا (تخصيص العام).

ئەم بەشەش (إبن الصلاح) لە حوکمەکەی بێدەنگ بووە، (ألإمام النواوي) لەسەری دەفەرموێ: گوتەی ساغ لەسەر ئەوەیە کە ئەم دواییە وەردەگیرێت[٢٩٦].

---

([٢٩٦]) بڕوانە: (التقريب مع التدريب) ج١/ص٢٤٧ جا مەزهەبی (شافیعی) و (مالك) ئەوەیە کە ئەم جۆرە زیادەیە وەردەگیرێ، وە مەزهەبی (حەنەفی) لەسەر ئەوەیە کە بەرپەرچ دەدرێتەوە.

**٥.نمونەی زیادە لە مەتندا:**

**أ.نمونە بۆ ئەو زیادەیەی کە پێچەوانە بونەوەی تیادا نییە،  وەك:** ئەوەی کە (إمام مسلم) ڕیوایەتی دەکات[٢٩٧] لە ڕێگای (علي بن مُسْهِر) ئەویش لە (ألأعمش) و ئەویش لە (أبو رزين) و (أبو صالح)ەوە ئەویش لە (أبو هريرة)ەوە ﷺلە زیادکردنی وشەی (فَلْيُرِقْهُ)دا فەرمودەی باس لەدەم تێنانی قاپو قاچاخ لە لایەن سەگەوە...کە ئەو وشەیە (حافظ)ەکانی تر لەهاوەڵانی (أعمش) باسیان نەکردووە، بەڵکو بەم جۆرە ڕیوایەتیان کردووە، (إذا ولغ الكلب في أناء أحدكم فليغسله سبع مرات- واتە: ئەگەر سەگ دەمی نایە ناو قاپ و قاچاغی یەکێکتان ئەوا با حەوت جار بیشوات).

جا ئەو زیادەیە وەك فەرمودەیەك وایە کە (علي بن مُسهِر) بەتەنها خۆی هێنابێتی، کە کەسێکی باوەڕ پێکراوە، بۆیە ئەو زیادەیە وەردەگیرێت.

**ب.نمونەی زیادەیەك کە پێچەوانەگەری تیا بێت:** وەك زیادەی (یوم عرفة) لە فەرمودەی (یوم عرفةِ و يوم النحر و أيام التشريق عيدُنا أهل ألأسلام، وهي أيام أكل و شرب – واتە: ڕۆژی عەرەفەو ڕۆژی قوربانی سەربڕینو سێ ڕۆژەی دوای جەژنی قوربان جەژنەکانی ئەهلی ئیسلامن، وە ڕۆژانی خواردن و خواردنەوەن).

جا ئەم فەرمودەیە بەسەرجەم ڕێگاکانیەوە، جگە لەم ڕێگایە بەبێ (یوم عرفة)ەیە، جا ئەمە (موسى بن على بن رباح) لە باوکییەوە ئەویش لە (عقبة بن عامر)ەوە هێناویەتی، وە فەرمودەکە (الترمذي)و (ابو داود)و غەیری ئەمان هێناویانە.

---

([٢٩٧]) بروانە: گێڕانەوەکانی ئەم فەرمودەیە لە (صحیح مسلم بشرح النواوی)دا، ج٣/ ص١٨٢ ومابعدها.

**جـ.نمونەی زیادەیەك كە جۆرێك لە پێچەوانەگەری تیادایە:**

ئەوەیە كە (مسلم) لە ڕێگای (أبو مالك ألأشجعي)و ئەویش لە (ربعي)و ئەویش لە (حذيفة)ەوە ڕیوایەتی دەكات و دەڵێت: پێغەمبەر (ﷺ) فەرمویەتی: ....وجعلت لنا ألأرض كلها مسجداً و جعلت تربتها لنا طهوراَ) سەرجەم زەویمان بەمزگەوت بۆ گێڕدراوە، وسەرجەم گڵێشمان بە پاك بۆ دانراوە، جا (أبو مالك الأشجعي) تەنها خۆی زیادەی (تربتها)ی هێناوە، وە هیچی تر لە ڕاوییەكان باسیان نەكردوە، بەڵكو ئەم فەرمودەیەیان بەم جۆرە هێناوە: (وجعلت لنا ألأرض مسجداً وطهوراً)[٢٩٨].

**٦.حوكمی زیادە لە سەنەددا:**

بەلاّم زیادە لە سەنەددا، لەسەر دوو مەسەلەی سەرەكی وەستاوە كە ڕوودانیان زۆرە، كە بریتین لە پێچەوانە بونەوە (تعارض) لە نێوان (وصل)و (أرسال)، (تعارض) لەنێوان (رفع)و (وقف)دا، بەلاّم شێوازەكانی دیكەی زیادە لەسەنەددا ئەوەیە كە زانایان چەند باسێكی سەرەكییان بۆ تایبەت كردووە، وەك:(المزيد في متصل الأسانيد).

زانایان لێرەدا جیاوازییان هەیە لەسەر وەرگرتنی زیادەو بەرپەرچ دانەوەیدا لەسەر چوار گوتە كە ئەمانەن:

أ.حوكم بۆ ئەوەیە كە (وصل)و (رفع)ی تیایدا كردووە، واتە: وەرگرتنی زیادەكەیە، كە ئەمەش گوتەی جەماوەری شەرعزانان و زانایانی ئوصولە[٢٩٩].

---

(٢٩٨) المصدر السابق ج٥/ ص٤ وما بعدها.

(٢٩٩) (الخطيب) دەڵێت: ئەو گوتەیە لەلای ئێمە صەحیحە. الكفاية ص٤١١.

ب.حوكم بۆ ئەوەيە كە (أرسال)و (وقف)ى تياداكردووە، واتە: بەرپەرچ دانەوەى زيادەكەيە، كە ئەمەش گوتەى زۆرينەى زانايانى فەرمودەيە.

جـ.حوكم بۆ ئەوانەيە كە زۆرترينن، كە ئەمەش گوتەى هەندێ لە زانايانى فەرمودەيە.

د.حوكم بۆ ئەوانەيە كە هێزى لەبەركردنيان زۆر ترە (الأحفظ) كە ئەمەش گوتەى هەندێ لە زانايانى فەرمودەيە.

**نمونەكەيشى**:وەك فەرمودەى (لانكاح إلا بولي —واتە: نيكاح دانامەزرێت بەرەزامەندى وەلـى ئافرەتەكە نەبێت)، ئەمە (يونس بن أبى أسحاق السبيعى) ڕيوايەتى كردووە، وە كورەكەى (إسرائيل)و (قيس بن الربيع) لە (أبو أسحاق)ەوە بە موسنەدى و پەيوەستى (متصل)ى، وە(سفيان الثوري)و (شعبة بن حجاج) ڕيوايەتيان كردوە لە (أبو إسحاق)ەوە بە مورسەلـى[٣٠٠].

## الاعْتبار والمُتَابع والشاهد

**١– تعريف كل منها:**

أ) الاعْتِبَار:

١– لغة : مصدر " اعْتَبَر " بمعني الاعتبار النظر في الأمور ليعرف بها شيء آخر من جنسها.

٢– اصطلاحاً:هو تتبع طرق حديث انفرد بروايته راو ليعرف هل شاركه في روايته غيرُه أو لا.

---

(٣٠٠) بروانە: بۆنمونەى ڕاجيايى گێڕەرەوەكان لە (أرسال)و (وصل) كردنيدا لـە كتێبـى الكفايـة، ص٤٠٩ وما بعدها.

ب)المُتَابِع: ويسمي التابع.

١ – لغة: هو اسم فاعل من " تابع " بمعني وافق.

٢ – اصطلاحاً: هو الحديث الذي يشارك فيه رواتُه رواه الحديث الفرد لفظاً ومعني فقط ، مع الإتحاد في الصحابي .

جـ) الشاهد:

١ – لغة: اسم فاعل من "الشهادة" وسمي بذلك لأنه يشهد أن للحديث الفرد أصلاً، ويقويه، كما يقوي الشاهد قول المدعي ويدعمه.

٢ – اصطلاحاً: هو الحديث الذي يشارك فيه رواته رواة الحديث الفرد لفظاً ومعنى، أو معنى فقط، مع الاختلاف في الصحابي.

٢ – الاعتبار ليس قسيماً للتابع والشاهد :

ربما يتوهم شخص أن الاعتبار قسيم للتابع والشاهد، لكن الأمر ليس كذلك، وإنما الاعتبار هو هيئة التوصل إليهما، أي هو طريقة البحث والتفتيش عن التابع والشاهد.

٣ – اصطلاح آخر للتابع والشاهد :

ما ذُكِرَ من تعريف التابع والشاهد هو الذي عليه الأكثر ، وهو المشهور ، لكن هناك تعريف آخر لهما وهو :

أ) التابع : أن تحصل المشاركة لرواة الحديث الفرد باللفظ سواء اتحد الصحابي أو اختلف .

ب) الشاهد : أن تحصل المشاركة لرواة الحديث الفرد بالمعني سواء اتحد الصحابي أو اختلف، هذا وقد يطلق اسم أحدهما على الآخر ، فيطلق اسم

التابع على الشاهد كما يطلق اسم الشاهد على التابع ، والأمر سهل كما قال الحافظ ابن حجر [٣٠١] لأن الهدف منهما واحد ، وهو تقوية الحديث بالعثور على رواية أخري للحديث .

**٤- المتابعة :**

أ) تعريفها:

١- لغة: مصدر " تَابَعَ " بمعنى " وَافَق " فالمتابعة إذن الموافقة.

٢- اصطلاحاً: أن يشارك الراوي غيره في رواية الحديث.

ب) أنواعها: والمتابعة نوعان

١- متابعة تامة: وهي أن تحصل المشاركة للراوي من أول الإسناد.

٢- متابعة قاصرة: وهي أن تحصل المشاركة للراوي أثناء الإسناد .

**٥- أمثلة:**

سأذكر مثالا واحداً مَثَّلَ به الحافظ ابن حجر[٣٠٢]، فيه المتابعة التامة والمتابعة القاصرة والشاهد وهو:

ما رواه الشافعي في الأمِّ عن مالك عن عبدالله بن دينار عن ابن عمر أن رسول الله صلي الله عليه وسلم قال : " الشهر تسع وعشرون ، فلا تصوموا حتى تروا الهلال ، ولا تفطروا حتى تروه فان غُمَّ عليكم فأكملوا العِدَّة ثلاثين "

فهذا الحديث بهذا اللفظ ظن قوم أن الشافعي تفرد به عن مالك ، فعُدّوه في غرائبه أن أصحاب مالك رووه عنه بهذا الإسناد ، وبلفظ : " فان غُمَّ " عليكم فاقدروا له " لكن بعد الاعتبار وجدنا الشافعي متابعة تامة ، ومتابعة قاصرة ، وشاهدا .

---

[٣٠١] في شرح النخبة ص ٣٨ .

[٣٠٢] في شرح النخبة ص ٣٧ .

أ) أما المتابعة التامة: فما رواه البخاري عن عبدالله بن مَسْلَمَة القَعْنَبِي عن مالك بالإسناد نفسه ، وفيه " فان غُم عليكم فأكملوا العدة ثلاثين "

ب) وأما المتابعة القاصرة : فما رواه ابن خزيمة من طريق عاصم بن محمد عن أبيه محمد بن زيد عن جده عبدالله ابن عمر بلفظ " فكملوا ثلاثين "

ج) وأما الشاهد: فما رواه النسائي من رواية محمد بن حنين عن ابن عباس عن النبي صلي الله عليه وسلم قال، وفيه: " فان غم عليكم العدة ثلاثين ".

## باسی ( ألإعتبار – المتابع – الشاهد )

### یەكەم: پێناسەكانیان:

ا.ألأعتبار:

١.لەڕووی زمانەوە:چاوگ (مصدر)ی (أعتبر)ەیە، وە مانای (ألأعتبار) بریتی یە لە تێڕامان لە شتەكان و كارەكاندا، تا بەهۆیانەوە شتێكی تری لە جینسی خۆیان بزانرێت.

٢.لەڕووی زاراوەوە:بریتیەلەشوێن كەوتن(تَتَبُّعْ)ی ڕێگاكانی فەرمودەیەك، كە تەنها ڕاویەك تاك بەتەنیابێت، لە ڕیوایەت كردنیدا، تا بزانرێت كە ئایا لە ڕیوایەت كردنیدا كەس غەیری ئەو بەشداری كردووە یان نا....

ب.(المتبع) كە بە (التابع)یش ناودەبرێت:

١.لەڕووی زمانەوە:ئیسمی فاعیلەو لە (تابع)ەوە هاتووە، بەمانای هاوڕێكی (وافق)ەیە.

٢.لەڕووی زاراوەوە:ئەو فەرمودەیە یە كە تیایدا ڕاویەكانی بەشداری بكەن لە ڕیوایەتی فەرمودەیەكی تاكەوە بوودا، لە ڕووی لەفزو ماناوە یاخودتەنهالەڕووی ماناوە، ئەمەو لەگەڵ هاوڕێكی یان لە صەحابییەكاندا.

**جـ.الشاهد:**

**١.لەڕووی زمانەوە:**ئیسمی فاعیلەو لە (الشهادة)ەوە هاتووە، بەمەش ناو نراوە، چونکە شایەتی دەدات کە بۆ فەرمودەی تاکڕەو (الحدیث الفرد) بنەما (أصل)ێك هەیەو بەهێزی دەکات، هەر وەك شاهید گوتەی داواکار (المُدَّعِيِّ) بەهێز دەکاتو یارمەتی دەدات.

**٢.لەڕووی زاراوەوە:**ئەو فەرمودەیە یە کە ڕاوییەکانی بەشداری دەکەن لە ـ ڕیوایەتی فەرمودەیەکی تاکڕەودا لە ڕووی لەفزو ماناوە یان، تەنها لەڕووی ماناوە– ئەمەو لەگەڵ بوونی ڕاجیایی لە صەحابییەکاندا.

**٢.(الأعتبار) هاوشێوەی (التابع) و (الشاهد)نییە:**

لەوانەیە هەندێ جار کە سێك وا گومان بیات کە (ألأعتبار) هاوشێوەو هاوپێچی (التابع)و (الشاهد) بێت، بەڵام بەم شێوازە نییە، و بەڵکو (الأعتبار) بریتیە لە چۆنیەتی و شێوازی گەیشتن بەو دوانەی تر، واتە: بریتیە لە ڕێبازی لێکۆڵینەوەو بەدوادا گەڕانی (تابع) و (شاهد).

**٣.زاراوەیەکی تر بۆ (تابع) و (شاهد):**

ئەوەی کە باس کرا لەپێناسەی (تابع)و (شاهد) ئەوەیە کە زۆرینەو دیارترین (ألأكثر و المشهور)ی زانایانی لەسەرە، بەڵام لێرەدا پێناسەی تریشیان هەیە، کە ئەمانەن:

**أ.التابع:**بریتی یە لەوەی کە بەشداری کردن (المشاركة) لە گێڕەرەوەکانی فەرمودەی تاکڕەو (الفرد)دا لەڕووی لەفزەوە ڕوبدات، ئیتر چونیە کە لە صەحابی دا یەکبن یان جیاوازبن.

**ب.الشاهد:**بریتی یەلەوەی کەبەشداری کردن لە گێڕەرەوەکانی فەرمودەی تاکدا بەمانا ڕوودات، ئیتر چونیەکە لە صەحابی دا یەکبن یان جیاوازبن، ئابەم جۆرە ناوی هەریەکەیان بەسەر ئەوی تریاندا بەکاردەهێنرێ، بۆیە ناوی (تابع) لە جیاتی ناوی (شاهد) بەکاردێت و ناوی (شاهد)یش لەجیاتی (تابع) بەکاردێت، کارەکەش ئاسانە، هەروەك (حافظ إبن حجر) دەفەرموێت:چونکە ئامانج لە هەردوکیاندا یەك شتە، کە بریتی یەلە بەهێزکردنی فەرمودە، ئەویش لە ڕێی دەست بەسەردا گرتن و زاڵبوون بەسەر گێڕانەوەکانی تری فەرمودەکەدا[٣٠٣].

**٤.المتابعة:**

**أ.پێناسەکەی:**

**١.لەڕووی زمانەوە:**چاوگی (تابع)ەیە، بەمانای(وافَقَ)کەواتە: (المتابعة) واتە: (الموافقة)، هاوڕێکی.

**٢.لەڕووی زاراوەوە:**بریتی یە لەوەی کە گێڕەرەوەیەك بەشداری بکات، لە گێڕانەوەیەکی تری فەرمودەیەکدا.

**ب.جۆرەکانی: (المتابعة) دوو جۆرن:**

**١.موتابەعەی تەواو: (المتابعة تامة):** بریتی یە لەوەی کە بەشداری کردنەکەی گێڕەرەوەکە هەر لەسەرەتای سەنەدەکەوە ڕوودات.

**٢.موتابەعەی کورتکراو (متابعة قاصرة):** بریتییە لەوەی کە بەشداری کردنی گێڕەرەوەکە لەنێوەندی سەنەدەکەدا ڕوودات.

---

(٣٠٣) في شرح النخبة ص٣٨.

**٥.نموونه:**

تەنها نموونەیەك باس دەكەم كە (حافظ إبن حجر)[٣٠٤] كردویەتیە نموونە، كە (متابعة تامة)و (متابعة قاصرة)و (شاهد)ی تیادایە، ئەویش ئەمەیە.

ئەوەی كە (إمام شافعي) لە كتێبی (الأم) دا لە (مالك)ەوە، ئەویش لە (عبدالله بن دینار)، ئەویش لە (إبن عمر)ەوە، ڕیوایەتی دەكات كە پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمویەتی: (الشهر تسع و عشرون، فلا تصوموا حتی تروا الهلال، و لاتفطروا حتی تروه، فإن غُم علیكم فاكملوا العِدَة ثلاثین — واتە: مانگ بیست و نۆیە، بەڕۆژوو مەبن تا مانگ نەبینن، ڕۆژوو مەشكێنن و جەژن مەكەن، تا مانگ نەبیننەوە، ئەگەر هەور بوو سی ڕۆژ تەواو بكەن، ئەم فەرمودەیەو بەم لەفزە، كەسانێ وا گومانیان بردووە، كە (إمام شافعي) تەنها خۆی لە (مالك)ەوە هێناویەتی، وە لە (غرائب)ی ئیمام شافیعیان حیساب كردووە، چونكە هاوەڵانی (مالك) لێوەی ڕیوایەتیان كردووە، بەو سەنەدەو بە لەفزی (فإن غُم علیكم فأقدرو، له) بەڵام پاش تێڕامانی (ألإعتبار) بۆمان دەركەوت كە (إمام شافعي) لێرەدا (متابعة تامة) وە (متابعة قاصرة)و (شاهد)ی هەیە.

أ.**بۆ موتابەعەی تەواو:** ئەوەیە كە (بخاري) لە (عبدالله بن مسلمة القعنبي) لە (مالك)ەوە بەهەمان سەنەد ڕیوایەتی كردووە، وە (فإن غُم علیكم فأكملوا العدة ثلاثین)ی تیادایە.

ب.**بەڵام بۆ موتابەعەی كورت هەڵهێنراو:** وەك ئەوەی كە (إبن خزیمة) لە ڕێی (عاصم بن محمد) لە باوكیەوە (محمد بن زید) وە ئەویش لە باپیریەوە (عبدالله إبن عمر) دەی گێڕێتەوە بە لەفزی (فكملوا ثلاثین)ە.

---

(٣٠٤) في شرح النخبة، ص٣٧.

جـ.بەڵام بۆ (شاهد)یش: وەك ئەوەی كە (نسائی) لە ڕیوایەتەكەی (محمد بن حنین) لە (إبن عباس)ەوە ئەویش لە پێغەمبەرەوە (ﷺ) ڕیوایەتی دەكات، كە فەرموویەتی، ئەمەیشی تیادایە: (فإن غُم عليكم فأكملوا العِدَّة ثلاثين).

# الباب الثاني

صفة من تُقبل روايتهُ وما يتعلق بذلك من الجرح والتعديل

المبحث الأول: في الراوي وشروط قبوله.

المبحث الثاني: فكرة عامة عن كتب الجرح والتعديل.

المبحث الثالث: مراتب الجرح والتعديل.

# بەندی دووەم

باسی سیفەتی ئەو کەسەی کە گێڕانەوەی لێ وەردەگیرێت، وە باسی ئەوەی کە پەیوەستە بەم بابەتەوە لە (الجرح و التعديل)

* باسی یەکەم: دەربارەی گێڕەرەوە، ومەرجەکانی شت لێ وەرگرتنی.
* باسی دووەم: بیرۆکەیەکی گشتی دەربارەی کتێبەکانی (الجرح و التعديل).
* باسی سێهەم: پلەکانی (الجرح و التعديل).

# المَبْحَثُ الأول

## في الراوي وشروط قبوله

### ١- مقدمة تمهيدية:

بما أن حديث رسول الله صلي الله عليه وسلم يصلنا عن طريق الرواة فهم الركيزة الأولي في معرفة صحة الحديث أو عدم صحته ، لذلك اهتم علماء الحديث بالرواة ،وشرطوا لقبول روايتهم شروطاً دقيقة محكمة تدل على بعد نظرهم وسداد تفكيرهم ، وجودة طريقتهم .

وهذه الشروط التي اشترطوها في الراوي ،والشروط الأخرى التي اشترطوها لقبول الحديث والأخبار، لم تتوصل إليها أي ملة من الملل حتى في هذا العصر الذي يصفه أصحابه بالمنهجية والدقة ، فإنهم لم يشترطوا في نقلة الأخبار الشروط التي اشترطها علماء المصطلح في الراوي ، بل ولا أقل منها ، فكثير من الأخبار التي تتناقلها وكالات الأنباء الرسمية لا يوثق بها ولا يركن إلى صدقها . وذلك بسبب رواتها المجهولين " وما آفة الأخبار إلا رواتها وكثيراً ما يظهر عدم صحة تلك الأخبار بعد قليل.

### ٢- شروط قبول الراوي:

أجمع الجماهير من أئمة الحديث والفقه أنه يشترط في الراوي شرطان أساسيان هما:

أ) العدالة: ويعنون بها أن يكون الراوي : مسلماً ـ بالغاً ـ عاقلاً ـ سليماً من أسباب الفسق ـ سليماً من خوارم المروءة .

ب) الضبط : ويعنون به أن يكون الراوي ، غير مخالف للثقات ولا سيء الحفظ ـ ولا فاحش الغلط ـ ولا مغفلاً ـ ولا كثير الأوهام .

**٣- بم تثبت العدالة ؟**

تثبت العدالة بأحد أمرين .

أ) إما بتنصيص مُعَدِّلَيْن عليها، أي أن ينص علماء التعديل أو واحد منهم عليها .

ب) وأما بالاستضافة والشهرة ، فمن اشتهرت عدالته بين أهل العلم ، وشاع الثناء عليه كفى ، ولا يحتاج بعد ذلك إلى مُعَدِّل ينص عليها ، وذلك مثل الأئمة المشهورين كالأئمة الأربعة والسفيانين والأوزاعي وغيرهم .

**٤- مذهب ابن عبد البَرّ في ثبوت العدالة :**

رأي ابن عبدالبر أن كل حامل علم معروف العناية به محمول أمره على العدالة حتى يتبين جرحه ، واحتج بحديث " يَحْمِلُ هذا العلم من كل خَلَفٍ عُدُوْلُهُ ، ينفون عنه تحريف الغالين ، وانتحال المبطلين ، وتأويل الجاهلين "[٣٠٥] وقوله هذا غير مَرْضِيٍّ عند العلماء ، لأن الحديث لم يصح وعلى فرض صحته ، فان معناه " لِيَحْمِلْ هذا العلم من كل خَلَف عدوله " بدليل أنه يوجد من يحمل هذا العلم وهو غير عدل .

[٣٠٥] رواه ابن عدي في الكامل وغيره ، وقال العراقي له طرق كلها ضعيفة لا يثبت منها شيء وقد حسنه بعض العلماء لكثرة طرقه وانظر التفاصيل في التدريب جـ١ ـ ص ٣٠٢-٣٠٣ .

**٥- كيف يُعْرَف ضبط الراوي ؟**

يعرف ضبط الراوي بموافقته الثقات المتقنين في الراوية ، فان وافقهم في روايتهم غالباً فهو ضابط ، ولا تضر مخالفته النادرة لهم ، فان كثرت مخالفته لهم اختل ضبطه ، ولم يُحْتَجَّ به.

**٦- هل يُقبل الجرح والتعديل من غير بيان ؟**

أ) أما التعديل فيقبل من غير ذكر سببه على الصحيح المشهور، لأن أسبابه كثيرة يصعب حصرها، إذ يحتاج المُعَدِّل أن يقول مثلا: لم يفعل كذا، لم يرتكب كذا، أو يقول: هو يفعل كذا، ويفعل كذا وهكذا....

ب) أما الجرح فلا يقبل إلا مفسَّراً لأنه لا يصعب ذكره لأن الناس يختلفون في أسباب الجرح، فقد يجرح أحدهم بما ليس بجارح ، قال ابن الصلاح " وهذا ظاهر مقرر في الفقه وأصوله ، وذكر الخطيب الحافظ أنه مذهب الأئمة من حفاظ الحديث ونقاده مثل البخاري ومسلم وغيرهما ، ولذلك احتج البخاري بجماعة سبق من غيره الجرح لهم كعكرمة وعمرو بن مرزوق واحتج مسلم بسُوَيْد بن سعيد وجماعة اشتهر الطعن فيهم ، وهكذا فعل أبو داود . وذلك دال على أنهم ذهبوا إلى أن الجرح لا يثبت إلا إذا فسر سببه " [٣٠٦]

**٧- هل يثبت الجرح والتعديل بواحد ؟**

أ) الصحيح أنه يثبت الجرح والتعديل بواحد.

ب) وقيل لا بد من اثنين .

[٣٠٦] علوم الحديث ص ٩٦ باختصار يسير

**٨- اجتماع الجرح والتعديل في راو واحد :**

إذا اجتمع في راو الجرح والتعديل.

أ) فالمعتمد أنه يقدم الجرح إذا كان مفسَّرا.

أ) وقيل إن زاد عدد المُعَدِّلِيْنَ على الجارحين قُدّمَ التعديل وهو ضعيف غير معتمد .

**٩- حكم رواية العَدْل عن شخص :**

أ) راوية العدل عن شخص لا تعتبر تعديلا له عند الأكثرين وهو الصحيح ، وقيل هو تعديل.

ب) وعمل العالم وفُتْيَاهُ على وفق حديث ليس حكماً بصحته ، وليس مخالفته له قدحاً في صحته ، ولا في روايته ، وقيل بل هو حكم بصحته ، وصححه الآمدي وغيره من الأصوليين، وفي المسألة كلام طويل .

**١٠ - حكم رواية التائب من الفسق :**

أ) تقبل رواية التائب من الفسق .

ب) ولا تقبل رواية التائب من الكذب في حديث رسول الله صلي الله عليه وسلم.

**١١- حكم رواية من أخذ على التحديث أجراً :**

أ) لا تقبل عند البعض، كأحمد واسحق وأبي حاتم.

ب) تقبل عند البعض الآخر ، كأبي نُعَيمْ الفضل بن دُكَيْن .

ج) وأفتى أبو إسحق الشيزاري لمن امتنع عليه الكسب لعياله بسبب التحديث بجواز أخذ الأجر.

**١٢- حكم رواية من عُرِفَ بالتساهل أو بقبول التلقين أو كثرة السهو.**

أ) لا تقبل رواية من عرف بالتساهل في سماعه أو إسماعه كمن لا يبالي بالنوم وقت السماع، أو يحدث من أصل غير مُقَابَل.

ب) ولا تقبل رواية من عرف بقبول التلقين في الحديث، بأن يُلَقَّنَ الشيء فيحدث به من غير أن يعلم أنه من حديثه.

ج) ولا تقبل رواية من عُرف بكثرة السهو في روايته.

**١٣- حكم رواية من حَدَّثَ ونَسِيَ :**

أ) تعريف من حدث ونسي: هو أن لا يَذْكُرَ الشيخ رواية ما حدث به تلميذه عنه.

ب) حكم روايته :

١- الردُّ : إن نفاه نفياً جازماً ، بأن قال : ما رويتُه ، أو هو يكذب عليَّ ، ونحو ذلك.

٢- القبول : إن تردد في نفيه ، كأن يقول : لا أعرفه أو لا أذكره ، ونحو ذلك .

ج) هل يعتبر رد الحديث قادحاً في واحد منهما ؟ لا يعتبر رد الحديث قادحاً في واحد منهما، لأنه ليس أحدهما أولي بالطعن من الآخر.

د) مثاله : ما رواه أبو داود والترمذي وابن ماجة من رواية ربيعة بن أبي عبدالرحمن عن سُهَيل بن أبي صالح عن أبيه عن أبي هريرة أن رسول الله صلي الله عليه وسلم قضي باليمين مع الشاهد " قال عبدالعزيز بن محمد الدَّراوَرْدي : حدثني ربيعة بن أبي عبدالرحمن عن سهيل ، فلقيتُ سُهيلاً فسألته عنه، فلم

يعرفه ، فقلت حدثني ربيعة عنك بكذا ، فصار سهيل بعد ذلك يقول حدثني عبدالعزيز عن ربيعة عني أني حدثته عن أبي هريرة رضي الله عنه مرفوعاً بكذا.......

هـ) أشهر المصنفات فيه: كتاب أخبار من حَدَّثَ ونَسِيَ، للخطيب.

## باسى يەكەم

## دەربارەی ڕاوی و مەرجەکانی شت لێوەرگرتنی

### ١. پێشەکیەکی ڕێخۆشکەر:

لەبەر ئەوەی کە فەرمودەی پێغەمبەر (ﷺ) گەیشتووە پێمان لە ڕێگای گێڕەرەوەکانەوە، بۆیە ئەوانەجێگای، تێڕامانی یەکەمن لە ناسینی صەحیحیو لاوازی فەرموودەدا، بۆیەو لەبەر ئەمە زانایانی فەرمودە بایەخیان بە گێڕەرەوان (الرواة) داوە، بۆ وەرگرتنی ڕیوایەتەکانیان مەرج گەلێکی وردو پتەویان داناوە، کە بەڵگەیە لەسەر دووربینیو بیر تیژییانو بەڵگەیشە لەسەر فراوانی ڕێبازەکەیان.

ئەو مەرجانەی کە بەمەرجیان داناوە بۆ گێڕەرەوەو مەرجەکانی تریش کە بەمەرجیان گرتوون بۆ وەرگرتنی فەرموودەکان،(الحديث و الأخبار) هیچ گەلێك پێی نەگەیشتووە لە گەلان تەنانەت لەم سەردەمەشدا کە خەڵکی بە پەیڕەو گەرایی (المنهجية)و وردەکاری (الدقة) وە صفی دەکەن، ئەمانە ئەو مەرجانەیان بە مەرج نەگرتووە، لە گێڕانەوەی هەواڵەکاندا، کە زانایانی زاراوە ناس (علماء المصطلح) بەمەرجیان گرتووە، بۆ گێڕەرەوە، تەنانەت بە

کەمتریش لەو مەرجانە، بۆیە زۆرینەی ئەو هەواڵانەی کە ئاژانسە ڕەسمیەکانی هەواڵیش دەی گوێزنەوە، متمانەیان پێ ناکرێت، ڕاستیان لێ چاوەڕێ ناکرێت، ئەمەش بە هۆی ئەوە وەیە گێڕەرەوەکانی نادیارنو نەناسراون، (وما آفة ألأخبار ألاّ رواتها) گێڕەرەوەکان تەنها بەلای هەواڵەکانن، زۆرینەی ئەو شتانەیش کە نادروستی ئەو هەواڵانە دەردەخات پاش کەمێکی تر دێت.

## ٢.مەرجەکانی وەرگرتنی گێڕەرەوە (قبول الراوي):

جەماوەری زانایان لە پێشەوایانی فەرمودە، وشەرع کۆکن لەسەر ئەوەی کە لە گێڕەرەوەدا دوومەرجی سەرەکی بە مەرج گیراوە، کە ئەمانەن:

أ.(ڕاستاڵی:**العدالة**):کەمەبەستیان پێی ئەوەیەکەئەبێت گێڕەرەوە مسوڵمان بێت، باڵغو عاقڵ بێت ساغ بێت لە هۆکارەکانی (فاسق)بوون، ساغیش بێت لەو شتانەی کە لە کەسایەتی (المروءة)ی مرۆڤ کەم دەکەنەوە.

**ب.هێزی لەبەر کردنی باش (الضبط)**:کە مەبەستیان پێی ئەوەیە کە دەبێت گێڕەرەوە پێچەوانە نەبێتەوە لەگەڵ متمانە پێکراوەکان (ثقات)دا، وە هێزی لەبەرکردنی خراپ نەبێت، وە هەڵەیی‌و بێئاگایی‌و خەیاڵی (الغلط و الغفلة و الوهم)ی زۆر نەبێت.

## ٣.ڕاستاڵی (عدالة) بەچی جێگیر دەبێت؟

عەدالەت بەیەکێ لەم دوو شتانە جێگیر دەبێت:

أ.یان بەدەقی قسەی ڕاستاڵ کارانی تر (مُعدّلین) لەسەری، واتە: بەوەی کە زانایانی (تعدیل) بەگشتی، یان یەکێکیان بەدەق قسەیەکی لەسەر بکات.

ب. یان بەهۆی بڵاوبونەوەو ناو دەرکردنەوە (الأستفاضة و الشهرة)، جا هەرکەسێك عەدالەتەکەی بڵاوبویەوە، لەلای زانایان، وە ستایش کردنی زۆر

بوو و بلاّو بويەوە، ئەوە بەسە، دوای ئەمە پێویستی بە کەسێك نییە تەعدیلی بکات و دەقی قسەی لەسەر هەبێت، ئەمەش وەك پێشەوایانی ناسراوو دیار وەك چوار پێشەواکەو دوو سوفیانەکەو و (ألأوزاعي)و ئەوانی تر.

**٤.مەزهەبی (إبن عبد البرّ) لە جێگیربوونی عەدالەتدا:**

رای (إبن عبد البر) وایە، کە هەموو خاوەن زانستێ -زانستی شەرعی- کە وادیار بوو، کە جێی بایەخە، وئەوە لەوانەیە کە عەدالەتی پێوە یە، تا (جرح)کردنی دەردەکەوێتو فەرمودەی (يَحمل هذا العلم من كلّ خَلَفٍ عُدُولُهُ، ينفون عنه تحريف الغالين و أنتحال المبطلين، و تأويل الجاهلين)[٣٠٧]، واتە: ئەو زانستە لەلایەن هەموو خاوەن زانستێکی ڕاستاڵەوە وەردەگیرێ، کە لەلادان و خوارو خێچ کردن (تحريف)ی ڕۆچوانو داتاشینی بەتاڵ کاران و لەمانا لادان (تأويل)ی نەزانان دەی پارێزن، وە ئەم گوتەیەی زانایان پێی ڕازی نین، چونکە فەرمودەکە ساغ نیە، وە ئەگەر گریمان صەحیحیش بێت، ئەوە ماناکەی (ليحمل هذا العلم من كلّ خَلَفٍ عدوله) بە بەڵگەی ئەوەی کە کەسانێك هەن خاوەن زانستن و عادلیش نین.

**٥.چۆن هێزی لەبەر کردنی گێڕەرەوە (ضبط الراّوي) دەزانرێت؟**

زەبتی گێڕەرەوە بەهۆی هاوڕێکی بوونی گوتەی متمانە پێکراوانی وردەکار لەو گێڕانەوەیەدا دەزانرێت، ئەگەر ئەو کەسە متمانە پێکراوانە لەو ڕیوایەتەدا بەزۆری هاوڕێکی بوون، ئەوە (ضابط)ە، وە پێچەوانە گەری کەم هیچ نییە، ئەگەر زۆر پێچەوانەگەری کردنی هەبوو، ئەوە (ضبط)ەکەی لەدەست دەدات، و ناکرێتە بەڵگە.

---

(٣٠٧) (إبن عدی) لە (الكامل)وشوێنی تریشدا ڕیوایەتی کردووە، وە (العراقي) دەڵێت:چەند ڕێگایەکی تری کە هەموویان لاوازن، هیچ کامیان جێگیر نەبوون، وە هەندێ لە زانایان بە (حسن)یان داناوە، لەبەر زۆری ڕێگاکانی، بۆ درێژی ئەمە بڕوانە: التدريب ج١/ ص٣٠٢ – ٣٠٣.

## ٦.ئایا (جرح و تعدیل) بەبێ ڕونکردنەوە وەردەگیرێ؟

أ.دەربارەی (تعدیل) لەگەڵ باس نەکردنی هۆکارەکانیشدا وەردەگیرێ، ئەمە لەسەر قسەی ساغ و دیار (الصحیح المشهور)، چونکە هۆکارەکانی زۆرن، و دیاری کردنیان سەختە، چونکە کەسی (مُعَدَّل) تەعدیل کار پێویستە کە بڵێت: بۆ نمونە:(لم یفعل کذا...)، (لم یرتکب کذا...) یاخود بڵێت، (هو یفعل کذا....)، (ویفعل کذا و هکذا).

ب.بەڵام (جَرْحْ) بە ڕوونکراوەیی (مُفَسر) نەبێت وەرناگیرێت، چونکە باسکردنیان سەخت نیە، وە هەروەها چونکە خەڵکی جیاوازیان هەیە، لە هۆکارەکانی (جرح)دا، جاری وا هەیە کە یەکێکیان کەسێك (جرح) دەکات،کەچی ئەو کەسە ئەهلی (جرح) نییە، (إبن الصلاح) دەڵێت: ئەمە دیارو دان پێدانراوە لە (فقه) و (اصول)دا، وە (خطیب)و (حافظ) باسیان کردووە، کە ئەمە مەزهەبی پێشەوایانی (حافظ)ەو ڕەخنەگران (نقاد)ی فەرمودەیە، وەك (بخاری)و (مسلم)و...هتد، و لەبەر ئەمەش (بخاری)، (جرح)کردنی کەسانێکی لەلایە، لەغەیری خۆیو لەپێش خۆیداو کردونەتیەبەڵگە، وەك (عکرمة)و (عمرو بن مرزوق)، وە (مسلم)یش (سوید بن سعید)و کۆمەڵێکی تر کە تانە لێ دانیان شتێکی دیارە، کردویەتیە بەڵگە، وە (أبو داود)یش هەر ئەمەی کردووە، ئەمەش بەڵگەیە کە ئەم زانایانە لەسەر ئەوە کۆکن،کە (جرح) بە ڕونکراوەیی هۆکارەکانیەوە نەبێت وە رناگیرێت[٣٠٨].

---

([٣٠٨]) علوم الحدیث، ص٩٦ بە کەمێك کورت کردنەوەوە.

**٧.ئايا (جرح و تعديل) بەیەك كەس جێگیر دەبێت؟**

أ.گوتەی صەحیح لەسەر ئەوەیە کە (جرح و تعدیل) بەیەك کەس جێگیر دەبێت.

ب.وە گوتراویشە کە پێویستە و دەبێت دوو کەس بن.

**٨.کۆبونەوەی (جرح و تعدیل) لە تەنها یەك گێڕەرەوەدا:**

ئەگەر لە تەنها ڕاویەکدا (جرح و تعدیل) کۆبونەوە:

أ.گوتەی پشت پـێ بەستراولـەسەر ئەوەیە کە (جرح) پێش دەخرێت، ئەگەر ڕونکراوە (مُفَسر) بوو.

ب.وە گوتراویشە ئەگەر ژمارەی (مُعدلِين) زیاتر بوو بەسەر (جارحين) دا، ئەوە (تعدیل) پێش دەخرێت، بەڵام ئەم گوتەیە لاوازەو پشتی پـێ نابەسرێت.

**٩.حوکمی ڕیوایەت کردنی (عَدل) لەلایەن کەسێکەوە:**

أ.گێڕانەوەی (عدل) بوون، لە کەسێکەوە، بە (تعدیل) دانانرێت، لەلای زۆرینەی زانایان، کە ئەم گوتەیەش صەحیحە، هەندێکیش بە (تعدیل)ی دادەنێن.

ب. کارکردنی زانایەك و فەتوادانی بە گوێرەی دەقی فەرمودەیەك: ئەوە حوکمدان نییە لەسەر صەحیحی فەرمودەکە، وە پێچەوانە کردنیشی لەگەڵی نابێتە بەڵگە لەسەر ئەوەی کە ئیتر لە صەحیحێتی کەم بکاتەوەو لە پلەو پایەی ڕاوییەکانی بدات، گوتراویشە کە ئەوە حوکمدانە بە صەحیح بوونی فەرمودەکەو ئەم گوتەیەش (آمدي)و هی تریش لە زانایانی ئوصول بە صەحیحیان داناوە، وە لەم مەسەلەیەدا قسەو باس و خواسێکی درێژ هەیە.

**١٠.حوکمی ڕیوایەتی کەسێك کە لە خراپە پاشگەز بوویێتەوە (التائب من الفسق):**

أ.ڕیوایەتی کەسێك کە لە تاوان پاشگەز بوویێتەوە وەردەگیرێت.

ب.وە ڕیوایەتی کەسێك کە لە درۆکردن بەدەم پێغەمبەرەوە (ﷺ) پاشگەز بوویێتەوە وەرناگیرێت.

**١١.حوکمی ڕیوایەتی کەسێك کە لەسەر گێڕانەوەی فەرمودە پاداشت (پارە) وەردەگرێت؟**

أ.لای هەندێ وەرناگیرێ، وەك (أحمد، إسحاق، أبو حاتم).

ب.لای هەندێکی تر وەر دەگیرێت، وەك (أبو نُعیم الفضل بن دُكَین).

جـ. (أبو إسحاق الشیرازی) فەتوای داوە، بۆ کەسێك کە بە هۆی گێڕانەوەی فەرمودەوە، کاتی نەبێت نان بۆ خێزانی پەیدا بکات، بەوەی کە دروستە پاداشت لەسەر گێڕانەوەکان وەربگرێت.

**١٢.حوکمی ڕیوایەتی کەسێك بە ئاسانکاری یان بە قەبوڵکردنی بەسەرداخوێندنەوە (قبول التلقین)و زۆر هەڵەیی (کثرة السهو) ناسرا بێت؟**

أ.ڕیوایەتی کەسێك کە بە ئاسانکاری (تساهل) ناسراو بێت، لە گوێگرتن لە فەرمودەدا، یان لە کاتێکا کە فەرمودە بە گوێی خەڵکیدا دەدات، وەك کەسێك کە گوێ بەخەو نادات لە کاتی گوێ گرتندا یان فەرمودە دەگێڕێتەوە لە ئەصڵێکەوە، کە بەرابەری (مُقابلة)ی پێ نەکراوە، کە ئایا تەواوە یان نا....

ب. ڕیوایەتی کەسێکیش کە بەوە ناسراوە کە ڕازی یە، بە بەسەردا خوێندنەوەی فەرمودە، بەوەی کە شتێکی بەسەردا بخوێنرێتەوە، جا بیگێڕێتەوە، بەبێ ئەوەی کە بزانرێت ئایا فەرمودەیە یان نا...

جـ. ڕیوایەتی کەسێك کە لە ڕیوایەت کردندا زۆر هەڵە بکات، وەرناگیرێت.

## ١٣.حوکمی ڕیوایەتی کەسێك کە فەرمودەی گێڕاوەتەوە، ولە بیری چۆتەوە؟

**أ.پێناسەی:**(من حدّث و نسي) کەسێك فەرموودەی گێڕاوەتەوەو لە بیری چۆتەوە:ئەوەیە کە مامۆستاکەی ئەو ڕیوایەتەی لەیاد نەمابێت کە قوتابییەکەی لێوەی گێڕاوەتەوە.

**ب.حوکمی ڕیوایەت کردنی ئەم جۆرە:**

**١.بەر پەرچ دانەوەی:**ئەگەر بەبـێگومانی (جازماً)نەفی کرد، بەوەی کە بڵێت: (مارويته) یان (هو یکذب عليَّ) و ....هتد، (من ڕیوایەتیم نەکردووە) یان (ئەوە درۆم بەدەمەوە دەکات).

**٢.وەرگرتنی:** ئەمە ئەگەر دوو دڵ بوو لە نەفی کردنیدا، وەك ئەوەی بڵێت: (لا أعرفه) یان (لا اذکره) و....هتد، (نایزانم) یان (نایەتەوە یادم)....هتد.

**جـ.ئایا بەرپەرچ دانەوەی ئەو فەرمودەیە دەبێتە کەم کردنەوەی پلەو پایەی یەکێکیان؟**

بەرپەرچ دانەوەی ئەو فەرمودەیە، نابێتە کەم کردنەوەی پلەو پایەی هیچ کامیان، چونکە هیچ کامێکیان شایستە تر نییە بەتانە لێدان (الطعن) لەوی تریان.

**د. نموونەکەی:**

وەك ئەوەی کە (أبو داود) و (الترمذي) و (إبن ماجة) لە ڕیوایەتەکەی (ربیعة بن أبي عبدالرحمن)و ئەویش لە (سُهیل بن أبی صالح) ئەویش لە باوکیەوەو ئەویش لە (أبو هریرة)ەوە، ڕیوایەتی کردووە، کە پێغەمبەر (ﷺ) : (قضی بالیمین مع الشاهد – واتە: بە بوونی سوێند خواردنێك و شاهیدێك قەزاوەتی کردووەو حوکمی داوە.

(عبدالعزیز بن محمد الدَّراوَرْدي) دەفەرموێت: (ربیعة بن أبي عبدالرحمن) لە (سهیل)ەوە ئەمەی بۆ گێڕاومەتەوە، جا بە (سُهیل) گەیشتم پرسیارم لـێ کرد لەسەری بەڵام نەیزانی، وتم: (ربیعة) لە تۆوە ئەمەی بۆ گێڕاومەتەوە جا دوای ئەمە وای لێهات (سهیل) دەی گوت: (عبدالعزیز) بۆی گێڕاومەتەوە لە (ربیعة)ەوە ئەویش لە خۆمەوە، کەوا من بۆم گێڕاوەتەوە لە (أبو هریرة)ـەوە ﷺ بەمەرفوعی کە (حدثني عبدالعزیز عن ربیعة عنيّ أنيّ حدثته عن أبي هریرة ﷺ مرفوعاً بکذا....).

**هـ. بەناوبانگ ترین دانراو لەم بارەیەوە:**

کتێبی (أخبار مَنْ حَدَّثَ وَنَسِيَ)یە، کە دانراوی (الخطیب)ـە.

## المبْحَثُ الثَاني

## فكرة عامة عن كتب الجرح والتعديل

بما أن الحكم على الحديث صحة وضعفاً مبني على أمور منها عدالة الرواة وضبطهم ، أو الطعن في عدالتهم وضبطهم ، لذلك قام العلماء بتصنيف الكتب التي فيها بيان عدالة الرواة وضبطهم منقولة عن الأئمة المُعَدِّلين الموثوقين ، وهذا ما يسمى بـ " التعديل " كما أن في تلك الكتب بيان الطعون الموجهة إلى عدالة بعض الرواة أو إلى ضبطهم وحفظهم كذلك منقوله عن الأئمة غير المتعصبين وهذا ما يسمى بـ " الجَرْح " ومن هنا أُطلق على تلك الكتب " كتب الجرح والتعديل "

وهذا الكتب كثيرة ومتنوعة ، فمنها المُفْرَدَة لبيان الرواة الثقات ، ومنها المفردة لبيان الضعفاء والمجروحين ، ومنها كتب لبيان الرواة الثقات والضعفاء ، ومن جهة أخري فان بعض هذه الكتب عام لذكر رواة الحديث بغض النظر عن رجال كتاب أو كتب خاصة من كتب الحديث، ومنها ما هو خاص بتراجم رواة كتاب خاص أو كتب معينة من كتب الحديث .

هذا ويعتبر عمل علماء الجرح والتعديل في تصنيف هذه الكتب عملا رائعا مهما جبارا إذ قاموا بمسح دقيق لتراجم جميع رواة الحديث وبيان الجرح أو التعديل الموجه إليهم أولاً ثم بيان من أخذوا عنه ومن أخذ عنهم ، وأين رحلوا ، ومتى التقوا ببعض الشيوخ ، وما إلى ذلك من تحديد زمنهم الذي عاشوا فيه بشكل لم يُسْبَقوا إليه ، بل ولم تصل الأمم المتحضرة في هذا العصر إلى القريب مما صنفه علماء الحديث من وضع هذه الموسوعات الضخمة في تراجم الرجال ورواة الحديث ، فحفظوا على مدى الأيام التعريف الكامل برواة الحديث ونقلته فجزاهم الله عنا خيراً وإليك بعض الأسماء لهذه الكتب :

١) التاريخ الكبير للبخاري ، وهو عام للرواة الثقات والضعفاء .

٢) الجرح والتعديل لابن أبي حاتم ، كذلك هو عام للرواة الثقات والضعفاء ويشبه الذي قبله .

٣) الثقات لابن حِبَّان ، كتاب خاص بالثقات .

٤) الكامل في الضعفاء لابن عدي، وهو خاص بتراجم الضعفاء كما هو ظاهر من اسمه.

٥) الكمال في أسماء الرجال لعبد الغني المقدسي، كتاب عام، إلا أنه خاص برجال الكتب الستة.

٦) ميزان الاعتدال للذهبي، كتاب خاص بالضعفاء والمتروكين ( أي كل من جُرح وإن لم يُقْبَل الجَرْحُ فيه )

٧) تهذيب التهذيب لان حجر ، يعتبر من تهذيبات ومختصرات كتاب ( الكمال في أسماء الرجال ) .

# باسی دووەم

## بیرۆکەیەکی گشتی دەربارەی کتێبەکانی

## (الجرح و التعديل)

لەبەر ئەوەی کە حوکم دان بەسەر فەرموودەدا، بەوەی کە صەحیح بێت یان لاواز بێت، لەسەر کۆمەڵە شتێك وەستاوە، لەوانە: ڕاستاڵـی گێڕەرەوەکان (عدالة الرواة)و هێزی لەبەرکردنیان (ضَبْط الرواة)و یان تانەدان لە ڕاستاڵـیو هێزی لەبەر کردنیان (الطعن في عدالتهم و ضبطهم) لەبەر ئەمە زانایان هەستاون بە دانانی کتێب گەلێك، کە تیایاندا مەسەلەی عەدالەت و هێزی لەبەرکردنی گێڕەرەوەکانیان ڕونکردوەتەوە، کە لەو پێشەوا متمانە پێکراوانەوە گواستویانەتەوە، کە کاری (تعديل)یان، کردووە ئەمەیشە کە بە (تعديل) ناسراوە، هەروەك لەو کتێبانەشدا باسی ئەو تانانەی کە ڕوبەڕووی عەدالەتی هەندێ گێڕەرەوە، و هێزی لەبەر کردنیان کراوەتەوە، ڕونکراوەتەوەو ئەمیش هەر لە پێشەوایانی ناڕەگەز پەرست (غير المتعصبين)ەوە، وەرگیراوە، ئەمەیش بە (الجرح) ناوزەدکراوە، هەرلێرەیشەوە ناوی (كتب الجرح و التعديل) بەسەر ئەو کتێبانەدا بڕدراوە.

ئەم کتێبانەش زۆرو هەمە جۆرن، هەیانە تایبەتە بۆ ڕوونکردنەوەی حاڵـی گێڕەرەوە، متمانەپێکراوەکان،وەهەیانە تایبەتەو یەکلاییە بۆ ڕوونکردنەوەی باسی کەسە لاوازو بریندارکراوەکان (الضعفاء و المجروحين)، هەندێ کتێبیش بۆ ڕوونکردنەوەی حاڵـی گێڕەرەوە متمانەپێکراوو و لاوازەکانیش تەرخان کراوە، لە لایەکی تریشەوە هەندێ کتێب گشتین بۆ باس کردنی سەرجەم گێڕەرەوەکان بەبـێ ڕەچاوکردنی پیاوان (رجال)ی تەنها کتێبێك یان چەند

كتێبێكی تایبەت لە كتێبەكانی فەرمودە، هەندێكیان تایبەتن بە ڕوونكردنەوەی ژیاننامەی گێڕەرەوەی كتێبێكی تایبەت یان چەند كتێبێكی دیاریكراو لە كتێبەكانی فەرمودە بۆیە كاری زانایانی (الجرح و التعدیل) لەدانانی ئەم كتێبانەدابەكارێكی جوانو گرنگ و بەهێز دادەنرێت، بەوەی كە هەستاون بە نوسینی ژیاننامەیەكی زۆر وردەكارانە بۆهەموویان.

گێڕەرەوانی فەرمودەوڕونكردنەوەی ئەو(جرح وتعدیل)ەی ئاڕاستەیان كراوە، و پاشان باسی ئەوانەی كە ئەمان شتیان لـێ وەرگرتوونو باسی ئەوانەی كە شتیان لەمان وەرگرتووەو ئایا بەرەو كوێ ڕێ یان كردووە (الرحلة)، وە كەی بە هەندێ لەو مامۆستایانە گەیشتوونو هی تریش دەربارەی سنورداركردنی ئەو كاتەی كە ئەوانە تیایدا ژیاون، بە شێوازێك كە لە دێرزەماندا نەكراوەو بەڵكو گەلانی سیڤیلی ئەم سەردەمەش پێی نەگەیشتوون، نەگەیشتوون بەوەی كە ئەو هەموو زانایانەی فەرمودە ئەو كتێب گەلەو ئینسكلۆپیدیا باڵا یانەیان لە ژیاننامەی پیاوانی فەرمودە (رجال)و دەربارەی گێڕەرەوەكانی فەرموودەوە، داناوە، وە بە درێژایی زەمان پێناسەی تەواوی گێڕەرەوەكانی فەرمودەیان لەبەر كردووەو پاراستوویانەو گواستوویانەتەوە، (فجزا هم الله عنّاخیراً)، ناوی هەندێ لەو كتێبانەت بۆ باس دەكەم:

١.(التأریخ الكبیر)ی (البخاری)، كە گشتییەو سەرجەم گێڕەرەوەی متمانە پێكراو، و لاوازی لە خۆگرتووە.

٢.(الجرح و التعدیل)ی (إبن أبی حاتم) ئەمیش هەر گشتییە بۆ سەرجەم گێڕەرەوەكانی متمانە پێكراوو لاوازو لەوەی پێشەوە دەچێت.

٣.(الثقات)ی (إبن حِبّان) كە تایبەتە بە باسی متمانە پێكراوان.

٤.(الكامل في الضعفاء)ی (إبن عدی) كه تايبەته به ژياننامەی كەسە لاوازەكان (الضعفاء) هەروەك بەناوەكەی دا دیاره.

٥.(الكمال في اسماء الرجال)ی (عبدالغني المقدسي) كه كتێبێكی گشتییە، بەس ئەوەندە هەیە تەنها ناوی پیاوەكانی شەش كتێبەكە (بخاري، مسلم، نسائي، أبو داود، إبن ماجة، ترمذي) باس دەكات.

٦.(ميزان ألأعتدال)ی (إمام الذهبـي)، كه كتێبێكی تايبەته بەباسی لاوازەكانو پشت گوێ خراوان (الضعفاء و المتروكين)، واته: هەموو ئەوانەی كه (جرح) كراون، هەرچەندە (جرح) كردنەكەیشی وەرنەگیرابێت.

٧.(تهذيب التهذيب) ی (إبن حجر) كه به پوختەو كورتەی كتێبی (الكمال في اسماء الرجال) دادەنرێت.

## المبحث الثالث

## مراتب الجرح والتعديل

لقد قسم ابن أبي حاتم في مقدمة كتابه " الجرح والتعديل " كُلاً من مراتب الجرح والتعديل إلى أربع مراتب ، وبين حكم كل مرتبة منها ، ثم زاد العلماء على كل من مراتب الجرح والتعديل مرتبتين ، فصارت كل من مراتب الجرح والتعديل ستاً ، وإليك هذه المراتب مع ألفاظها :

**١- مراتب التعديل وألفاظها:**

أ) ما دلَّ على المبالغة في التوثيق أو كان على وزن أَفْعَل، وهي أرفعها مثل: فلان إليه المنتهي في التثبيت، أو فلان أثبت الناس.

ب) ثم ما تأكد بصفة أو صفتين من صفات التوثيق: كثقة ثقة ـ أو ثقة ثبت.

ج) ثم ما عُبِّرَ عنه بصفة دالة على التوثيق من غير توكيد كثقة، أو حُجَّة.

د) ثم ما دل على التعديل من دون إشعار بالضبط: كصدوق. أو مَحَله الصدق ، و لا بأس به عند غير ابن معين ، فإن " لا بأس به " إذا قالها ابن معين في الراوي فهو عنده ثقة .

هـ) ثم ما ليس فيه دلالة على التوثيق أو التجريح، مثل فلان شيخ، أو روي عنه الناس.

و) ثم ما أَشْعَر بالقرب من التجريح: مثل: فلان صالح الحديث، أو يُكْتَبُ حديثه.

### ٢- حكم هذه المراتب :

أ) أما المراتب الثلاث الأولي فيُحْتَجُّ بأهلها. وان كان بعضهم أقوي من بعض.

ب) وأما المرتبة الرابعة والخامسة فلا يحتج بأهلها، ولكن يُكْتَبُ حديثُهم ويُخْتَبَرُ[٣٠٩]، وأن كان أهل المرتبة الخامسة دون أهل المرتبة الرابعة .

ج) وأما أهل المرتبة السادسة فلا يحتج بأهلها، ولكن يكتب حديثهم للاعتبار فقط دون الاختبار، وذلك لظهور أمرهم في عدم الضبط.

### ٣- مراتب الجرح وألفاظها :

أ) ما دل على التليين: ( وهي أسهلها في الجرح ) مثل فلان لَيِّنُ الحديث أو فيه مَقال.

ب) ثم ما صُرِّح بعدم الاحتجاج به وشبهه : مثل فلان لا يحتج به ، أو ضعيف ، أوله مناكير.

ج) ثم ما صرح بعدم كتابة حديثه ونحوه: مثل فلان لا يكتب حديثه، أو لا تحل الراوية عنه أو ضعيف جداً أو واهٍ بمَرَّةٍ.

د) ثم ما فيه اتهام بالكذب أو نحوه: مثل فلان متهم بالكذب أو متهم بالوضع، أو يسرق الحديث، أو ساقط، أو متروك أو ليس بثقة.

---

[٣٠٩] أي يختبر ضبطهم بعرض حديثهم على أحاديث الثقات الضابطين ، فان وافقهم احتج بحديثهم وإلا فلا . فظهر من ذلك أن من قيل فيه " صدوق " من الرواة لا يحتج بحديثه قبل الاختبار ، وقد أخطأ من ظن أن من قيل فيه "صدوق" فحديثه حسن لان الحسن يحتج به ، هذا ما عله اصطلاح أئمة الجرح والتعديل ، أما الحافظ ابن حجر فقد يكون له اصطلاح خاص في كتاب " تقريب التهذيب " بالنسبة لكلمة " صدوق " والله أعلم .

هـ) ثم ما دل على وصفه بالكذب ونحوه: مثل كذاب أو دجال أو وضاع أو يكذب أو يضع.

و) ثم ما دل على المبالغة في الكذب : (وهي أسوأها) مثل فلان أكذب الناس ، أو إليه المنتهي في الكذب ، أو هو ركن الكذب .

٤- حكم هذه المراتب :

أ) أما أهل المرتبتين الأوليَين فانه لا يُحْتَجُّ بحديثهم طبعاً لكن يكتب حديثهم للاعتبار فقط ، وان كان أهل المرتبة الثانية دون أهل المرتبة الأولي .

ب) وأما أهل المراتب الأربع الأخيرة فلا يحتج بحديثهم ولا يكتب ولا يعتبر به.

# باسی سێهەم

## پلەکانی ( الجرح و التعدیل )

(إبن ابی حاتم) لە پێشەکی کتێبی (الجرح و التعدیل)دا هەموو یەکێك لە پلەکانی (الجرح و التعدیل)ی دابەش کردووە بۆ چوار پلە، وە حوکمی هەموو پلەیەکیانی ڕونکردوتەوە، و پاشان زانایان لەسەر هەموو یەکێك لە پلەکانی (جرح و تعدیل) دوو پلەی تریان زیادکردووە، بۆیە هەموو پلەیەك لە پلەکانی (جرح و تعدیل) بوویە شەش پلە، جا باسی ئەو شەش پلەیەت لە گەڵ دەربڕینەکاندا (ألفاظ) بۆدەکەم:

### ١.پلەو لەفزەکانی (تعدیل):

أ.ئەوەی کە بەڵگەیە لەسەر ڕۆچوون لە بڕوا پێکردندا، یاخود لەسەر وەزنی(أَفْعَلَ)ەیە، کە ئەمەیان بالآترینیانە، وەك، (فلان إلیه المنتهی في التثبت) یان (فلان أثبت الناس).

ب.پاشان ئەوەی کە جەختی لەسەر دەکاتەوە بە صیفەتێك یان دوو صیفەت لە صیفاتەکانی متمانە پێکردن (التوثیق)، وەك (ثقة) یاخود (ثقة ثبت).

جـ.پاشان ئەوەیە کە تەعبیری لێ بکرێت، بە صیفەتێکی ئەوکە بەڵگە بێت لەسەر متمانە پێکردن بەبێ جەخت (تأکید) لەسەر کردنەوەی، وەك (ثقة) یان (حجة).

د.پاشان ئەوەی کە بەڵگەیە لەسەر (تعدیل) بەبێ هەست کردن بە مەسەلەی (ضبط)، وەك (صَدوق) یان (مَحَلهُ الصّدق) یان (لا بأس به عند غیر إبن معین)، چونکە (لا بأس به) ئەگەر (إبن معین) بە ڕاوییەکی گوت، ئەوە (ثقة)یە لەلای ئەو، دەنا وای پێ نەدەگوت.

هـ.پاشان ئەوەیە کە بەڵگەی لـێ نا فامرێتەوە، لەسەر متمانەدار بونی یان (جرح) بوونی، وەك (فلان شیخ) یان (روی عنه الناس).

و.پاشان ئەوەی کە وای لـێ هەست دەکرێت، کە لە (جرح)ـەوە نزیکـە، وەك (فلان صالح الحدیث) یان (یُکتب حدیثه).

**٢.حوکمی ئەم چەند پلەیە:**

أ.سـێ پلەکەی یەکەم، ئەوە خاوەنەکانیان دەکرێنە بەڵگە هەرچەندە هەندێکیان لە هەندێکی تریان بەهێز ترن.

ب.بەڵام پلەی چوارەمو پێنجەم، ئەوا خاوەنەکانیان ناکرێنە بەڵگە (حُجة) بەڵام فەرمودەکانیان دەنوسرێتەوەو تاقی دەکرێتەوە[٣١٠]، هەرچەندە کۆمەڵـی پلەی پێنجەم نزمترن لە پلەی چوارەم.

جـ.بەڵام خەڵکانی پلەی شەشەم، ناکرێنە بەڵگە (فلا یحتج بأهلها)، بەڵام فەرمودەکانیان دەنوسرێتەوە، تەنها بۆ بەدوادا گەڕان، نەك بۆ تاقیکردنەوە، چونکە کارەکانیان بـێ (ضبط)ـی، پێوە دیارە.

---

(٣١٠) واتە: (ضبط) یان تاقی بکرێتەوە بەوەی کە فەرمودەکانیان لەگەڵ فـەرمودەی کەسـانی بیرو هۆش بەهێز بەراورد دەکرێت، ئەگەر هاوڕێکیان بوو، ئەوە فەرمودەکانیان دەکرێنـە بەڵگـە، دەنـا ناکرێن، لێرەوە دەردەکەوێت، ئـەوەی کـە دەربـارەی بگـوترێ (صـدوق) ئـەوە لەوگێڕەرەوانەیەکـە فەرمودەکەی ناکرێتە بەڵگە، ئەمە پێش تاقی کردنەوەیشی، جـا ئـەوەی کـە پێـی وایـە کـە دەربـارەی هەرکەسێك گوترا (صدوق) ئیتر ئـەوە فەرمودەکـەی (حسـن)ە و چـاکە، چـونکە (حسـن) دەکرێتـە بەڵگەو حوججە، ئەوە کە وتوەتە هەڵەوە، ئەمە ئەوەیـە کـە زاراوەی پێشـەوایانی (جـرح و تعـدیل)ی لەسەرە، بەڵام (حافظ إبن حجر) زاراوەیەکی تایبەتی هەیە لە کتێبی (تقریـب التهـذیب)دا، بـۆ وشـەی (صدوق) والله أعلم.

**٣.پلەو لەفزەکانی (الجرح):**

أ.ئەوەی کە بەڵگە بێت لەسەر ئاسانکاری (التليين): کە ئەمەش ئاسانترینیانە لە جەرح کردندا، وەك: (فلان لين الحديث) یاخود (فيه مقال).

ب.پاشان ئەوەیە کە بەڕاستەوخۆ نەکرانە بەڵگەی یان هاو شێوەی ئەمەی...بۆ بەکاردێت، وەك (فلان لا يُحتج به) یان (ضعيف) یان (لَهُ مَناكير)، واتە: کردەوەی ناپەسەندی هەیە.

ج.پاشان ئەوەی کە بەڕاستەوخۆ، باس لەوە کراوە کـە نابێـت فـەرمودەی لــێ بنوسرێتەوە، یان وێنەی ئەمــە، وەك (فـلان لايُكتـب حديثـه) فـەرمودەی نانوسرێتەوە، یاخود ڕیوایـەت کـردن لێـوەی دروســت نـی یـە، یـان لاوازە بەتەواوی (ضعيف جداً) یاخود (واهِ بِمَرّةٍ).

د.پاشان ئەوەی کە تۆمەتبارکردن بە درۆو شتی تریشی هەبێت، وەك (فلان متهم بالكذب) فلاّن کەس تۆمەتبارە بە درۆ، یاخود (فلان متهم بالوضع) فلاّنە کەس تۆمەتبارە بەهەڵبەستنی فەرموودە.

یاخود (يسرق الحديث) فەرمودە ئەدزێ، یاخود (ساقط) پچڕێنەرە، یان (متروك) تەرك کراوە، یاخود (ليس بثقة) متمانەپێکراو نی یە.

هـ.پاشان شتێکی دەربارە بوترێ، کە (بەدرۆکردنو هاو وێنەی ئەمە) وەصفی بکات، وەك (كذاب)و (دجال)و (وضاع) یاخود (يكذب) یان (يضع).

و.یان پاشی ئەمە وەك ئەوەی کە بەڵگە یە لەسەر زۆر درۆزنی (المبالغة في الكذب) کە ئەمە خراپترینیانە، وەك (فلان أكذب الناس) یان (إليه المنتهى في الكذب – ئەو پەڕی درۆی لــێ گرتووە) یان (وهو ركن الكذب) پایەی درۆیە.

**٤.حوكمی ئەو پلە بەندیە:**

أ.ئەهلی دووپلەكەی یەكەم، فەرمودەكانیان ناكرێتە بەڵگە بێگومان، بەڵام فەرمودەكانیان دەنوسرێتەوە، تەنها بۆ (إعتبار – بەدواداگەڕان) هەرچەندە ئەهلی پلەی دووەم كەمتڕن لە پلەی یەكەم.

ب.بەڵام ئەهلی چوار پلەكەی كۆتایی فەرمودەكانیان ناكرێنە بەڵگەو نانوسرێنەوەو ئیعتیباریان پـێ ناكرێ.

# الباب الثالث

## الرواية وآدابها وكيفية ضبطها

- الفصل الأول: كيفية ضبط الراوية، وطرق تحملها.
- الفصل الثاني: آداب الراوية.

## الفصل الأول: كيفية ضبط الراوية وطرق تحملها

- المبحث الأول كيفية سماع الحديث وتحمله وصفة ضبطه.
- المبحث الثاني: طرق التحمل وصيغ الأداء.
- المبحث الثالث: كتابة الحديث وضبطه والتصنيف فيه.
- المبحث الرابع: صفة رواية الحديث.

# بابی سێیەم

## دەربارەی گێڕانەوەو ئادابەکانی و چۆنیەتی لەبەرکردنی

## ( الرواية و آدابها و كيفية ضبطها )

**بەشی یەکەم:** چۆنیەتی لەبەرکردنی ڕیوایەت و ڕێبازەکانی وەرگرتنی.

**بەشی دووەم:** ئادابەکانی ڕیوایەت.

**بەشی یەکەم: چۆنیەتی لەبەرکردنی ڕیوایەت و ڕێبازەکانی وەرگرتنی**

**باسی یەکەم:** چۆنیەتی بیستنی فەرمودەو وەرگرتنیو شێوازی لەبەر کردنی.

**باسی دووەم:** ڕێبازەکانی وەرگرتن و شێوازەکانی دانەوە، (الأداء).

**باسی سێهەم:** نوسینەوەی فەرمودەو لەبەر کردنیو کتێب دانان تیایدا.

**باسی چوارەم:** شێوازی گێڕانەوەی فەرمودە (صفة رواية الحديث).

# المبحث الأول

## كيفية سماع الحديث وتحمله وصفة ضبطه

### ١ – تمهيد:

المراد " بكيفية سماع الحديث " بيان ما ينبغي وما يشترط فيمن يريد سماع الحديث من الشيوخ سماع رواية وتحمل ،ليؤديه فيما بعد لغيره ،وذلك مثل اشتراط سِنّ معينة وجوباً أو استحباباً .

والمراد " بتَحَمُّلِهِ " بيان طرق أخذه وتلقيه عن الشيوخ والمراد " ببيان ضبه " أي كيف يضبط الطالب ما تلقاه من الحديث ضبطاً يؤهله لأن يرويه لغيره على شكل يُطْمَأنُّ إليه .

وقد اعتني علماء المصطلح بهذا النوع من علوم الحديث، ووضعنا له القواعد والضوابط والشروط بشكل دقيق رائع. وميزوا بين طرق تحمل الحديث ، وجعلوها على مراتب ، بعضها أقوى من بعض ، وذلك تأكيداً منهم للعناية بحديث رسول الله صلي الله عليه وسلم ، وحسن انتقاله من شخص إلى شخص ، كي يطمئن المسلم في طريقة وصول الحديث النبوي إليه ، ويوقن أن هذه الطريقة في منتهي السلامة والدقة

### ٢– هل يُشْتَرَطُ لتحمل الحديث الإسلام والبلوغ ؟

لا يشترط لتحمل الحديث الإسلام والبلوغ على الصحيح لكن يشترط ذلك للأداء [٣١١] ـ كما مر بنا في شروط الراوي ـ وبناء على ذلك فتقبل رواية المسلم البالغ ما تحمله من الحديث قبل إسلامه ، أو قبل بلوغه ، لكن لا بد من التمييز بالنسبة لغير البالغ .

---

[٣١١] التحمل : معناه تلقي الحديث وآخذه عن الشيوخ ،والأداء : رواية الحديث وإعطاؤه للطلاب .

وقد قيل انه يشترط لتحمل الحديث البلوغ، ولكنه قول خطأ، لأن المسلمين قبلوا رواية صغار الصحابة كالحسن وابن عباس وغيرهما من غير فرق بين ما تحملوه قبل البلوغ أو بعده .

**٣- متى يُستَحَبُّ الابتداء بسماع الأحاديث؟**

أ) قيل يستحب أن يبتدئ بسماع الحديث في سن الثلاثين وعليه أهل الشام.

ب) وقيل في سن العشرين ، وعليه أهل الكوفة .

ج) وقيل في سن العاشرة ، وعليه أهل البصرة .

د) والصواب في الإعصار المتأخرة التبكير بسماع الحديث من حيث يصح سماعه، لأن الحديث منضبط في الكتب.

**٤- هل لصحة سماع الصغير سن معينة ؟**

أ) حدد بعض العلماء ذلك بخمس سنين، وعليه استقر العمل بين أهل الحديث.

ب) وقل بعضهم: الصواب اعتبار التمييز، فان فَهِمَ الخطاب، ورَدَّ الجواب، كان مُمَيِّزاً صحيح السمع وإلا فلا.

# باسی یەکەم

## چۆنیەتی بیستنی فەرمودەو وەرگرتنی و شێوازی لەبەرکردنی

### ١. ڕێخۆشکردن:

مەبەست لە چۆنیەتی بیستنی فەرموودە، بریتیەلە ڕونکردنەوەی ئەوەی کە پێویستەو بەمەرج گیراوە بۆ کەسێك کە دەیەوێت گوێ ڕابگرێ لە مامۆستاکان (الشیوخ) تا ڕیوایەتەکانیان ببیستێ، و لێیانەوە وەری بگرێت، تا لە دواییدا بیداتەوە بە کەسانی تر، ئەمەش وەك بەمەرج گرتنی تەمەنێکی دیاریکراو، ئیتربە پێویست (وجوب) بێت، یان بە سوننەت (ألأستحباب).

وە مەبەست لە (تحمل —وەرگرتن) ڕونکردنەوەی ڕێبازەکانی وەرگرتنە لە مامۆستاکانەوە، وە مەبەست لە ڕونکردنەوەی هێزی لەبەرکردن (ضبط)، واتە: چۆن ئەو قوتابیە ئەو فەرمودەیەی کە پێی گەیشتووە، چاك لەبەری دەکات، تا بەو شێوەیەی کە بیستوویەتی بیگێڕێتەوە بۆ کەسانی تر بە شێوازێك کە لێی دڵ دامەزراوو دڵنیا بێت، جا زانایانی زاراوە ناسی بایەخیان داوە بەم جۆرەی زانستی فەرموودە.

چەند یاساو ڕێسایەك (قواعد و ضوابط)و مەرجێکیان بۆ داناوە، بەشێوەیەکی وردەکارانەو جوان، وە جیاوازییان لە نێوان ڕێبازەکانی وەرگرتنی فەرمودەدا کردووە، وکردویانەتە چەند پلەیەکەوە، کە هەندێکیان لە هەندێکی تریان بەهێز ترن، ئەمەش وەك جەخت کردنەوەیان لەسەر بایەخ دان بەفەرمودەکانی پێغەمبەر (ﷺ) وە گواستنەوەی بەچاکی لە کەسێکەوە بۆ کەسێکی تر، تا مسولمان دڵنیا بێت لەو ڕێگایەی کە فەرمودەکەی پێغەمبەری (ﷺ) پێ گەیشتووە، وە لە دڵنیایی تەواودا بێت، کە ئەو ڕێگایە لەو پەڕی سەلامەتیو وردەکاریدایە.

**٢.ئایا موسڵمانێتی و باڵغ بوون بۆ وەرگرتنی فەرموده بە مەرج گیراوە؟**

بەمەرج نەگیراوە بۆ (وەرگرتن – تحمل)ی فەرمودە، موسڵمانێتیو باڵغ بوون، ئەمە لەسەر گوتەی صەحیح، بەلاّم ئەمە بۆ دانەوە (أداء)[٣١٢] بەمەرج گیراوە، هەروەك لەمەرجەكانی ڕاویدا بەسەرماندا ڕابورد– لەسەر ئەمەوە گێڕانەوەی موسڵمان و كەسی باڵغ وەردەگیرێ، ئەوەی كە پێش مسوڵمان بوونی وەری گرتبێ، یاخود پێش باڵغ بوونیشی وەری گرتبێ، بەلاّم پێویستە (جیا كردنەوەی چاك لە خراپ – تمییز)ی هەبێت لە چاو كەسی نابالغ دا.

گوتراویشە كە باڵغ بوون بەمەرج گیراوە بۆ وەرگرتنی فەرمودە، بەلاّم ئەمە گوتەیەكی هەڵەیە، چونكە مسوڵمانان ڕیوایەتی صەحابی بچكۆلەیشیان وەرگرتووە، وەك (حسن) و (إبن عباس)و بەبــێ جیاوازی كردن لەنێوان ئەوەدا كە وەرگرتنەكە پێش كاتی باڵغ بوون بووە، یان دوای ئەو.

**٣.سوننەت وایە كەی دەست بكرێ بە گوێ گرتن لە فەرمودە؟**

أ.گوتراوە كە سوننەت وایە دەست بكرێت بەگوێ گرتن لە فەرمودە لە (٣٠) سی ساڵیدا، و ئەمەش زانایانی شام لەسەری دەڕۆن.

ب.وە گوتراویشە لە (٢٠) بیست ساڵیدا، ئەمە كوفییەكانی لەسەرە.

جـ.وە گوتراویشە لە (١٠) دە ساڵیدا، كە ئەمەش بەصرییەكانی لەسەرە.

د.بەلاّم ئەوانەی كە پێكاویانە لەم چەرخەی دواییەدا، ئەوەیە كە هەر لەسەرەتای منداڵیەوە گوێ لە فەرمودە بگرێت، هەر لەو كاتەوە كە هێزی بیستنی باش بوو، چونكە فەرمودە لە كتێبەكاندا نوسراوەتەوەو پارێزراوە.

---

(٣١٢) (وەرگـرتن – التحمـل): ماناكـەی وەرگرتنـی فەرمودەیـە لــە مامۆسـتاوە، و (الأداء) گێڕانەوەی فەرمودەیەو دانەوەیەتی بە قوتابی.

**٤.ئايا بۆ صەحيح بوونی بيستنی منداڵ تەمەنێكی دياريكراو هەيە؟**

أ.هەندێ لە زانايان دياريبيان كردووە بە پێنج ساڵ كە كاری زانايانی فەرمودە لەسەر ئەمە جێگير بووە.

ب.وە هەندێكی تريشيان وتويانە: قسەی ڕاست لەسەر ئەوەيە: كە حيساب بۆ (تمييز)ی ئەو كەسە دەكرێت، ئەگەر لە شت تێدەگەيشت و وەڵامی دەدايەوە، ئەوە بە (جياكار – مُمَيِّزْ) دادەنرێت‌و بيستنی صەحيحە، دەنا بە پێچەوانەوە نابێت.

## المبحث الثاني

## طُرُقُ التَّحَمُّل وصِيَغْ الأداء

طُرُق تحمل الحديث ثمانية وهي : السماع من لفظ الشيخ القراءة على الشيخ ، الإجازة ، المناولة ، الكتابة ، الإعلام ، الوصية ، الوجادة .

وسأتكلم على كل منها تباعاً باختصار ، مع بيان ألفاظ الأداء لكل منها باختصار أيضاً.

## باسی دووەم

## ڕێبازەکانی وەرگرتن و شێوازەکانی دانەوە

## ( طُرُقُ التَّحمُّل و صِيَغ الأداء )

ڕێبازەکانی وەرگرتنی فەرمودە هەشت ڕێگان کە بریتین لە:

*بیستن لە خودی دەربڕینی مامۆستاکە (السماع من لفظ الشيخ).

*خوێندنەوە بەسەر مامۆستاکەدا. (القراءة على الشيخ).

*مۆڵەت پێ دان، (الإجازة).

*پێ بەخشین (المناولة).

*نوسینەوە (الكتابة).

*پێ ڕاگەیاندن (الإعلام).

*وەسیەت پێ کردن (الوصية).

*بینینەوە (الوجادة).

وە قسە لەسەر هەموو یەکێکیان بەیەك لەدوای یەکی‌و بەکورتی دەکەم، لەگەڵ ڕونکردنەوەی لەفزەکانی دانەوە، (ألفاظ ألأداء)، بۆ هەموو یەکێکیان بە کورتی.

**١- السماع من لفظ الشيخ :**

أ) صورته: أن يقرأ الشيخ ، ويسمع الطالب ، سواء قرأ الشيخ من حفظه أو كتابه ، وسواء سمع الطالب وكتب ما سمعه ، أو سمع فقط ولم يكتب .

ب) رتبته: السماع أعلى أقسام طرق التحمل عن الجماهير .

ج) ألفاظ الأداء:

١- قبل أن يشيع تخصص بعض الألفاظ لكل قسم من طرق التحمل ، كان يجوز للسامع من لفظ الشيخ أن يقول في الأداء : "سمعت أو حدثني أو أخبرني أو أنبأني أو قال لي أو ذكر لي"

٢- وبعد أن شاع تخصيص بعض الألفاظ لكل قسم من طرق التحمل، صارت ألفاظ الأداء على النحو التالي:

- للسماع: سمعت - أو حدثني
- للقراءة: أخبرني.
- للإجازة: أنبأني .
- لسماع المذاكرة[٣١٣]: قال لي - أو ذكر لي.

---

[٣١٣] سماع المذاكرة غير سماع التحديث ، إذا أن سماع التحديث يكون قد استعد له الشيخ والطالب تحضيراً وضبطاً قبل المجيء لمجلس الحديث أما المذاكرة فليس فيها ذلك الاستعداد .

**٢- القراءة على الشيخ :**

ويسميها أكثر المحدثين " عَرْضاً "

أ) صورتها: أن يقرأ الطالب والشيخ يسمع [٣١٤] ، سواء قرأ الطالب ، أو قرأ غيره وهو يسمع ، وسواء كانت القراءة من حفظ أو من كتاب ، وسواء كان الشيخ يُتَبِّعُ للقارئ من حفظه أو أمسك كتابه هو ، أو ثقة غيره .

ب) حكم الراوية بها: الراوية بطريق القراءة على الشيخ رواية صحيحة بلا خلاف في جميع الصور المذكورة إلا ما حُكي عن بعض من لا يعتد به من المتشددين

ت) رتبتها : اختلف في رتبتها على ثلاثة أقوال .

١-مساوية للسماع: رُوي عن مالك والبخاري، ومعظم علماء الحجاز والكوفة

٢-أدني من السماع : روي عن جمهور أهل المشرق " وهو الصحيح " .

٣-أعلي من السماع: روي عن أبي حنيفة وابن أبي ذئب، ورواية عن مالك.

د) ألفاظ الأداء :

١- الأحوط : " قرأت على فلان " أو " قرئ عليه وأنا أسمع فأقرَّ به " ".

٢- ويجوز: بعبارات السماع مقيدة بلفظ القراءة كـ " حدثنا قراءة عليه ".

٣ – الشائع الذي عليه كثير من المحدثين: إطلاق لفظ " أخبرنا " فقط دون غيرها.

---

[٣١٤] المراد بذلك أن يقرأ الطالب الأحاديث التي هي من مرويات الشيخ لا أن يقرأ ما شاء من الأحاديث،وذلك لأن الغاية من قراءة الطالب على الشيخ ، أن يسمعها الشيخ منه ليضبطها له .

١.بیستن لە دەربڕینی مامۆستاوە:

**أ.شێوازەکەی:** ئەوەیە کە مامۆستاکە بخوێنێتەوەو قوتابییەکە گوێی لێ بگرێت، ئیتر چونیەکە، ئایا مامۆستا بە لەبەر بیخوێنێتەوە یان لەبەر کتێب بیخوێنێتەوە؟ وە هەروەها چونیەکیشە کە قوتابیەکە گوێ بگرێت و ئەوەی کە دەیبیستێ بینوسێ، یاخود تەنها گوێ بگرێت و نەنوسێت؟.

**ب.پلەکەی:** بیستن بالآترین پلەی بەشەکانی ڕێبازی وەرگرتنی فەرمودەیە لەلای جەماوەری زانایان.

**جـ.دەربڕینەکانی دانەوە (ألفاظ الأداء):**

١.پێش ئەوەی کە تایبەت کردنی هەندێك لەفز بۆ هەموو یەکێ لەبەشەکانی ڕێبازی وەرگرتن بلاوببێتەوە، دروستە بۆ ئەو کەسەی کە شتەکە لە لەفزی مامۆستاکەوە دەبیستێ، کە لەکاتی دانەوەیدا بلێت، (سمعت) یان (حدثني) یان (أخبرني) یان (أنبأني) یان (قال لي) یان (ذكرلي).

٢.بەلام دوای ئەوەی کە تایبەت کردنی هەندێ لەفز بۆ هەموو بەشێ لە ڕێبازەکانی وەرگرتن بلاوبویەوە، ئەوا پێویستە دەربڕینەکان بەم جۆرەی خوارەوە بن:

*بۆ بیستن: (سمعت) یان (حدثني).

*بۆ خوێندنەوە: (أخبرني).

*بۆ مۆلەت پێدان: (أنبأني).

*بۆ بیستنی دەماو دەمی کتوپڕ (السماع المذاكرة)[٣١٥]: (قال لي) یان (ذكرلي).

(٣١٥) (سماع المذاكرة) و (سماع التحديث) جیان، چونکە (سماع التحديث) دەبێت کە ئەو مامۆستاو قوتابییە کە خۆیان ئامادە کردبێت، پێش هاتنیان بۆ دیوانی گێڕانەوەی فەرمودە (مجلس التحديث)، بەلام (مذاكرة) ئەو ئامادەکاریەی تیادا نییە.

**٢.خوێندنەوە بەسەر مامۆستادا:**

کە زۆرینەی فەرمودە ناسان بە (عَرْضْ) ناوزەدیان کردووە.

**أ.شێوازەکەی:** ئەوەیەکە قوتابییەکە بخوێنێتەوەو مامۆستاکەش گوێ ڕابگرێت[٣١٦]، ئیتر چونیەکە، کە قوتابییەکە بیخوێنێتەوە، یان کەسێکی تر بیخوێنێتەوەو ئەو گوێ بگرێت، چونیەکیشە خوێندنەوەکە لەبەر کردن بێت، یان لەبەر کتێب بیخوێنێتەوە، چونیەکیشە کە مامۆستاکە شوێن خوێنەرەکە بکەوێت لە لەبەرکردنەکەی خۆیدا، یاخود کتێبەکەی لــێ بگرێت.

**ب.**حوکمی گێڕانەوەی لەم جۆرە گێڕانەوەیە بەڕێگای خوێندنەوە بەسەر مامۆستادا گێڕانەوەیەکی صەحیحە، بەبــێ جیاوازیو لەسەر جەم ئەو شێوازانەدا کە باسکران، تەنها ئەوە نەبێت کە لە هەندێ لە توندڕەوان بیستراوە کە کاری پــێناکرێت.

**جـ.پلەکەی: جیاوازی هەیە لەسەر پلەکەی بەســێ گوتە:**

١.هاوتای بیستن (سماع)ە، ئەمەش لە (مالك)و (بخاری)و زانا گەورەکانی (حجاز) و (کوفە) گێڕدراوەتەوە.

٢.پلەکەی نزمترە، لە بیستن (سماع): ئەمەش لە جەماوەری زانایانی ڕۆژهەلات گێڕدراوەتەوە، کەگوتەیەکی صەحیحە.

٣.بەرزترە لە بیستن، کە ئەمەش لە (ابو حنیفة) و (إبن أبي ذئب)و ڕیوایەتێکیش لە (مالك)ەوە گێڕدراوەتەوە.

---

(٣١٦) مەبەست لەمە ئەوەیە کە قوتابییەکە ئەو فەرمودانە بخوێنێتەوە کە مامۆستاکەی ڕیوایەتی کردووە، نەك ئەوەی کە بەحەزی خۆی فەرمودە بخوێنێتەوە، چونکە مەبەستو ئامانج لە خوێندنەوەی قوتابی بەسەر مامۆستا کەیدا، ئەوەیە کە مامۆستاکە گــوێی لــێ ڕابگرێــت، تــا بــۆی ڕاســت و چــاك (ضبط) بکاتەوە.

د.دەربڕینەکانی دانەوه (ألفاظ الأداء):

١.بەکەمی ئەمانه (قرأت على فلان) یان (قُرئ عليه و أنا اسمع فأقرَ به).

٢.وه دروسته کە بەدەستەواژەکانی بیستنی پەیوەستکراو بە لەفزی (قراءة)، وەك (حدثنا قرأءة عليه).

٣.ئەو دەربڕینه بلاوه کە زۆرینەی فەرموده ناسانی لەسەرە: بریتیەلە زۆری بەکارهێنانی، (أخبرنا) تەنها خۆی، نەك لەفزەکانی تر.

٣- الإجازة:

أ) تعريفها: الأذن بالرواية لفظا أو كتابة.

ب) صورتها: أن يقول الشيخ لأحد طلابه: " أَجَزْتُ لك أن تروي عني صحيح البخاري ".

ج) أنواعها: للإجازة أنواع كثيرة، سأذكر منها خمسة أنواع هي:

١- أن يُجيز الشيخُ مُعَيَّناً لُمعَيَّن : كأجزتك صحيح البخاري ، وهذا النوع أعلى أنواع الإجازة المُجَرَّدة عن المناولة .

٢- أن يُجيز مُعَيَّناً بغير مُعَيَّن : كأجزتك روية مَسْمُعاتي .

٣- أن يُجيز غير مُعَيَّن بغير مُعَيَّن : كأجزتك أهل زماني رواية مسموعاتي .

٤- أن يُجيز بمجهول أو لمجهول : كأجزتك كتاب السُّنَن ، وهو يَرْوي عدداً من السُّنَنِ ، أو أجزت لمحمد بن خالد الدمشقي ، وهناك جماعة مشتركون في هذا الاسم .

٥- الإجازة للمَعْدوم : فإما أن تكون تَبَعاً لموجود ، كأجزت لفلان ولم يُوْلَد له ، وإما أن تكون لمعدوم استقلالا ، كأجزت لمن يولد لفلان .

د) حكمها :

أما النوع الأول منها فالصحيح الذي عليه الجمهور واستقر عليه العمل جواز الراوية والعمل بها، وأبطلها جماعات من العلماء، وهو أحدي الروايتين عن الشافعي.

وأما بقية الأنواع فالخلاف في جوازها أشد وأكثر، وعلى كل حال فالتحمل والرواية بهذا الطريق ( أي الإجازة ) تحمل هزيل ما ينبغي التساهل فيه.

هـ) ألفاظ الأداء :

١- الأولي: أن يقول: " أجاز لي فلان "

٢- ويجوز : بعبارات السماع والقراءة مقيدة مثل " حدثنا إجازة " أو " أخبرنا إجازة "

٣- اصطلاح المتأخرين : " أنبأنا " واختاره صاحب كتاب " الوجازة " [٣١٧]

**٤- المناولة:**

أ) أنواعها: المناولة نوعان.

١- مقرونة بالإجازة: وهي أعلي أنواع الإجازة مطلقاً. ومن صورها أن يدفع الشيخ إلى الطالب كتابه ويقول له: هذا روايتي عن فلان فاروه عني، ثم يبقيه معه تمليكاً أو إعارة لينسخه.

٢- مُجَرَّدة عن الإجازة: وصورتها أن يدفع الشيخ إلى الطالب كتابه مقتصرا على قوله هذا سماعي.

---

[٣١٧] هو أبو العباس الوليد بن بكر المعمري واسم كتابة الكامل " الوجازة في تجويز الإجازة .

ب) حكم الرواية بها :

١- أما المقرونة بالإجازة: فتجوز الرواية بها، وهي أدني مرتبة من السماع والقراءة على الشيخ.

٢- وأما المجردة عن الإجازة : فلا تجوز الرواية بها على الصحيح .

ج) ألفاظ الأداء :

١- الأحسن: أن يقول : " ناولني " أو " ناولني " وأجاز لي " إن كانت المناولة مقرونة بالإجازة .

٢- ويجوز بعبارات السماع والقراءة مقيدة مثل " حدثنا مناولة " أو " أخبرنا مناولة وإجازة".

٣.بۆ مۆڵەت پێدان (الإجازة):

**أ.پێناسەکەی:** بریتییەلەمۆڵەتدان بە گێڕانەوە، ئیتر گێڕانەوە بەدەربڕین (تلفظ) بێت، یان بە نوسینەوە.

**ب.شێوازەکەی:** ئەوەیە کە مامۆستاکە بە یەکێك لە قوتابیەکانی بلێت: (أَجَزْتُ لك أن تروي عني صحيح البخاري:مۆڵەتم پـێدای کە لە منەوە صەحیحی بوخاری بگێڕیتەوە).

**ج.جۆرەکانی:** مۆڵەتدان جۆری زۆرە: پێنج جۆریان باس دەکەم کە ئەمانەن:

١.ئەوەیە کە مامۆستاکە مۆڵەتی شتێکی دیاریکراو بدات، بۆ کەسێکی دیاریکراو، وەك (أجزتك صحيح البخاری:مۆڵەتم پێدایت بۆ صەحیحی بوخاری) ئەم جۆرەش باڵاترین جۆرەکانی مۆڵەت پێدانە بێ، پـێ بەخشین (مناولة)ەیە.

٢.ئەوەیە کە شێخەکە مۆڵەتی شتێکی دیاریکراو بە کەسێکی دیاری نەکراو بدات، وەك (أجزتك رواية مسموعاتي) مۆڵەتم پـێ دایت بە گێڕانەوەی ئەو شتانەی کە لـە منەوە بیستوتن.

٣.ئەوەیە کە مامۆستاکە مۆڵەتی شتێکی دیاری نەکراو بەکەسێکی دیاری کراویان، دیاری نەکراوبدات، وەك (أجزتُ أهل زماني رواية مسموعاتي، واتە: مۆڵەتم دا بە خەڵکانی سەردەمەکەم، کە ئەو شتانەی کە لێمەوە بیستوویانە بیگێڕنەوە).

٤.ئەوەیە کە مامۆستا مۆڵەتی گێڕانەوەی شتێکی نەزانراو، و نادیار، بەکەسێکی نادیار بدات، وەك: (أجزتك كتاب السنن–واتە: مۆڵەتم پـی دایت کە کتێبی سوننەم لـێ بگێڕیتەوە) کە ئەو کەسەش ژمارەیەك (سُنَنْ)ی گێڕاوەتەوە، یان بڵێت: (أجزتُ لمحمد بن خالد الدمشقي —واتە: مۆڵەتم بە موحەممەدی کوڕی خالیدی ئەلدیمەشقی دا) کەچی لێرەدا کۆمەڵێك کەس هەن کە ئەو ناوەیان هەیە.

٥.مۆڵەت دان بە شتێکی نادیارو نەبوو: ئەمەشیان شوێن کەوتەی شتێکی بەدی هاتوو (موجود)ە، وەك (اجزت لفلان و لمن يولد لَهُ – مۆڵەتم دا بە فلاّن کەسو ئەوەیش کە لـەو دەبێت)، یان هەر بۆکەسێکی نەبوویە، بەسەربەخۆیی، وەك (أجزتُ لمن يولد لفلان – مۆڵەتم دا بەو کەسەی کە لـە فلاّنە کەس دەبێت).

### د.حوکمەکەی:

جۆری یەکەمیان بەگوێرەی ئەوەی کە جەماوەری زانایانی لـەسەرەو صەحیحەو کارپێکردنی جێگیربووە، ئەوەیە کە ڕیوایەت لێوەکردنیو

کارپێکردنی دروسته، بەڵام هەندێ لە زانایان بەتاڵیان کردوتەوە، کە ئەوەش یەکێکە لەو دوو ڕیوایەتەی کە لە (إمام شافعي) گێڕدراوەتەوە، بەڵام بۆ دروست بوونی جۆرەکانی تر، ڕاجیایی زیاترو توندتری لەسەرە، لە هەموو حاڵێکدا وەرگرتن و گێڕانەوە بەرێگای مۆڵەت پێدان (ألأجازة)، (وەرگرتن:تحمل)ێکی لاوازەو پێویستە ئاسانکاری تیادا بکرێت.

**هـ.دەربڕینەکانی دانەوە (ألفاظ الأداء):**

١.چاکتروایە کە بڵێت: (أجاز لـي فلان).

٢.وە دروستیشە: بەدەستەواژەکانی بیستن و خوێندنەوە کە (قید)ێکیان پێوە بێت، وەك (حدثنا أجازة) یان (أخبرنا أجازة).

٣.زاراوەی ئەم زانایانەی دوایی (ألمتأخرين): بریتیە لە (أجزنا) کە خاوەنی کتێبی (ألوجازة)[٣١٨]یش پشتی پـێ بەستووە.

**٤.پـێ بەخشین (المناولة):**

**أ.جۆرەکانی: پـێ بەخشین دوو جۆرە:**

١.پـێ بەخشین لەگەڵ مۆڵەت پێداندا، کە ئەمەیان بە شێوەیەکی گشتی باڵاترین جۆرەکانی مۆڵەت پێدانە، لە شێوازەکانی وەك ئەمەی کە مامۆستاکە کتێبەکەی بداتە قوتابییەکەی، پێی بڵێت: (هذا روايتي عن فلان فأروه عني — واتە: ئەوە ڕیوایەتی منن، کە لە فلانە کەسەوە وەرم گرتووە تۆش لەمنیەوە بگێڕەوە)پاشان ئەو کتێبە یان بەموڵکداریتی لای کابرا دەمێنێتەوە، یاخود نوسخەیەکی لـێ دەگرێتەوە بۆ خۆی.

(٣١٨) ئەوە (أبو العباس الوليد بن بكر المعمري)یە، وە ناوی تـەواوی کتێبەکـەی (ألوجـازة في تجويز الأجازة)ەیە.

٢.پـێ بەخشین بەبـێ مۆڵەت پێدان، وە شێوازەکەیشی ئەوەیە کە مامۆستاکە کتێبەکەی بداتە قوتابیەکەیو بە دەستەواژەی (هذا سماعي - ئەو شتانەی کە بیستومە) لە کورتیدا بیبڕێتەوە.

**ب.حوکمی گێڕانەوەی لەم جۆرە:**

١.ئەوەی کە مۆڵەتی لەگەڵدایە، دروستە گێڕانەوەی وە ئەمە پلەکەی لە (بیستن - السماع) و (خوێندنەوە بەسەر مامۆستادا - القرأءة على الشيخ) نزمترە.

٢.بەڵام پـێ بەخشینی بـێ مۆڵەت، لەسـەر گوتـەی سـاغ گێڕانـەوە پێـی دروست نییە.

**ج.دەربڕینەکانی دانەوە (ألفاظ الأداء):**

١.باشتروایە بڵێت: (ناولني - پێی بەخشیم) یان (ناولني و أجاز لـي - پێێ بەخشیم و مۆڵەتـی پێدام) ئەمە ئەگەر پـێ بەخشینەکە مۆڵەتی لەگەڵدا بوو.

٢.وە دروستیشە بە دەستەواژەکانی (السماع) و (القراءة)، بەڵام بە پەیوەستکراوی (مُقيَّدة)، وەك (حدثنا مناولة) یان (أخبرنا مناولة و أجازة).

**٥- الكتابة:**

أ) صورتها: أن يكتب الشيخ مَسْمُوْعَهُ لحاضر أو غائب بخطه أو أمره .

ب) أنواعها: وهي نوعان:

١- مقرونة بالإجازة : كأجزتك ما كتبت لك أو إليك ونحو ذلك .

٢- مُجَرَّدة عن الإجازة : كأن يكتب له بعض الأحاديث ويرسلها له ، ولا يجيزه بروايتها .

ج) حكم الرواية بها :

١- أما المقرونة بالإجازة : فالرواية بها صحيحة ، وهي في الصحة والقوة كالمناولة المقرونة .

٢- وأما المُجَرَّدَة عن الإجازة : فمنع الرواية بها قوم ، وأجازها آخرون ، والصحيح الجواز عند أهل الحديث لإشهارها بمعني الإجازة .

د) هل تُشْتَرَط البَيِّنَةُ لاعتماد الخَطِّ ؟

١- اشترط بعضهم البينة على الخط، وادعوا أن الخط يشبه الخط، وهو قول ضعيف.

٢- ومنهم من قال: يكفي معرفة المكتوب إليه خَطٌّ الكاتب، لأن خط الإنسان لا يشتبه بغيره، وهو الصحيح.

هـ) ألفاظ الأداء:

١-التصريح بلفظ الكتابة: كقوله " كتب إلى فلان ".

٢-أو الإتيان بألفاظ السماع والقراءة مقيدة : كقوله " حدثني فلان أو اخبرني كتابة " .

**٦- الإعلام:**

أ) صورته: أن يخبر الشيخ الطالب أن هذا الحديث أو هذا الكتاب سماعه.

ب) حكم الرواية به: اختلف العلماء في حكم الرواية بالإعلام على قولين .

١- الجواز: كثير من أصحاب الحديث والفقه والأصول.

٢- عدم الجواز: غير واحد من المحدثين وغيرهم، وهو الصحيح، لأنه قد يعلم الشيخ أن هذا الحديث روايته لكن لا تجوز رويته لخلل فيه، نعم لو أجازه بروايته جازت روايته.

ج) ألفاظ الأداء:

يقول في الأداء : " أعلمني شيخي بكذا " .

٥.نووسینەوە (الكتابة):

أ.شێوازەکەی:وەك ئەوەی کە مامۆستاکە ئەوەی کە بیستوویەتی بینوسێتـەوە بۆ کەسێکی ئامادە (حاضر) یان نائامادە (غائب)، بەخەتی خۆی، یان بەفەرمانی خۆی.

ب.جۆرەکانی دوانن:

١.نوسینەوەی مۆڵەت دار، وەك (أجزتك ماكتبت لـك أو إليك – ئەوەی کە بۆم نوسیت و پێم دایت، یان بۆم ڕەوانە کردی، مۆڵەتت بێت)و ...هتد.

٢.نوسینەوەی بــێ مۆڵەت: وەك ئەوەی کە فەرمودەگەلێکی بۆ بنوسێت و بۆی ڕەوانە بکات، بەڵام مۆڵەتی گێڕانەوەیان نەدات.

جـ.حوکمی گێڕانەوەی بەم جۆرە:

١.نوسینەوەی مۆڵەت دار گێڕانەوە پێی دروستە، وە لـەڕووی ساغیو بەهێزییەوە، وەك (پێ بەخشینی مۆڵەت دار وایە).

٢.بەڵام نوسینەوەی بــێ مۆڵەت: هەندێ کەس جلەو گیریان کردووە لـە گێڕانەوەی، وهەندێکیش ڕێگەیان داوە، بەڵام گوتەی ساغ لـەسەر ئەوەیە کە دروستە، ئەمە لـەلای زانایانی فەرمودە، لـەبەر ئەوەی کە مانای مۆڵەتی لێوە هەست دەکرێت.

**د.ئایا بەڵگەو ڕونکردنەوە (البَیِّنَة) پێویستە بۆ پشت بەستن بەو خەتە؟**

١.هەندێکیان بوونی ڕونکردنەوە لەسەر ئەو خەتەیان بەمەرج گرتووە، وە بانگەشەی ئەوەیان کردوە، کە خەت لەخەت دەچێت، کە ئەمەش قسەیەکی لاوازە.

٢.هەندێکیشیان گوتویانە، هەر ئەوەندەی کە ئەو کەسەی کە خەتەکەی بۆ نوسراوە بیناسێتەوە بەسە، چونکە خەتی مرۆڤ بەهی یەکێکی تر تێکەڵ نابێت، کە ئەم گوتەیەش صەحیحە.

**هـ.دەربڕینەکانی دانەوە (الفاظ الأداء):**

١.ڕاستەو خۆ درکاندنی لەفزی (کتابة)، وەك: (کتب إِلـيَّ فلان) فلاّن کەس بۆی نوسیم.

٢.یان هێنانی لەفزی (السماع) و (القراءة) بە موقەییەدی، وەك (حدثني فلان) یان (أخبرني کتابة – هەواڵــی پێدام بەنوسراوەیی).

٦.ڕاگەیاندن (الإعلام):

**أ.شێوازەکەی:** ئەوەیە کە مامۆستاکە هەواڵ بدات بە قوتابییەکەی کە ئەو فەرمودەیە یان ئەو کتێبە لەو شتانەیە کە ئەو بیستوویەتی.

**ب.حوکمی گێڕانەوەی:** زانایان لەسەر دوو گوتەن بۆ حوکمی گێڕانەوە بەپێی ڕاگەیاندن.

١.دروستە:کەئەمەش گوتەی زۆرینەی زانایانی فەرمودەو شەرع و ئوصولە.

**٢.دروست نييه:** كه وتەی لە یەكێك زیاتر، لە فەرموودە ناسان، و لە غەیری فەرموودە ناسانە، كە ئەمەش دروستە، چونكە مامۆستاكە كەم جار دەزانێت كە ئەو فەرمودەیە لەگێڕانەوەی ئەوە، بەلاّم بۆی نییە ڕیوایەتی بكات، بەهۆی بوونی خەلەلێكەوە تیایدا، بەلّێ ئەگەر مۆڵەت بدات بەڕیوایەت كردنی، ئەوە ڕیوایەت كردنی دروستە.

**جـ.دەربڕینەكانی دانەوەی (ألفاظ الأداء):**

ئەوەیە كە لە كاتی دانەوەیدا بلّێت: (أعلمني شيخي بكذا).

**٧- الوصية:**

أ) صورتها: أن يوصي الشيخ عند موته أو سفره لشخص بكتاب من كتبه التي يرويها.

ب) حكم الرواية بها:

١- الجواز: لبعض السلف، وهو غلط، لأنه أوصي له بالكتاب ولم يوص له بروايته

٢- عدم الجواز : وهو الصواب .

ج) ألفاظ الأداء :

يقول : " أوصى إلى فلان بكذا " أو " حدثني فلان وصية " .

**٨- الوِجَادَة :**

بكسر الواو، مصدر " وَجَدَ " وهذا المصدر مولد غير مسموع من العرب.

أ) صورتها: أن يجد الطالب أحاديث بخط شيخ يرويها، يعرفه الطالب، وليس له سماع منه ولا إجازة.

ب) حكم الرواية بها : الرواية بالوجادة من باب بالمنقطع ، لكن فيها نوع اتصال .

ت) ألفاظ الأداء : يقول الواجد : " وجَدْتُ بخط فلان أو قرأت بخط فلان كذا " ثم يسوق الإسناد والمتن .

٧.وەسیەت کردن (الوصية):

**أ.شێوازەکەی:**ئەوەیەکە مامۆستاکە لەکاتی مردنیدا یان لەکاتێکدا کە بۆسەفەر دەچێت وەسیەت بکات بۆ کەسێك کە کتێبێك لەو کتێبانەی کە ڕیوایەتی کردون بۆ ئەو بێت.

**ب.حوکمی ڕیوایەت کردنی لەم جۆرە:**

١.**دروستە:**کە گوتەی هەندێ لە پیاوانی پێشینەیە ئەمەش هەڵەیە، چونکە وەسیەتی بۆ کردووە کە کتێبەکە هی ئەوە، نەك وەسیەتی پێ کردبێت کە بیگێڕێتەوە.

٢.**دروست نییە:** کە ئەمەیان ڕاسترە و پێکاویەتی.

**ج.دەربڕینەکانی دانەوەی (ألفاظ الأداء):**

**دەبێت بڵێت:** (أوصى إلـيّ فلان بكذا – فلانەکەس وەسیەتی بۆ کردم بە فلانە شت) یان (حدثني فلان وصية – فلان کەس قسەی بۆ کردم بەوەسیەت).

٨.بینینەوە: (الوجَادَة):

**(الوِجادة):**بەکەسرەی واوەکە، چاوگی (وَجَدَ)ەیە، وە ئەم چاوگ (مصدر)ـە، خۆی هەڵهاتووەو لە عەرەبەوە نەبیستراوە.

**أ.شێوازەکەی:**ئەوەیە کە قوتابییەکە کۆمەڵە فەرمودەیەکی مامۆستاکەی ببینێتەوە، کە ڕیوایەتی کردوون، کە ئەو قوتابیە بیانناسێت، بەڵام شتی لـێ نەبیستبـێ‌و مۆڵەتیشی لـێ وەرنەگرتبـێ.

**ب.حوکمی ڕیوایەت کردنی بەم جۆرە:** گێڕانەوە بە (وجادة) لە بابی (منقطع – پچڕاو) حیسابە، بەڵام ئەوە هەیە جۆرێکیش لە (پەیوەستی – إتصال)ی تیادایە.

**جـ.دەربڕینەکانی دانەوە (ألفاظ الأداء):** کابرای بینەر دەڵێت: (وَجَدْتُ بخط فلان – بە خەتی فلاّن کەس بینیم) یان (قرأت بخط فلان كذا – فلاّن شتم خوێندەوەبە خەتی فلاّن کەس) پاشان سەنەدو مەتنەکە هەڵدەدات.

## المبحث الثالث

## كتابة الحديث وضبطه والتصنيف فيه [319]

### ١- حكم كتابة الحديث :

اختلف السلف من الصحابة والتابعين في كتابة الحديث على أقوال:

أ) فكرهها بعضهم: منهم ابن عمر، وابن مسعود، وزيد بن ثابت.

ب) وأباحها بعضهم: منهم عبدالله بن عمرو ، وانس وعمر ابن عبدالعزيز وأكثر الصحابة .

ج) ثم أجمعوا بعد ذلك على جوازها: وزال الخلاف . ولو لم يُدَوَّن الحديث في الكتب لضاع في الإعصار المتأخرة لاسيما في عصرنا.

### ٢- سبب الاختلاف في حكم كتابته :

وسبب الخلاف في حكم كتابته أنه وردت أحاديث متعارضة في الإباحة والنهي ، فمنها :

أ) حديث النهي: ما رواه مسلم أن رسول الله صلي الله عليه وسلم قال: " لا تكتبوا عني شيئاً إلا القرآن، ومن كتب عني شيئاً غير القرآن فْليَمْحُهُ ".

ب) حديث الإباحة : ما أخرجه الشيخان أن رسول الله صلي الله عليه وسلم قال : " اكتبوا لأبي شَاهِ " وهناك أحاديث أخرى في إباحة الكتابة منها الإذن لعبدالله بن عمرو .

---

[319] سأبحث هذا الموضوع باختصار، لأن كثيراً من قواعد الكتابة والتصحيح سارت من مهمة المحقق والطابع في هذا الزمان، وتبقي تلك التفصيلات للمتخصصين في هذا الفن لمعرفة اصطلاح القوم في كتابة النسخ المخطوطة القديمة وغير ذلك من الاعتبارات.

**٣- الجمع بين أحاديث الإباحة والنهي :**

**لقد جمع العلماء بين أحاديث النهي والإباحة على وجوه منها :**

**أ) قال بعضهم : الإذن بالكتابة لمن خِيْفَ نسيانه للحديث . والنهي لمن أمن النسيان وخيف عليه اتكاله على الخط إذا كتب .**

**ب) وقال بعضهم : جاء النهي حين خيف اختلاطه بالقرآن ثم جاء الإذن بالكتابة حين أُمِنَ ذلك ،وعلى هذا يكون النهي منسوخاً.**

**٤- ماذا يجب على كاتب الحديث ؟**

**ينبغي على كاتب الحديث أن يصرف همته إلى ضبطه وتحقيقه ، شَكْلاً ونَقْطاً يُؤمَنُ معهما اللّبس ، ويُشْكل المُشْكِل لاسيما أسماء الأعْلام ، لأنها لا تُدْرَك بما قبلها ولا بما بعدها . وأن يكون خطه واضحاً على قواعد الخط المشهورة ، وألا يصطلح لنفسه اصطلاحاً خاصاً برمز لا يعرفه الناس ، وينبغي أن يحافظ على كتابة الصلاة والتسليم على النبي صلي الله عليه وسلم كلما جاء ذكره ، ولا يسأم من تكرار ذلك ، ولا يتقيد في ذلك بما في الأصل إن كان ناقصاً ،وكذلك الثناء على الله سبحانه وتعالى كـ " عَزَّ وجَلَّ " وكذلك الترضي والترحم على الصحابة والعلماء ، ويكره الاقتصار على الصلاة وحدها أو التسليم وحده ، كما يكره الرمز إليهما بـ "ص" ونحوه مثل " صلعم " وعليه أن يكتبهما كاملتين .**

٥- المقابلة وكيفيتها :

يجب على كتاب الحديث بعد الفراغ من كتابته مقابلة كتابه بأصل [٣٢٠] شيخه ، ولو أخذه عنه بطريق الإجازة .

وكيفية المقابلة أن يمسك هو وشيخه كتابيهما حال التسميع، ويكفي أن يقابل له ثقة آخر في أي وقت حال القراءة أو بعدها، كما يكفي مقابلته بفَرْع مُقَابَل بأصل الشيخ.

٦- اصطلاحات في كتابة ألفاظ الأداء وغيرها :

غلب على كثير من كُتَّاب الحديث الاقتصار على الرمز في ألفاظ الأداء فمن ذلك أنهم يكتبون:

أ) حدثنا : " ثنا " أو " نا " .
ب) أخبرنا: " أنا " أو " أرنا ".
ت) تحويل الإسناد إلى إسناد آخر : يرمزون له بـ " ح " وينطق القارئ بها هكذا " حا "

د) جرت العادة بحذف كلمة " قال " ونحوها بين رجال الإسناد خَطًّا ، وذلك لأجل الاختصار ، لكن ينبغي للقارئ التلفظ بها ، مثل " حدثنا عبدالله بن يوسف أخبرنا مالك " فينبغي على القارئ أن يقول" قال أخبرنا مالك" كما جرت العادة بحذف " أَنَّهُ " في أواخر الإسناد اختصارا .

مثل " عن أبي هريرة قال " فينبغي للقارئ النطق بـ " أنه " فيقول " أنه قال " وذلك تصحيحاً للكلام من حيث الإعراب .

---

[٣٢٠] أي نسخة شيخه الأصلية التي أخذ منها.

٧- الرحلة في طلب الحديث :

لقد اعتني سلفنا بالحديث عناية ليس لها نظير ، وصرفوا في جمعه وضبطه من الاهتمام والجهد والوقت ما لا يكاد يصدقه العقل ، فبعد أن يجمع أحدهم الحديث من شيوخ بلده يرحل إلى بلاد وأقطار أخرى قريبة أو بعيدة ليأخذ الحديث من شيوخ تلك البلاد ، ويتجشم مشاق السفر وشظف العيش بنفس راضية وقد صنف الخطيب البغدادي كتاباً سماه " الرحلة في طلب الحديث " جمع فيه من أخبار الصحابة والتابعين فمن بعدهم في الرحلة في طلب الحديث ما يعجب الإنسان لسماعه ، فمن أحب سماع تلك الأخبار الشيقة فعليه بذلك الكتاب فانه مُنَشِّط لطلاب العلم ، شاحذ لهممهم مُقَوٍّ لعزائمهم .

٨- أنواع التصنيف في الحديث :

يجب على من يجد في نفسه المقدرة على التصنيف في الحديث ـ وغيره ـ أن يقوم بالتصنيف وذلك لجمع المتفرق ، وتوضيح المشكل ، وترتيب غير المرتب ، وفهرسة غير المفهرس مما يسهل على طلبة الحديث الاستفادة منه بأيسر طريق وأقرب وقت ، وليحذر إخراج كتابه قبل تهذيبه وتحريره وضبطه ، وليكن تصنيفه فيما يعم نفعه تكثر فائدته .

هذا وقد صنف العلماء الحديث على أشكال متنوعة، فمن أشهر أنواع التصنيف في الحديث ما يلي:

أ) الجوامع: الجامع كل كتاب يجمع فيه مؤلفه جميع الأبواب من العقائد والعبادات والمعاملات والسير والمناقب والرقاق والفتن وأخبار يوم القيامة مثل " الجامع الصحيح للبخاري ".

ب) المسانيد : المُسْنَد : كل كتاب جمع فيه مرويات كل صحابي على حِدَة من غير النظر إلى الموضوع الذي يتعلق فيه الحديث : مثل " مسند الإمام أحمد بن حنبل " .

ج) السنن: وهي الكتب المصنفة على أبواب الفقه ، لتكون مصدراً للفقهاء في استنباط الأحكام ، وتختلف عن الجوامع بأنها لا يوجد فيها ما يتعلق بالعقائد والسير والمناقب وما إلى ذلك ، بل هي مقصورة على أبواب الفقه وأحاديث الأحكام ، مثل " سنن أبي داود " .

د) المعاجم : المُعْجم كل كتاب جمع فيه مؤلفه الحديث مرتباً علي أسماء شيوخه على ترتيب حروف الهجاء غالباً ، مثل " المعاجم الثلاثة " الطبراني ، وهي المعجم الكبير والأوسط والصغير .

ه) العلل : كتب العلل هي الكتب المشتملة على الأحاديث المعلولة مع بيان عللها ، وذلك مثل " العلل لابن أبي حاتم " و " العلل للدارقطني " .

و) الأجزاء : الجزء كل كتاب صغير جُمِع فيه مرويات راو واحد من رواة الحديث ، أو جُمِع فيه ما يتعلق بموضوع واحد على سبيل الاستقصاء ، مثل " جزء رفع اليدين في الصلاة " للبخاري .

ز) الأطراف : كل كتاب ذكر فيه مصنفه طرف كل حديث الذي يدل على بقيته ، ثم يذكر أسانيد كل متن من المتون إما مستوعباً أو مقيداً لها ببعض الكتب ، مثل " تحفة الأشراف بمعرفة الأطراف " للمِزي .

ح) المُسْتَدَركات : المُسْتَدرك كل كتاب جمع فيه مؤلفه الأحاديث التي استدركها على كتاب آخر مما فاتته على شرطه ، مثل " المستدرك على الصحيحين " لأبي عبدالله الحاكم .

ط) المُسْتَخرَجَات : المُسْتَخرج كل كتاب خَرَّج فيه مؤلفه أحاديث كتاب لغيره من المؤلفين بأسانيد لنفسه من غير طريق المؤلف الأول ، وربما اجتمع معه في شيخه أو من فوقه مثل " المستخرج على الصحيحين " لأبي نُعَيْم الأصبهاني.

# باسی سێهەم

## دەربارەی نوسینەوەی فەرموودەو لەبەرکردنی و کتێب دانان تیایدا

## كتابة الحديث و ضبطه و التصنيف فيه(٣٢١)

### ١.حوكمی نوسینەوەی فەرمودە:

زانایانی پێشینە لە صەحابیو شوێنکەوتوان جیاوازیان هەیە لەسەر نوسینەوەی فەرمودە بەچەند گوتەیەك.

أ.هەندێکیان بە ناچاك (مكروه) یان داناوە، لەوانە (إبن عمر)و (إبن مسعود)و (زيد بن ثابت).

ب.وە هەندێکیان بە دروست (مباح) یان داناوە، لەوانە (عبدالله بن عمرو)و (أنس)و (عمر إبن عبدالعزيز)و زۆرینەی هاوەڵانﷺ.

جـ.پاشان هەموویان کۆبونەوە لەسەر دروستییەکەی: و لابردنی ئەو جیاوازییە، وە ئەگەر فەرموودە لە کتێبەکاندا نەنوسرایەتەوە، ئەوا لەم سەردەمانەی دواییدا لەناو دەچوو، بەتایبەت لەم سەردەمەی ئێمەدا.

(٣٢١) ئەم بابەتە بە کورتی باس دەکەم، چونکە زۆرینەی ڕێساکانی نوسینەوەو ساغ کردنەوە بۆ تە جێگەی بایەخی لێکۆڵەرەوەو چاپکارەکان لەم سەردەمەدا، وە ئەم درێژە باسانە دەمێنێتەوە بۆ ئەوانەی کە تایبەت کارن (المتخصصين) لەم بابەتەدا، بۆ ناسینی زاراوەکانی کۆمەڵی فەرمودەناسان لە نوسینەوەی نوسخە خەتییە کۆنەکانداو چەند شتێکی تریش لە بواری لێکۆڵینەوەدا.

**٢.هۆکاری جیاوازی لە نوسینەوەی فەرموودەدا:**

هۆکاری ڕاجیایی لە نوسینەوەی فەرمودەدا، ئەوەیە کە چەند فەرمودەیەکی لێك جودا (متعارض) هاتوون، دەربارەی دروستییەکەی و نەهی لێکردنیشی، لەوانە:

**أ.فەرمودەی نەهی کردن:** ئەوەیە کە (مسلم) ڕیوایەتی دەکات کە پێغەمبەر (ﷺ) فەرمویەتی: (لاتکتبوا عني شيئاً إلا القرآن، ومن كتب عني شيئاً غير القرآن فليَمحُهُ – واتە: هیچم لێ مەنوسنەوە، جگە لە قورئان، ئەوەی شتێکی جگە لە قورئان لێنوسیوم، با بیسڕێتەوە).

**ب.فەرمودەی دروستی ئەم کارە:**ئەوەیە کە دوو پێشەوا کە لە پێغەمبەرەوە (ﷺ) هێناویانە کە فەرمویەتی: (أكتبوا لأبي شاةٍ)!وە لێرەداچەند فەرمودەیەکی تر هەیە، دەربارەی دروستی نوسینەوە، لەوانە مۆڵەت دانەکەی بە (عبدالله بن عمرو).

**٣.کۆکاری (الجمع) لە نێوان فەرمودەکانی دروستی و نەهی کردن لە نوسینەوە:**

زانایان کۆکردنەوەیان کردووە، لەنێوان ئەو فەرمودانەدا، کە نوسینەوەی فەرمودە بە چاك دەزانن، و ئەوانەی کە نەهی لێ دەکەن، بەچەند شێوازێك لەوانە:

أ.هەندێکیان و تویانە، مۆڵەت دان بە نوسینەوە، بۆ کەسێکە کە ترسی لە بیرچونەوەی هەبێت، نەهی بۆ کەسێکە کە ترسی لەبیرچونەوەی نەبێت، وە ترسی ئەمەی هەبێت کە ئەگەر نوسیەوە، ئیتر پشت بەو نوسینەوەیە ببەستێت.

ب.وە هەندێکی تریان وتویانە:کاتێك نەهییەکە هات، کە ترسی ئەوە هەبوو

که لەگەڵ قورئاندا تێکەڵ ببێت، و پاشان مۆڵەتدان هات، بەنوسینەوەی کاتێك ئەو ترسە ڕەوییەوە، بەمەبێت ئەو نەهییە سڕاوەتەوە (منسوخ)ە.

## ٤.چی لەسەر نووسەرەوەی فەرموده پێویستە:

پێویستە لەسەر نوسەرەوەی فەرموده، هەوڵــی تەواو بخاتە گەڕ بۆ (ضبط)کردنو لێکۆڵینەوەی شێوەکەیو خاڵەکانی، تا بـێ ترس بێت، لە لێکچوون (اللَّبْس)، وە ئەو شتانەی کە ئیشکالیەتیان تیادایە جوان ڕێکی بخات، بەتایبەت ناوی پیاوەکان، چونکە ئەو شتانە بە پێش و دوای خۆیان نازانرێت، دەبێت ڕێنوسەکەی ڕون و ئاشکرا بێتو بە گوێرەی ڕێسا دیارەکانی ڕێنوس (قواعد الخط) بێت، بۆ خۆی زاراوەی تایبەت دانەنێت، بەڕەمزێك کە خەڵکی نەیزانێت، دەبێت پارێزگاری بکات لەسەر نوسینەوەی سەڵەوات و سەلام لە دیداری پێغەمبەر (ﷺ) هەرکات کە ناوی هێنا، ماندوو نەبێت لە دوبارەکردنەوەی ئەمە، وە خۆی پەیوەست (مقيد) نەکات لەم شتەدا بە بنەما (أصل)ەکەوە، ئەگەر ناقیص بوو، وە هەروەها ستایشی خوای پەروەردگار وەك (عز وجل) وە هەروەها داوای ڕازی بوون و ڕەحمەت کردن بۆ صەحابیو زانایان، باشیش نییە، کە بەتەنها سەڵاوات —بەبێ سەلام— یان بە پێچەوانەوە بێت، هەروەك ڕەمز دانان بۆ ئەمانەیش شتێکی مەکروهە، وەك (ص)و ئەو شتانە، وەك (صلعم)!بە ڵکو پێویستە لەسەری کە بەتەواوی بیاننووسێتەوە.

## ٥.بەرابەری پێکردن (المقابلة)و چۆنیەتی یەکەی:

پێویستە لەسەر نوسەرەوەی فەرموده پاش لێبونەوەی لەسەر نوسینەوەکەی، کە ئەو کتێبەی بەرابەری پـێ بکات، لەگەڵ کتێبە ئەصڵەکەی

مامۆستاکەیدا[٣٢٢]، هەر چەندە بەرێگای مۆڵەت پێدانیش لێی وەرگرتبێت، وە چۆنیەتی بەرابەری پێ کردنەکە، ئەوەیە کە ئەم و مامۆستاکەی کتێبەکانیان بەدەستەوەبگرن لەکاتی گوێگرتن دا، وە دەشبێت کە کەسێکی متمانە پێکراوی تر ئەو بەرابەری کردنە بکات، لە هەرکاتێکی، خوێندنەوەدا یان دواییدابێت، هەردەبێت، هەروەك ئەوەش دەبێت، کە بەرابەری پێ بکات لەگەڵ بەشێکی نوسخەیەکی بەرابەر پێ کراودا، لەگەڵ نوسخە ئەصڵییەکەی مامۆستاکەدا.

**٦. چەند زاراوەیەك لە نوسینەوەی دەربڕینەکانی دانەوە (ألفاظ الأداء)و هی تریشدا:**

مەسەلەی کورت هەڵهێنان لەسەر نوسەرە وانی فەرمودەو ڕەمزدانان لە دەربڕینی لەفزەکانی (أداء)دا، شتێکە زاڵ بووە بەسەر زۆربەیاندا، لەوانەی کە ئەوان دەینوسن.

أ.(حدثنا): بە (ثنا) یان (نا).

ب.(أخبرنا): بە (أنا) یان (أرنا).

جـ.گواستنەوەی سەنەد بۆ سەنەدێکی تر، کە بەڕەمزی (ح)دای دەنێن‌و خوێنەرەکەیش هەربە (حا) دەری دەبڕێ.

د.عادەت وا بووە، کە وشەی (قال) و هاووێنەی ئەمە لابەرن، لەنێوان پیاوەکانی سەنەددا بەنوسین، ئەمەش بۆ کورت بڕی.

بەڵام پێویستە لەسەر خوێنەر کە دەری ببڕێت، وەك (حدثنا عبدالله بن یوسف أخبرنا مالك) ئەمە پێویستە لەسەر خوێنەر کە بڵێت: (قال أخبرنا مالك) هەر وەك عادەتیش وا بووە کە (أنه) یان لابردووە، لە کۆتایی

---

(٣٢٢) واتە: نوسخەی مامۆستا ئەصڵی یەکەی کە لێوەی وەری گرتووە.

سەنەددا ئەمەش هەر بۆ کورت بڕی، وەك: (عن ابي هريرة قال) کە پێویستە لەسەر خوێنەر کە (أنه) دەر ببڕێت و بلێت: (أنه قال)و ئەمەش بۆ ساغ کردنەوەی دەستەواژەکان لە ڕوی ئیعرابەوە.

### ٧.سەفەرکردن لەرێی دەستخستنی فەرمودەدا:(الرحلة في طلب الحديث....).

پێشینەکانمان بایەخیان داوە بە فەرموودە، بەڵام بایەخدانێکی بێ وێنە، وە لە کۆکردنەوەو (ضبط) کردنیدا، هەوڵێك‌و تێکۆشانێك‌و کاتێکی وایان سەرف کردووە، کە خەریکە عەقڵ بڕوای پێ نەکات، جا دوای ئەمە کە یەکێکیان فەرمودەکانی مامۆستاکانی شارەکەی خۆیی کۆدەکردەوە، ئیتر دەکەوتە گەڕان بۆ شارو ناوچەکانی تر، نزیك‌و دوور تا فەرمودەلە مامۆستاکانی ئەو ناوچانەش وەربگرێت، جا ئەو زبری و ناڕەحەتیەی بە دەرونێکی ڕەزامەندانەوە لە خۆ دەگرت، (الخطيب البغدادي) کتێبێکی داناوە، کە ناوی ناوە: (الرحلة في طلب الحديث) کە تیایدا ئەو هەوڵانەی هاوەڵان ﷺو شوێنکەوتوانو ئەوانەی دوای ئەوانی لەگەڕان بەشوێن دەستخستنی فەرموودەدا کۆکردۆتەوە، کە مرۆڤ بە بیستنی سەرسام دەبێت، و ئەوەی دەیەوێت گوێ لەو هەواڵە گرنگانە بگرێت، با بچێتە سەر ئەو کتێبە چونکە ئەو کتێبە، چالاك کەری تامەزرۆیانی زانستی شەرعییەو هیممەتیان وریادەکاتەوەو جەخت بوونەوە (عزم)، یان بەهێز دەکات.

### ٨.جۆرەکانی کتێب دانان (التصنيف) لە فەرمودەدا:

پێویستە لەسەر ئەو کەسەی کە هەست بە خۆی دەکات کە توانای کتێب دانانی لە فەرمودەو هی تریشدا هەیە، کە هەستێت بە کتێب دانان ئەمەش بە کۆکردنەوەی چەند زانیاریەکی پەرت بوو، ڕوونکردنەوەی شتە پڕ لە

گرێکان (المشکل)، وە ڕێکخستنی شتە نارێکەکان، و پێڕست دانان، بۆ بـێ پێڕستەکان، کە ئەمانە ئاسانکاری لەسەر ئەو کەسانە دروست دەکات، کە تامەزرۆی فەرموودەن، تا سودیان لێوەربگرن، بە ئاسانترین ڕێگاو زووترین کات، جا با خۆیشی بپارێزێت، لە دەرکرنی کتێبەکەی لە پێش پوختکردنو پاك نووس (تحریر)کردن و (ضبط)کردنیدا، تا کتێبەکەی سودەکەی زۆرو گشتی بێت.

زانایان فەرمودەیان بەسەر چەند شێوازێکی جۆرا و جۆردا ڕێك خستوەو کردۆتە کتێب، وەلە بەناوبانگترین جۆرەکانی کتێب دانانیش لە فەرمودەدا ئەمانەن:

**أ.(الجوامع):** کە تاکەکەی (الجامع- کۆکەرەوە)یە، ئەو کتێبانەن کە دانەرەکەی سەرجەم بابەتەکانی بیروباوەڕ (العقائد) و پەرستش (العبادات) و کڕین و فرۆشتن (المعاملات) و ژیاننامەکان (السیر) و نیشانە جوانەکانی چاکان (المناقب) و کارە باشەکان (الرقاق) و باسی فیتنەو ئاشوب (الفتن) و هەواڵەکانی ڕۆژی دوایی کۆبکاتەوە، وەك (الجامع الصحیح، للبخاري).

**ب.(المسانید):** کە تاکەکەی (المُسنَد)ە، کە ئەو کتێبانەن کە سەرجەم شتە ڕیوایەت کراوەکانی هاوەڵانیﷺتیادا کۆکراوەتەوە، بەبـێ ڕەچاو کردنی ئەو بابەتەی کە فەرمودەکەی پێوە پەیوەستە، وەك (مسند ألإمام أحمد بن حنبل).

**جـ.(السنن):** ئەو کتێبانەیە کە بەگوێرەی بابەتە شەرعی یەکان (ابواب الفقه) دارێژراون، تا ببنە سەرچاوە بۆ شەرعزانان لە هەڵهێنجانی حوکمەکاندا، ئەم (السنن)انە لەگەڵ (الجوامع) دا جیان، چونکە ئەو شتانەی کە پەیوەندیان بە بیروباوەڕو ژیاننامەو نیشانە جوانەکان (المناقب) ەوە هەیە، تیایاندا نییە، بەڵکو تەنها بابەتە فیقهییەکانن، و فەرمودەکانی ئەحکامن، وەك (سنن ابی داود).

د.(المعاجم):(المعجم) ئەو کتێبانەن کە دانەرەکەی فەرمودەکانی بەگوێرەی ناوی مامۆستاکانی بە ڕێکخستنی پیتەکان (حروف الهجاء) ڕیزبەندی کردووەو کۆکردۆتەوە، وەك سێ موعجەمەکەی (الطبراني) کە بریتین لە (المعجم الكبير، المعجم ألأوسط، المعجم الصغير).

هـ.(العلل): ئەو کتێبانەن کە ئەو فەرمودانە دەگرێتەوە کە نەخۆشن (معلول)ن، لەگەڵ ڕونکردنەوەی (علة)ەکاندا، ئەمەش وەك: (العلل لإبن ابي حاتم) و (العلل للدار قطني).

و.(الأجزاء): (جزء – بەش) ئەو کتێبە بچوکانەن کە ڕیوایەتەکانی کەسێك لە گێڕەرەوانی فەرمودە لە خۆ دەگرێت، و کۆدەکاتەوە یاخود ئەو بابەتانەی کە پەیوەستن بە مەسەلەیەکەوە بەسەر بەخۆیی کۆدەکاتەوە، وەك (جزء رفع اليدين في الصلاة) للبخاري.

ز.(الأطراف):ئەوکتێبانەن، کە دانەرەکەی بەشێکی لە هەموو فەرمودەیەك باسکردووە، کە ئەو بەشە بەڵگەیە لەسەر پاشماوەکەی تری پاشان سەنەدی هەموو مەتنێك لەو مەتنانە یان بەلە خۆگرتن (مستوعبات) یان بە پەیوەست کردنیان بەهەندێ کتێبەوە، دەهێنێت. وەك (تحفة ألأشراف بمعرفة ألأطراف للمزي).

ج.(المستدركات): تاكە كەی (المستدرك)ە: ئەو کتێبانەن کە دانەرەکەی ئەو فەرمودانەی کە ئەو هەستی پێکردون کە لەسەر مەرجی کتێبی کەسێکی کەن، بەڵام ئەو کەسە لەبیری چوون، ئەم دەیانهێنێت، وەك (المستدرك على الصحيحين)ی (أبو عبدالله الحاكم).

**ك.(المستخرجات):** تاكەكەی (المُستخرج)ە: ئەو كتێبانەن كە دانەرەكەی كۆمەڵێك فەرمودە دەهێنێت (تخریج) دەكات، كە فەرمودەی كتێبێكی ترن، بەڵام ئەم بەسەنەدی خۆیەوە دەیان هێنێت، وەك لە غەیری سەنەدی ئەو كەسەی یەكەم، و هەندێ جاریش لە مامۆستاكەیدا یان لەسەروو تریەوە یەك دەگرنەوە، وەك (المستخرج علی الصحيحين)ی (أبو نُعیم ألأصفهاني).

# المبْحَثُ الرَابع

## صفة رواية الحديث [٣٢٣]

### ١- المراد بهذه التسمية:

المراد بهذا العنوان بيان الكيفية التي يُرْوَي بها الحديث والآداب التي ينبغي التحلي بها وما يتعلق بذلك ،وقد تقدم شيء من ذلك في المباحث السابقة ، وإليك ما بقي :

### ٢-هل تجوز رواية الراوي من كتابه إذا لم يحفظ ما فيه ؟

هذا أمر اختلف فيه العلماء، فمنهم من شدد فأفرط، ومنه من تساهل ففرَّط ومنهم من اعتدل فتوسط .

أ) فأما المتشددون: فقالوا: " لا حجة إلا فيما رواه الراوي من حفظه " روى ذلك عن مالك وأبي حنيفة وأبي بكر الصيدلاني الشافعي.

ب) وأما المتساهلون : فقوم رووا من نُسَخ غير مقابلة بأصولها ، منهم ابن لَهيعة .

ج) وأما المعتدلون المتوسطون : ( وهم الجمهور ) فقالوا : إذا قام الراوي في التحمل والمقابلة بما تقدم من الشروط جازت الرواية من الكتاب ، وان غاب عنه الكتاب ، إذا كان الغالب على الظن سلامته من التغيير والتبديل لاسيما إن كان ممن لا يخفي عليه التغيير غالباً .

---

[٣٢٣] سأبحث هذا الموضوع باختصار أيضا لأن بعض جزئياته كانت ضرورية في عصر الرواية أمـا في هذه الأزمان فتعتبر دراستها من باب دراسة تاريخ الرواية وهي لازمة لذوي الاختصاص في هذا الفن .

**٣- حكم رواية الضرير الذي لا يحفظ ما سمعه:**

إذا استعان الضرير الذي لا يحفظ ما سمعه بثقة في كتابه الحديث الذي سمعه وضبطه والمحافظة على الكتاب ، واحتاط عند القراءة عليه بحيث يغلب على ظنه سلامته من التغيير، صحت روايته عند الأكثر ، ويكون كالبصير الأمّي الذي لا يحفظ .

**٤- رواية الحديث بالمعنى وشروطها :**

اختلف السلف في رواية الحديث بالمعني، فمنهم من منعها ومنهم من جوزها.

أ) فمنعها طائفة من أصحاب الحديث والفقه والأصول ، منهم ابن سيرين وأبو بكر الرازي .

ب) وأجازها جمهور السلف والخلف من المحدثين وأصحاب الفقه والأصول، منهم الأئمة الأربعة لكن إذا قطع الراوي بأداء المعني.

ثم إن مَن أجاز الراوية بالمعنى اشترط لها شروطا وهي:

١- أن يكون الراوي عالماً بالألفاظ ومقاصدها .

٢- أن يكون خبيراً بما يُحيل معانيها .

هذا كله في غير المصنَّفات ، أما الكتب المصنَّفة فلا يجوز رواية شيء منها بالمعني ، وتغيير الألفاظ التي فيها ، وإن كان بمعناها لأن جواز الرواية بالمعنى كان للضرورة إذا غابت عن الراوي كلمة من الكلمات ، أما بعد تثبيت الأحاديث في الكتب فليس هناك ضرورة لرواية ما فيها بالمعني .

هذا وينبغي للراوي بالمعنى أن يقول بعد روايته الحديث " أو كما قال " أو " أو نحوه " أو " أو شبهه ".

٥- اللحن في الحديث وسببه :

اللحن في الحديث، أي الخطأ في قراءته، وأبرز أسباب اللحن:

أ ) عدم تعلم النحو واللغة : فعلى طالب الحديث أن يتعلم من النحو واللغة ما يسلم به من اللحن والتصحيف ، فقد روي الخطيب عن حماد بن سلمه قال " مَثَلُ الذي يطلب الحديث ولا يعرف النحو مثل الحِمَار عليه مِخلاة لا شعير فيها " [٣٢٤]

ب) الأخذ من الكتب والصحف ، وعدم التلقي عن الشيوخ : مر بنا أن لتلقي الحديث وتحمله عن الشيوخ طرقاً بعضها أقوي من بعض ، وأن أقوي تلك الطرق السماع من لفظ الشيخ أو القراءة عليه ، فعلى المشتغل بالحديث أن يتلقي حديث رسول الله صلي الله عليه وسلم ، من أفواه أهل المعرفة والتحقيق حتى يسلم من التصحيف والخطأ ،ولا يليق بطالب الحديث أن يعمد إلى الكتب والصحف فيأخذ منها ويروي عنها ويجعلها شيوخَهُ ، فانه تكثر أخطاؤه وتصحيفاته، لذا قال العلماء قديماً : " لا تأخذ القرآن من مُصْحَفِيّ ولا الحديث من صَحَفِيّ " [٣٢٥]

---

[٣٢٤] تدريب الراوي جـ ٢ ـ ص ١٠٦

[٣٢٥] المصحفي الذي يأخذ القرآن من المصحف ولا يتلقي القرآن عن القراء والشيوخ ، والصحفي هو الذي يأخذ الحديث من الصحب ولا يتلقاه عن الشيوخ .

# باسی چوارەم

## شێوازی گێڕانەوەی فەرمودە

## (صفة رواية الحديث)[٣٢٦]

### ١.مەبەست لەو ناونانە:

مەبەست لەو ناونیشانە بریتییە لەڕونکردنەوەی چۆنیەتی ئەو شێوازەی کە فەرمودەی پـێ دەگێڕدرێتەوە، وە ڕوونکردنەوەی ئەو ئادابانەی کە پێویستە ـئەو کەسە–خۆیی پـێ برازێنێتەوە، وە ئەوەی پەیوەستە بەم بابە تەوە، وە شتێکیش لەم بارەیەوە ڕابورد، لە بابەتەکانی پێشوودا، جا پاشماوەکەیت بۆ باس دەکەم.

### ٢.ئایا گێڕانەوەی کەسێك دروستە، کەلە کتێبەکەیەوەبیگێڕێتەوە، و لەبەری نەبێت؟

ئەمە کارێکە زانایان ڕاجیاییان هەیە تیایدا، هەندێکیان توندییان تیادا نواندووە، و ڕۆچوونو هەندێکیشیان ئاسانکاری یان تیادا کردووە،و کورت یان تیا دا هەڵهێناوەو هەندێکیشیان ناوەڕاستیان تیایدا گرتووەو لە نێوەندا وەستاونەتەوە.

أ.دەربارەی توندەکان (المتشددون) دەڵێن: تەنها لەوانەدا دەکرێتە بەڵگەو ـوەردەگیرێت– کە گێڕەرەوەکە بەلەبەر کردنەوە دەیلێت: ئەمە لە (مالك) و (أبو حنيفة) و (أبو بكر الصيدلاني الشافعي)یەوە گێڕدراوەتەوە.

---

(٣٢٦) ئەم بابەتەش بەکورتی باس دەکەم، چونکە هەندێ لە (جزئيات)ەکـانی پێویـست بـوون لەسەردەمی گێڕانەوەدا ـلەپێشـدا– بـەڵام لـەم سـەردەمانەدا لێکۆڵینـەوە لێکردنیـان بەتوێژینـەوەی مێژووی ڕیوایەت، حیساب دەکرێت، ئەمەش بۆتایبەت کاران (المتخصصين)ی ئەم بابەتە پێویستە.

ب.بەڵام بۆ ئاسانکاران (المتساهلون): هەندێك هەن شتیان گێڕاوەتەوە لە چەند کتێبێکی نابەرابەر کراوەو (غیر مقابلة) بە ئەصڵەکانیان، لەوانە (إبن لُهیعة).

جـ.بەڵام بۆ نێوەندکاران (المعتدلون المتوسطون): کە ئەمانە جەماوەری زانایانن، فەرمویانە: ئەگەر گێڕەرەوە لە هەڵگرتن (التحمل)و بەرابەری پێکردن (المقابلة) دا هەستا بوو، بەو مەرجانەی کە ڕابوردن، ئەوە ڕیوایەت کردن لەو کتێبەوە دروستە، هەر چەندە کتێبەکەیشی لانەبێت، ئەگەر گومان زیاتر بەلای ئەوە دابوو،کە سەلامەتە لە گۆڕانو جێگۆڕکێ کاری (التغییر و التبدیل) بەتایبەت لەلای ئەوانەی کە گۆڕانکاری (التغییر)یان لێ وون نابێت و ناشاردرێتەوە.

## ٣.حوکمی گێڕانەوەی کەسێك کە ئەوەی کە دەیبیستێ ناتوانێ لەبەری بکات؟

ئەگەر کەسێکی بەرکەوتوو (الضریر) کە شتێکی بیست نەیتوانی لەبەری بکات، پشت ببەستێت بە کەسێکی بڕوا پێکراو، لە نوسینەوەی فەرمودەیەکی وا کە بیستوویەتی و (ضبط)ی کردووەو کتێبەکەیشی پاراستووە، و تەنها خوێندنەوەی کردووە، بەشێوەیەك کە گومانی سەلامەت بوونی بەبێ گۆڕانکاری زیاتر بێت لەسەری، ئەوە گێڕانەوەی دروستە لەلای زۆرینەی زانایان، ئەمەش وەك کەسێکی بینەری نەخوێندەوارە کە ناتوانێت شت لەبەر بکات.

### ٤. گێڕانەوەی فەرموودە بەماناو مەرجەکانی:

زانایانی پێشینە جیاوازییان هەیە لەڕیوایەت کردنی فەرموودەدا بەمانا، هەندێکیان جلەو گیرییان لـێ کردووەو هەندێکیشیان بەدروستیان داناوە:

أ. کۆمەڵێك لە زانایانی فەرموودەو فیقهـ، و ئوصول جلەو گیرییان لـێ کردووە، وەك (إبن سيرين) و (أبو بكر الرّازي).

ب. بەڵام جەماوەری پێشینە (السلف) و (پاشینە) (الخلف) لە فەرموودەناسان و زانایانی شەرع و ئوصول بە دروستیان داناوە، لەوانە چوار ئیمامەکە، بەڵام ئەگەر گێڕەرەوە بەتەواوی (أداء)ی ئەو مانایە بکات، پاشان ئەوانەی کە گێڕانەوەی بەمانایان بەدروست داناوە، چەند مەرجێکیان داناوە لەوانە:

١. دەبێت گێڕەرەوەکە زانا بێت بەدەر بڕینەکان و مەبەستەکانیان.

٢. دەبێت زۆر ئاگادار بێت بەو شتانەی کە ماناکانی دەگۆڕێت.

ئەمە بۆ ئەوانەیە کە نەکراون بە کتێب، بەڵام بۆ گێڕانەوە بەمانای کتێبەکان، ئەو گێڕانەوە بەمانایانە دروست نییە، بەهیچ جۆرێك، وە گۆڕینی لەفزەکان، هەرچەندە هەر بەو مانایەش بێت، دروست نییە، چونکە دروستی گێڕانەوەی بەمانا بۆکاتی پێویستی (ضرورة)، بۆ کاتێکە کە وشەیەك لەو وشانە لە گێڕەرەوە ون ببێت، بەڵام دوای جێگیر بوونی فەرموودە لە کتێبەکاندا، ئەوا هیچ زەرورەتێك نییە بۆ گێڕانەوەی فەرموودە لەکاتی بوونی ئەو کتێبانەدا بەمانا.

پێویستە لەسەر گێڕەرەوەی فەرموودە بەمانا، پاش گێڕانەوەی فەرموودەکە بڵێت: (أو كما قال) یان (أو نحوه) یان (أو شبهه).

**٥.(اللحن) لەفەرمودەداو هۆكارەكەی:**

**(اللحن)**لەفەرمودەدا،واتە:بەهەڵەخوێندنەوەی، دیارترین هۆكارەكانی:

**أ.**نەزانینی زانستی (نەحو) و زمان، بۆیە لەسەر تامەزرۆیانی فەرمودە پێویستە كە ئەوەندە لە (نحو)و زمان (اللغة) فێربن، كە بیان پارێزێ لە هەڵە خوێندنەوەی فەرمودەكانو جێگۆڕكێ پێكردنی نوختەكان (التصحیف)، جا (خطیب) لە (حمّاد بن سلمة)ەوە گێڕاویەتیەوە، كە وتویەتی: (مثل الذي یطلب الحدیث ولا یعرف النحو مثل الحمار علیه مخلاة لا شعیر فیها[٣٢٧]- واتە: وێنەی كەسێك كە تامەزرۆی فەرمودەیەو نەحو نازانێت، وەك گوێدرێژێك وایە كە تورەكەیەكی لەسەردا بێت، كەچی جۆی تیادا نەبێت!

**ب.**وەرگرتن لەدەفتەرو كتێبەوەو نەگەیشتن بەمامۆستا بەسەرماندا ڕابورد، كە گەیشتن بە فەرمودەو وەرگرتنی لە مامۆستاوە، چەند ڕێگایەكی هەیە، هەندێكیان لە هەندێكی تریان بەهێز ترن، وە بەهێزترینیان بیستنە لەو مامۆستایەوە (السماع من لفظ الشیخ) یان خوێندنەوەیە بەسەریدا (القراء ة علیه)، بۆیە لەسەر ئەو كەسەی كە بە فەرمودەی پێغەمبەرەوە (ﷺ) سەرقاڵە پێویستە، كە لەدەمی كەسانی زاناو لێكۆڵەرەوە (أهل المعرفة و التحقیق)ەوە بیبیستێ، تا پارێزراو بێت، لە جێگۆڕكێ پێ كردنی نوختە (التصحیف)و هەڵە كردن، شتێكی شایستە نی یە بۆ تامەزرۆیانی فەرمودە، كە پشت بەكتێب و دەفتەر ببەستێت، و شتیان لێوە وەربگرێت و لێیانەوە بگێڕێتەوە، وە ئەو كتێبانە بكاتە مامۆستای خۆی، چونكە بەمە هەڵەو جێگۆڕكێ پێكردنی نوختەكان زیاددەكات، بۆیە هەر زانایان لە دێر زەمانەوە فەرمویانە (لا تأخذ القرآن من مُصحَفيّ ولا الحدیث

---

(٣٢٧) تدریب الرّاوي ج٢/١٠٦.

من صَحَفي[٣٢٨] – واته: قورئان له (مُصحفي) و فەرموده له (صَحَفي) وەرمەگرن، واتاكانيان له خوارەوه روون كراوەتەوه).

## غريب الحديث

### ١– تعريفه:

أ) لغة: الغريب في اللغة ، هو البعيد عن أقاربه ، والمراد به هنا الألفاظ التي خفي معناها ، قال صاحب القاموس : " غَرُبَ كَكَرُمَ ، غَمُضَ وخَفِيَ " [٣٢٩]

ب) اصطلاحاً: هو ما وقع في متن الحديث من لفظة غامضة بعيدة من الفهم لقلة استعمالها.

### ٢– أهميته وصعوبته:

وهو فن مهم جداً ، يَقْبُحُ جهلهُ بأهل الحديث ، لكن الخوض فيه صعب ، فليتحرَّ خائضه ، وليتق الله أن يُقْدِمَ على تفسير كلام نبيه صلي الله عليه وسلم بمجرد الظنون ، وكان السلف يتثبتون فيه أشد التثبت .

### ٣– أجود تفسيره :

وأجود تفسيره ما جاء مفسَّراً في رواية أخرى، مثل حديث عِمْرَانَ بن حُصَيْن رضي الله عنه في صلاة المريض " صَلِّ قائماً، فان لم تستطع فقاعداً، فإن لم تستطع فعلى جَنْبٍ " [٣٣٠]

---

(٣٢٨) (المصحفي): ئەو كەسەيە كە قورئان لەپەرتوكەكەوە وەردەگرێت، وە قورئان لە خوێنەران (القرّاء) و مامۆستاوە وەرناگرێت، وە (الصحفي) كەسێكە كە فەرموده لەدەفتەرو پەرتوكەوە وەردەگرێت، وەلە مامۆستاكانەوە وەرى ناگرێت.

[٣٢٩] القاموس جـ ١ ـ ص ١١٥ .

[٣٣٠] البخاري .

وقد فَسَّر قولَهُ " عَلَى جَنْبٍ" حديثُ عَليّ رضي الله عنه ، ولفظه " على جَنْبِه الأيمن مستقبل القِبْلة بوجهة " [٣٣١]

**٤- أشهر المصنفات فيه :**

أ) غريب الحديث، لأبي عبيد القاسم بن سَلاَّم.

ب) النهاية في غريب الحديث والأثر، لابن الأثير ، وهو أجود كتب الغريب.

ج) الدر النَّثِير للسيوطي ، وهو تلخيص للنهاية .

د) الفائق ، للزمخشري .

---

[٣٣١] سنن الدارقطني .

# دەستەواژە نامۆکانی نێو فەرموودە
# ( غريب الحديث )

**١.پێناسەکەی:**

**أ.لەڕووی زمانەوە:** (غريب – نامۆ) لە زماندا بریتییە لە شتێکی دوور لە خزمانیو نزیکەکانیو مەبەست پێی لێرەدا ئەو لەفزانەن کە ماناکانیان نادیارە، خاوەنی (القاموس) دەڵێت: (غَرُب ككرُمَ غَمُضَ وَ خَفَيَ)[٣٣٢] (غَرُب) لەسەری وەزنی (كرم)ەیە، و مانای نادیارو شاراوەی هەیە.

**ب.لەڕووی زاراوەوە:**ئەوەیە کە لەمەتنی فەرموودەکەدا لەفزێکی شاراوەو نادیار قوت ببێتەوە، کەوا دوور بێت لەوەی لێی تێبگەیت، ئەمەش لەبەر ئەوەی کە کەم بەکارهێنراوە.

**٢.گرنگی ئەم بابەتەو سەختی یەکەی:**

ئەم بابەتە هونەرێکی زۆر گرنگە، نەزانینی لەلایەن زانایانی فەرموودەوە شتێکی ناشیرینە، بەڵام ڕۆچوون تیایدا سەختە، با ئەو کەسەی کە تیایدا ڕۆدەچێت، وریا بێت و بترسێت لە خوا، لەوەی کە لەلێکدانەوەیەکی خۆی پێش بخات بەسەر لێکدانەوەی پێغەمبەر (ﷺ) تەنها بە گومان بردن، پێشینەکانیش لەم بابەتەدا زۆر وردو سەقامگیر بوون (يتثبتون فيه أشد التثبت).

**٣.بەهادارترین لێکدانەوە بۆ ئەم وشە غەریبانە:**

چاکترین و دەوڵەمەندترین لێکدانەوە بۆ ئەمانە، ئەو لێکدانەوانەیە کەلە ڕیوایەتی تردا هاتووە، وەك فەرموودەکەی (عِمْران بن حُصَيْن) ﷺدەربارەی نوێژی نەخۆش (صل قائماً، فإن لم تستطع فقاعداً، فإن لم تستطع فعلى

---

(٣٣٢) القاموس ج١ / ص١١٥.

جنبٍ)[٣٣٣] واتە: بەپێوە نوێژ بکە، ئەگەر نەشتوانی بەدانیشتنەوە، ئەگەر هەر نەتتوانی ئەوە لەسەر تەنیشت بیکە، جا دەستەواژەی (على جنب) فەرمودەکەی (علی) ﷺ لێکی دەداتەوە، کە ئەمە لەفزەکەیەتی (على جنبه الأيمن مستقبل القبلة بوجهه) واتە: (لەسەر لای ڕاستی‌و ڕوو لە قیبلە).

**٤.بەناوبانگترین کتێب لەم بارەیەوە:**

أ.(غريب الحديث)ی (أبو عبيد القاسم بن سَلاّم).

ب.(النهاية في غريب الحديث و الأثر)ی (إبن الأثير) کە دەوڵەمەندترین کتێبی لێکدانەوەی غەریبەکانە.

ج.(الدّر الكبير)ی (الإمام السيوطي) کە پوختەی (النهاية)یە.

د.(الفائق)ی (الزمخشري).

---

(٣٣٣) .البخاري.

# الفصل الثاني

## آداب الرواية

- المبحث الأول: آداب المحدث.
- المبحث الثاني: آداب طالب الحديث.

# بەشـــی دووەم

## ئادابەکانی گێڕانەوە

باسی یەکەم: ئادابەکانی فەرمودەناس، (ئداب المحّدپ).

باسی دووەم: ئادابەکانی تامەزرۆ یانی فەرمودە، (آداب طالب الحدیث).

# المبْحَثُ الأول

## آداب المحدث

**١- مقدمة:**

بما أن الاشتغال بالحديث من أفضل القربات إلى الله تعالى وأشرف الصناعات ، فينبغي على من يشتغل به وينشره بين الناس أن يتحلي بمكارم الأخلاق ومحاسن الشِّيم ، ويكون مثالا صادقاً لما يعلمه الناس ، مطبقاً له على نفسه قبل أن يأمر به غيره .

**٢- ابرز ما ينبغي أن يتحلي به المحدث :**

أ) تصحيح النية وإخلاصها، وتطهير القلب من أغراض الدنيا، كحب الرئاسة أو الشهرة.

ب) أن يكون أكبر همه نشر الحديث، والتبليغ عن رسول الله صلي الله عليه وسلم مبتغياً جزيل الأجر.

ج) ألا يحدث بحضرة من هو أولى منه، لِسِنِّه أو عِلْمِه.

د) أن يرشد من سأله عن شيء من الحديث ـ وهو يعلم أنه موجود عند غيره ـ إلى ذلك الغير.

هـ) ألا يمتنع من تحديث أحد لكونه غير صحيح النية ، فانه يُرجَى له صحتها.

و) أن يعقد مجلساً لإملاء الحديث وتعليمه إذا كان أهلا لذلك، فان ذلك أعلى مراتب الراوية.

**٣- ما يستحب فعله إذا أراد حضور مجلس الإملاء :**

أ) أن يتطهر ويتطيب ويسرح لحيته .

ب) أن يجلس متمكناً بوقار وهيبة ، تعظيماً لحديث رسول الله صلي الله عليه وسلم .

ج) أن يُقْبِل على الحاضرين كلهم، ولا يخص بعنايته أحداً دون أحد.

د) أن يفتتح مجلسه ويختمه بتحميد الله تعالى والصلاة على النبي صلي الله عليه وسلم ودعاء يليق بالحال .

هـ) أن يتجنب ما لا تحتمله عقول الحاضرين أو ما لا يفهمونه من الحديث.

و) أن يختم الإملاء بحكايات ونوادر ، لترويح القلوب وطرد السَّأم .

**٤- ما هي السن التي ينبغي للمحدث أن يتصدي للتحديث فيها ؟**

اختلف في ذلك .

أ) فقيل خمسون ، وقيل أربعون ، وقيل غير ذلك .

ب) والصحيح أنه متى تأهل واحتيج إلى ما عنده جلس للتحديث في أي سن كان

**٥- أشهر المصنفات فيه :**

أ) " الجامع لأخلاق الراوي وآداب السامع " للخطيب البغدادي.

ب) " جامع بيان العلم وفضله، وما ينبغي في روايته وحمله " لابن عبد البر.

# باسی یەكەم

## ئادابەكانی فەرمووده ناس

**١.پێشەكی:**

لەبەر ئەوەی سەرقاڵ بوون بە فەرمودەوە، لەگەورەترینی نزیك كەوتنەوەكانە لە خوای گەورە، وە پیرۆزترین پیشەیە، پێویستە لەسەر كەسێك كە پێوەی خەریكەو لەناو خەڵكیدا بڵاوی دەكاتەوە، خۆی برازێنێتەوە بە چەند ڕەوشتێكی باش و خویەكی جوان، وە دەبێت نمونەیەكی ڕاستگۆیانە بێت بۆ ئەوشتانەی كە فێری خەڵكیان دەكات، و پێش ئەوەی فەرمان بكات بەكەسانی تر كە ئەنجامیان بدەن، خۆی بیانكات.

**٢.دیارترینی ئەو شتانەی كە دەبێت فەرمووده ناس خۆی پێ برازێنێتەوە پێیان :**

أ.ساغ كردنەوەو پاك كردنەوەی نیەت و پاك كردنەوەی دڵ لەمەبەستە دونیاییەكانی وەك كورسی پەرستیو ناو دەركردن.

ب.دەبێـت گەورەترین مەبەستو مەرام و خەمی بڵاوكردنەوەی فەرمودە، وگەیاندنی بێت لە پێغەمبەرەوە (ﷺ) و مەبەستیشی پێی دەستكەوتنی پاداشتی فراوان بێت.

ج.نابێت هەستێ بە گێڕانەوەی لە كاتێكا كە كەسێكی بەتەمەن تر و زانا تر لەو ئامادەبن .

د.دەبێت كەسێك كە پرسیاری لێكرد لە شتێك لەوفەرمودە، ئەگەر زانی ئەو شتانە لەلای كەسێكی تر هەیە، دەبێت ڕەوانەی لای ئەو كەسەی بكات.

هـ.نابێت ڕێگا بگرێت لەگێڕانەوەی کەسێك لەبەر ئەوەی کە نیەتی ساغ نییە، چونکە سابەڵکو فەرموودەکە ساغ بێت.

و.دەبێت کۆڕی دانیشتن بگرێت بۆ ئیملاکردنی فەرمودەو فێرکردنی خەڵکی ئەگەر توانای ئەوەی هەبوو، چونکە ئەمە باڵاترین پلەی گێڕانەوەیە.

**٣.ئەو شتانەی کە کردنیان سوننەتە، لەکاتی ئامادەبوونی مەجلیسی خوێندنەوە:**

أ.دەبێت پاکو بۆن خۆش بێت و ڕیشی دابێنێت.

ب.دەبێت بە جێگیری دابنیشێتو بەهەیبەتو شکۆیەکەوە، ئەمەش بۆ گەورە ڕاگرتنی فەرمودەکانی پێغەمبەر(ﷺ) .

ج.دەبێت ڕوو لەسەرجەم ئامادەبوان بکات، نەك تەنها کەسێك تایبەت بکات، جگە لەکەسانی تر، و تەنها ڕوو لەو بکات.

د.دەبێت سەرەتای مەجلیسەکەیو کۆتاییەکەی بە سوپاسی خوداو درورود لەسەر پێغەمبەر (ﷺ) و نزایەك کە بۆ ئەو حاڵەتە بشێت دەست پـێ بکات.

هـ.دەبێت لەو شتانە دوور بکەوێتەوە کە عەقڵی ئامادەبوان وەری نەگرێت، یان لەو شتانەی کە لە فەرموودەکەدا لێی تـێ ناگەن.

و.دەبێت کۆتایی خوێندنەوەکە بە چیرۆکو شتی نامۆ کۆتایی پـێ بێنێت، ئەمەش بۆ ساف کردنی دڵەکان و لابردنی خەوی غەفڵەت و بـێ ئاگایی.

**٤.ئەو تەمەنە چەندە کە دەبێت فەرمودەناس تیایدا دەست بەگێڕانەوەی فەرمودە بکات؟**

**ڕاجیایی هەیە لەمەدا:**

أ.گوتراوە لـە پەنجاسالّیدا و گوتراو یشە لـە چل سالّیداو قسەی تریش گوتراوە.

ب.بەلاّم گوتەی صەحیح ئەوەیە کە هەرکات ئەهلی ئەو کارە بوو، وەخەلّکان پێویستیان بەوە هەبوو، کە لەلای ئەمە، ئەوا دادەنیشێت، بۆ گێڕانەوە لەهەرتەمەنێکدا بێت.

**٥.بەناو بانگترین کتێب لەم بارەیەوە:**

أ.(الجامع لأخلاق الرّاوي و آداب السامع)ی (الخطيب البغدادي).

ب.(جامع بيان العلم و فضله ومايبنغي في روايته و حمله) دانـراوی (إبـن عبد البر).

# المبْحَثُ الثَاني

## آداب طالب الحديث

**١ – مقدمة:**

المراد بآداب طالب الحديث ، ما ينبغي أن يتصف به الطالب من الآداب العالية والأخلاق الكريمة التي تناسب شرف العلم الذي يطلبه ،وهو حديث رسول الله صلي الله عليه وسلم، فمن هذه الآداب ما يشترك فيها مع المحدث ، ومنها ما ينفرد بها عنه .

**٢– الآداب التي يشترك فيها مع المحدث :**

تصحيح النية والإخلاص لله تعالى في طلبه .

الحذر من أن تكون الغاية من طلبه التوصل إلى أغراض الدنيا ، فقد أخرج أبو داود وابن ماجة من حديث أبي هريرة قال : قال رسول الله صلي الله عليه وسلم : " من تعلم علماً مما يُبْتَغَي به وجهُ الله تعالى ، لا يتعلمه إلا ليصيب به غَرَضاً من الدنيا لم يجد عَرْفَ الجنة يوم القيامة " .

العمل بما يسمعه من الأحاديث.

**٣– الآداب التي ينفرد بها عن المحدث:**

أ) أن يسأل الله تعالى التوفيق والتسديد والتيسير والإعانة على ضبطه الحديث وفهمه .

ب) أن ينصرف إليه بكليته ، ويفرغ جهد ، في تحصيله .

ج) أن يبدأ بالسماع من أرجح شيوخ بلده إسناداً وعلماً وديناً.

د) أن يعظم شيخه، ومَنْ يسمع منه ويوقِّره، فذلك من إجلال العلم وأسباب الانتفاع، وأن يتحرّى رضاه، ويصبر على جفائه لو حصل.

هـ) أن يرشد زملاءه وإخوانه في الطلب إلى ما ظفر به من فوائد ، ولا يكتمها عنهم ، فان كتمان الفوائد العلمية على الطلبة لُؤْم يقع فيه جهلة الطلبة الوُضَعاء ، لأن الغاية من طلب العلم نشره .

و) ألا يمنعه الحياء أو الكِبْر من السعي في السماع والتحصيل وأخذ العلم ولو ممن دونه في السن أو المنزلة.

ز) عدم الاقتصار على سماع الحديث وكتابته دون معرفته وفهمه ، فيكون قد أتعب نفسه دون أن يظفر بطائل .

ح) أن يقدم في السماع والضبط والتفهم الصحيحين ثم سنن أبي داود والترمذي والنسائي ثم السنن الكبرى للبيهقي ثم ما تمس الحاجة إليه من المسانيد والجوامع كمسند أحمد وموطأ مالك، ومن كتب العلل، علل الدارقطني، ومن الأسماء التاريخ الكبير للبخاري والجرح والتعديل لابن أبي حاتم، ومن ضبط الأسماء كتاب ابن ماكولا ومن غريب الحديث النهاية لابن الأثير.

# باسی دووەم

## ئادابەکانی تامەزرۆیانی فەرموودە

### ١.پێشەکی:

مەبەست لە ئادابەکانی داواکاری فەرمودە (طالب الحديث) ئەوەیە کە دەبێت قوتابی پێی برازێنێتەوە لە ئادابی بەرزو ڕەوشتی چاك کە لەگەڵ شەرەفی ئەو زانستەدا بگونجێن، کە ئەو بەدواوەیەتی، کە ئەویش فەرمودەی پێغەمبەرە (ﷺ) لەو ئادابانە لەهەندێکیان قوتابیو فەرمودە ناس تیایدا هاوبەشن و هەندێکیشیان تایبەتە بە قوتابییەوە.

### ٢.ئەو ئادابانەی کە لەگەڵ فەرمودەناس دا تیایدا هاوبەشن:

أ.ساغ کردنەوەو پاك کردنەوەی نیەت بۆ خوای گەورە لە تامەزرۆبونیدا، بۆ دەست خستنی فەرمودە.

ب.بێداربوون لەوەی کە مەبەست لە دەست خستنی دا گەیشتن بێت بەمەبەستە دونیاییەکان (أبو داود) و (إبن ماجة) لەفەرمـودەی (أبو هريرة)ەوە، هێناویانە، کە وتویەتی: پێغەمبەر (ﷺ) فەرمویەتی: (من تعلم علماً مما يُبتَغى به وجه الله تعالـى، لايتعلمه إلا ليصيب به غرضاً من الدنيا لم يجد عَرْفَ الجنة يوم القيامة) واتە: هەرکەسێك خۆی فێری زانستێك بکات لەو زانستانەی کە تەنها لەبەر خاتری خوان، بەڵام ئەم تەنها لەبەر ئەوە فێر بێت، تا بەمەبەستێکی دونیایی بگات، ئەوە ئەو کەسە لەڕۆژی دواییدا بۆنی بەهەشت ناکات).

ج.دەبێت کار بکات بەو فەرمودانەی کە دەیان بیستێ.

**٣.ئەو ئادابانەی کە تایبەتن بە قوتابی فەرموودەوە: (طالب الحديث) نەك بەفەرموودەناس (المُحدث)ـەوە:**

أ.دەبێت داوای موەفەقێتی (التوفيق)و سەقامگیری (التسديد)و ئاسانکاری (التيسير)و یارمەتی (إعانة) لە خوا بکات، بۆ (ضبط)کردنی فەرموودەکان و لـێ تێگەیشتنیان.

ب.دەبێت خۆی بۆ ئەم مەبەستە یەکلایی بکاتەوە، وە هەموو هەوڵەکانی بخاتەگەڕ بۆ دەست خستنی.

جـ.دەبێت دەست بکات بە گوێ گرتن لە چاکترین مامۆستای شارەکەیەوە، کە چاکترینیان بێت لەڕووی سەنەدو زانستو دینەوە.

د.دەبێـت مامۆستاکەی بەگەورە بگرێت، و هەروەها ئەوەیش کە گوێی لێگرتووە، ورێزی لـێ بگرێت،چونکە ئەمە لەڕیزی زانستو هۆکارەکانی سوود وەرگرتنە، وە هەوڵـی ڕەزامەندکردنی بدات، وە خۆڕاگربێت لەسەر مەینەتیەکانی ئەگەر هەیبوو.

هـ.دەبێت ڕێنوێنی هاوەڵو برادەرانی بکات، بۆ ئەوەی کە ئەوانیش لەوسودەی کە ئەم بەدەستی کەوتووە، ئەوانیش دەستیان بکەوێت، لێیانی نەشارێتەوە، چونکە شاردنەوەی سوودەکانی زانست لە قوتابیان نەگبەتییەکە، کە قوتابی نەزانو قەڵب دەیکەن، چونکە مەبەست لە دەست خستنی زانست بلاوکردنەوەیەتی.

و.نابێت شەرم و خۆبەزل زانین جڵەو گیری لـێ بکەن، لە هەوڵدان بۆ گوێ گرتن و دەست خستنو وەرگرتنی زانست، با لە کەسانێکیشەوە بێت، کە لەتەمەن و پلەدا لەو کەمتر بن.

ز.كورت برِى نەكات لەوەدا كە تەنها گوێ لەفەرمودە بگرێت‌و بينوسێتەوەو ئيتر زانينى‌و تێگەيشتنى وەلا بنێت، چونكە بەم كارە دەروونى خۆى هيلاك كردووە، ونەگەيشتووە بەمەبەستەكە.

ح.دەبێت لەگوێ گرتن‌و (ضبط)كردن‌و لـێ تێگەيشتن دا، دوو كتێبە صەحيحەكە پێش بخات، و پاشان (سنن أبو داود)و (الترمذي)و (النسائي)و (السنن الكبرى)ى (البيهقي)و پاشان ئەوەى كە پێويستە لە (موسنەدەكان)و (جاميعەكان)، وەك (سنن أحمد)و (موطأ مالك)و لە كتێبەكانى (العلل)، (علل الدار قطني)و لە (ناوەكان – ألأسماء)دا، (التأريخ الكبير – للبخاري) و (الجرح و التعديل – لإبن أبي حاتم) وە لەوانەى كە (ضبط)ى ناوەكانى كردووە، وەك كتێبەكەى (إبن ماكولا) وە لەكتێبەكانى (غريب الحديث)، (النهاية)ى (إبن الأثير) ديراسە بكات.

## الإسناد ومَا يتعلقُ بهِ

- الفصل الأول: لطائف الإسناد.
- الفصل الثاني: معرفة الرواة.

### الفصل الأول

### لطائف الإسناد

١- الإسناد العالي والنازل.

٢- المسلسل.

٣- رواية الأكابر عن الأصاغر .

٤- رواية الآباء عن الأبناء .

٥- رواية الأبناء عن الآباء .

٦- المُدَبجّ ورواية الأقران.

٧- السابق واللاحِق.

# بەندی چوارەم

## دەربارەی سەنەدو ئەوەی پێوەی پەیوەستە

## ألأسناد و مايتعلق به

**بەشی یەکەم: جوانیەکانیی سەنەد ( لطائف الإسناد ).**

**بەشی دووەم: ناسینی گێڕەرەوەکان ( معرفة الرّواة ).**

# بەشی یەکەم

## جوانکارییەکانی سەنەد

١.سەنەدی بەرزی و نزمی (العالـي و النازل).

٢.زنجیرەو پەیوەند (المسلسل).

٣.گێڕانەوەی گەورە، لـە بچووك (رواية الأكابر عن الأصاغر).

٤.گێڕانەوەی باوك لـە كوڕ (رِواية الآباء عن الأبناء).

٥.گێڕانەوەی كوڕ لـە باوك (رواية الأبناء عن الآباء).

٦.گێڕانەوەی هاوتەمەن لـە هاوتەمەن (المُدَبج و رواية الأقران)

٧.باسی (السابق و اللاحق).

## الإسناد العَالي والنَّازل

١ – تمهيد:

الإسناد خَصيصة فاضلة لهذه الأمة ،وليست لغيرها من الأمم السابقة ،وهو سنة بالغة مؤكدة، فعلى المسلم أن يعتمد عليه في نقل الحديث والأخبار، قال ابن المبارك : " الإسناد من الدِّين ، ولولا الإسناد لقال مَنْ شاء ما شاء " وقال الثوري : " الإسناد سلاح المؤمن " كما أن طلب العُلوُ فيه سنةِ أيضاً ، قال أحمد بن حنبل : " طلب الإسناد العالي سُنَّة عمن سَلَف " لأن أصحاب عبدالله ابن مسعود كانوا يرحلون من الكوفة إلى المدينة فيتعلمون من عمر ويسمعون منه ، ولذلك استحبت الرحلة في طلب الحديث ، ولقد رحل غير واحد من الصحابة في طلب علو الإسناد ، منهم أبو أيوب وجابر رضي الله عنهما .

٢- تعريفه:

أ) لغة : العالي اسم فاعل من " العُلُوّ " ضد النزول ، النازل اسم فاعل من " النزول ".

ب) اصطلاحاً:

١- الإسناد العالي: هو الذي قَلَّ عدد رجاله بالنسبة إلى سند آخر يَردُ به ذلك الحديث بعدد أكثر.

٢- الإسناد النازل: هو الذي كثر عدد رجاله بالنسبة إلى سند آخر يَرِدُ به ذلك الحديث بعدد أقل.

٣- أقسام العلو:

يقسم العلو إلى خمسة أقسام، واحد منها علو مُطْلَق، والباقي علو نِسْبِي وهي:

أ) القُرْب من رسول الله صلي الله عليه وسلم بإسناد صحيح نظيف :

وهذا هو العلو المطلق ، وهو أجَلُّ أقسام العلو .

ب) القرب من إمام من أئمة الحديث :وإن كثر بعده العدد إلى رسول الله صلي الله عليه وسلم، مثل القرب من الأعمش أو ابن جُرَيْج أو مالك أو غيرهم ، مع الصحة ونظافة الإسناد أيضاً .

ج) القرب بالنسبة إلى رواية أحد الكتب الستة أو غيرها من الكتب المعتمدة:

وهو ما كثر اعتناء المتأخرين به من الموافقة والإبدال والمساواة والمصافحة.

١- فالموافقة: هي الوصول إلى شيخ أحد المصنِّفين من غير طريقه بعدد أقل مما لو رَوَي من طريقه عنه.

مثاله : ما قاله ابن حجر في شرح النخبة " روي البخاري عن قتيبة عن مالك حديثا ، فلو رويناه من طريقه [٣٣٤] كان بيننا وبين قتيبة ثمانية ، ولو روينا ذلك الحديث بعينه من طريق أبي العباس السراج [٣٣٥] عن قتيبة مثلا لكان بيننا وبين قتيبة فيه سبعة ، فقد حصلت لنا الموافقة مع البخاري في شيخه بعينه مع علو الإسناد على الإسناد إليه " [٣٣٦]

٢- البَدَل: هو الوصول إلى شيخ شيخِ أحد المصنِّفين من غير طريقه بعدد أقل مما لو روي من طريقه عنه.

مثاله : ما قاله ابن حجر : " كأَنْ يقع لنا ذلك الإسناد بعينه ، من طريق أخرى إلى القَعْنَبي [٣٣٧] عن مالك ، فيكون القَعْنَبي فيه بدلا من قتيبة .

٣- المساواة: هي استواء عدد الإسناد من الراوي إلى آخره مع إسناد أحد المصنِّفين .

مثاله:ما قاله ابن حجر : " كأَنْ يَرْوي النسائي مثلاً حديثاً يقع بينه وبين النبي صلي الله عليه وسلم فيه أَحَدَ عشر نَفْساً ، فيقع لنا ذلك الحديث بعينه بإسناد آخر ، بيننا وبين النبي صلي الله عليه وسلم فيه أَحَدَ عشر نفسا ، فنساوي النسائيَّ من حيث العدَد "

---

[٣٣٤] أي من طريق البخاري .

[٣٣٥] احد شيوخ البخاري .

[٣٣٦] شرح النخبة ص ٦١ .

[٣٣٧] القعنبي هو شيخ شيخ البخاري .

٤- المصافحة:

هي استواء عدد الإسناد من الراوي إلى آخره مع إسناد تلميذ أحد المصنِّفين . وسُمِّيَتْ مصافحةً لأن العادة جرت في الغالب بالمصافحة بين من تَلاَقَيا.

د) العلو بتقدّم وفاة الراوي:

ومثاله ما قاله النووي : " فما ارويه عن ثلاثة عن البيهقي عن الحاكم أعلى من أن أرويه عن ثلاثة عن أبي بكر بن خَلفَ عن الحاكم ، لتقدم وفاة البيهقي عن ابن خلف [٣٣٨]

هـ) العلو بتقدم السماع: أي بتقدم السماع من الشيخ، فمن سمع منه متقدماً كان أعلى ممن سمع منه بعده.

مثاله: أن يسمع شخصان من شيخ، وسماع أحدهما منذ ستين سنة مثلاً، والآخر منذ أربعين سنة، وتَساوي العدد إليهما، فالأول أعلى من الثاني، ويتأكد ذلك في حق من اختلط شيخه أو خَرِفَ.

٤- أقسام النزول:

أقسام النزول خمسة، وتعرف من ضدها، فكل قسم من أقسام العلو ضده قسم من أقسام النزول.

---

[٣٣٨] التقريب بشرح التدريب جـ٢ ـ ص ١٦٨ ، هذا وقد توفي البيهقي سنة ٤٥٨هـ وتوفي ابن خلف سنة ٤٨٧هـ .

### ٥- هل العلو أفضل أو النزول ؟

أ) العلو أفضل من النزول على الصحيح الذي قاله الجمهور، لأنه يُبْعِدُ كثرةَ احتمال الخَلَل عن الحديث، والنزول مرغوب عنه، قال ابن المديني " النزول شؤم " وهذا إذا تساوي الإسناد في القوة.

ب) ويكون النزول أفضل إذا تميز الإسناد النازل بفائدة [٣٣٩]

### ٦- أشهر المصنفات فيه :

لا توجد مصنفات خاصة في الأسانيد العالية أو النازلة بشكل عام ، لكن افرد العلماء بالتصنيف أجزاء أطلقوا عليها اسم " الثُلاثيات " ويعنون بها الأحاديث التي فيها بين المصنِّف وبين رسول الله صلى الله عليه وسلم ثلاثة أشخاص فقط ، وفي ذلك إشارة إلى اهتمام العلماء بالأسانيد العوالي ، فمن تلك الثلاثيات .

أ) ثلاثيات البخاري، لابن حجر.

ب) ثلاثيات أحمد بن حنبل ، للسَّفّاريني .

## -١-سەنەدی بەرزیو نزمی ( ألأسناد العالـي والنـازل )

### ١ .ڕێخۆشکردن:

ئەم ڕشتە گوزارییە (الإسناد) تایبەتمەندییەکی بە پێزی ئەم ئۆممەتەیەو هیچ گەلێك لەگەلە پێشووەکان نەیبووە، وە سوننەتێکی گرنگی جەخت لەسەر کراوە (المؤكدة)ەیە، لەسەر موسڵمانان پێویستە کە پشتی پێ ببەستین، لەگواستنەوەی فەرمودەو هەواڵەکاندا، (إبن المبارك) دەفەرموێت، ئیسناد لە

[٣٣٩] كأن يكون رجاله أوثق من رجال الإسناد العالي أو أحفظ أو أفقه .

دینەوەیە،وە ئەگەر ئەم ئیسنادە نەبوایە، هەرکەس هەرچی بویستایە دەیگوت، وە (الثوري) دەڵێت: ئیسناد چەکی ئیمانداره (هەروەك هەوڵدان بۆ دەستخستنی – سەنەدی– بالاَ (العالــی) سوننەتیشە)، (إمام أحمد بن حنبل) دەفەرموێت: هەوڵدان بۆ سەنەدی بالاَ (الإسناد العالــی) سوننەتێکە لە پیاوچاکانی پێشینەوە ماوەتەوە،چونکە هاوەڵانی (عبدالله بن مسعود) لە (کوفة)ەوە سەفەریان دەکرد بۆ (مدینة)شت لە (إمام عمر)ەوە فێر دەبوون، و گویَ یان لێدەگرت هەربۆیەش گەڕان بەشوێن فەرمودەدا بوویە سوننەت (مستحب)، جاکەسانێکی زۆر لە هاوەڵانﷺسەفەریان کردووە، لە پێناوی دەستخستنی سەنەدێکی بالاَ (علوّ الإسناد)دا، لەوانە (أبو أيّوب و جابر) ﷺ.

**٢.پێناسەکەی:**

**أ.لەڕووی زمانەوە:**(العالــی – بالاَ)ئیسمی فاعیلەو لە (العُلّو – بەرزێتیو بالاَیەتی)یەوە هاتووە، و دژی (النزول – نزمی)یەوە، (النازل)یش ئیسمی فاعیلەو لە (ألنزول)ــەوە، هاتووە.

**ب.لەڕووی زاراوەوە:**سەنەدی بالاَ (ألإسناد العالی) ئەو سەنەدەیە کە ژمارەی پیاوەکانی لە چاو سەنەدێکی دیکەدا کەمترە کە ئەو سەنەدەی تر بە ژمارەیەکی زۆر ترەوە فەرمودەکەی هێناوە.

**٢.سەنەدی نزم (ألإسناد النازل):**

ئەو فەرمودەیە یە کە ژمارەی پیاوەکانی لەچاو سەنەدێکی دیکەدا زیاترە، کە ئەو سەنەدەی تریان بە ژمارەیەکی کەمترە وە فەرمودەکەی هێناوە.

### ٣.بەشەكانی بالآیەتی (العَلُو):

بالآیەتی (العلو) دابەش دەبێت بۆ پێنج بەش، كە یەكێكیان (عُلوّ مطلق)ـە،و ئەوانی تر (علو نسبی)ین، كە ئەمانەن:

أ.نزیكی لە پێغەمبەرەوە (ﷺ) بەسەنەدێكی ساغی پاكەوە، ئەمە بالآیەتی ڕەها (علو مطلق)ە، كە شكۆمەندترین بەشەكانی (علو)ـە.

ب.نزیكی لە پێشەوایەك لە پێشەواكانی فەرموودە، هەرچەند ژمارەكانی دواییش زۆر دووربن لە پێغەمبەرەوە (ﷺ)، وەك نزیكی لە (ألأعمش)و یان (إبن جُرَيْج) یان (مالك) و هتد....ئەمە لەگەڵ ساغی و پاكی سەنەدەكەدا دەبێت.

جـ.نزیكێتی لە گێڕأنەوەكانی یەكێك لە شەش كتێبەكە یان لە كتێبەباوەڕ پێكراوەكانی تر.

كە ئەمەشیان لەلایەن (المتأخرين)ـەوە، زیاتر جێی بایەخ بووە، هەر لە (الموافقة– و ألأبدال — و المساواة — و المصافحة) كە باسیان دەكەین.

١.**الموافقة.هاوڕێكی**:كە بریتیە لە گەیشتن بە مامۆستای یەكێك لەخاوەن كتێبەكان، وەك: بخاری‌و ومسلم....بەڕێگایەك لە غەیری ڕێگاكەی ئەو كە ژمارەكەی كەمتر بێت، لەو ڕێگایەی كە لەو مامۆستایەوە گێڕدراوەتەوە بۆنمونە: ئەوەی كە (حافظ إبن حجر) لە (شرح النخبة)دا دەڵێت: (بخاری) لە (إبن قتيبة)ـەوە، ئەویش لە (مالك)ـەوە، فەرمودەیەك دەگێڕێتەوە،كە، ئەگەر لە ڕێگای بوخارییەوە بمانگێڕایەتەوە، ئەوا لەنێوان ئێمەو قوتەیبەدا هەشت كەس دەبوو، ئەگەر هەر ئەو فەرمودەیەش بگێڕینەوە لە ڕێگای (أبو العباس السراج)ەوە، كە یەكێكە لە مامۆستاكانی بوخاری، ئەویش لە (قتيبة)ەوە، بۆ

نمونە: لەنێوان ئێمەو (قتيبة)ەدا حەوت کەس دەبوو، ئەوا لەگەڵ خودی بوخاریدا هاورێکی (الموافقة)مان لەمامۆستاکەیدا بۆ دروست بووە، ئەمەش لەگەڵ بالآیەتی لە سەنەدەکەدا، بەسەر سەنەدەکەی ئەودا[٣٤٠].

٢.البَدَلْ.لەجیاتی دانان:کە بریتیە لە گەیشتن بەمامۆستای یەکێك لە مامۆستاکانی خاوەن کتێبەکان بەغەیری ڕێگاکەی ئەو بەژمارەیەکی کەمتر، کە ئەگەر لەوەوە ئەو ڕیوایەتە بگێڕدرایەتەوە،

وەك : ئەوەی کە (حافظ إبن حجر) دەیلێت: هەرخودی هەمان سەنەدمان بۆ دەهات لە ڕێگایەکی ترەوە هەتا سەر (قعنَبی) لەمالیکەوە، جا لێرەدا (قعنبی) لە جیاتی (بدل)ی (قتيبة)یەیە، کە (قعنبی) مامۆستای بوخارییە.

٣.المساواة.یەکسان بوون:کە بریتیە لە یەکسان بوونەوەی ژمارەی پیاوانی سەنەد لە ڕاوییەکەوە بۆ ڕاوییەکی تر، کە لەگەڵ سەنەدی یەکێك لە خاوەن کتێبەکان (المصنفين)دا تێك بکاتەوەو یەکسان بن.

نمونەکەی: وەك ئەوەی کە (إبن حجر) دەڵێت: وەك ئەوەی کەبۆ نمونە (نسائی) فەرمودەیەك بگێڕێتەوە، کە لەنێوان ئەوو پێغەمبەر دا (ﷺ) یانزە کەس هەبن، کەچی هەر ئەو فەرمودەیەمان بەسەنەدێکی تر بۆ بێت، کەچی لەنێوان ئێمەو پێغەمبەردا (ﷺ) هەر یانزدە کەس هەبن، کەلێرەدا لەڕووی ژمارە وە لەگەڵ (النسائی)دا یەکسان دەبین.

٤.المصافحة.دەست خستنەناودەست:کە بریتیە لە یەکسان بوونەوەی ژمارەی پیاوانی سەنەد لە ڕاویەکەوە بۆ یەکێکی تر، ئەم یەکسان بونەوەیە لەگەڵ سەنەدی قوتابی یەکێك لەخاوەن کتێبەکانەوە دەبێت، وە ناونراوەتە

(٣٤٠) شرح النخبة ص٦١

(مُصافحة — دەستخستنە ناودەست)، چونکە عادەتەن دەستخستنە ناودەست لەنێوان ئەو کەسانەدا ڕویداوە بەزۆری کە بەیەك گەیشتوون.

**د.بالآیەتی بە پێشکەوتنی مردنی گێڕەرەوە (العلوّ بتقدم وفاة الرّاوي):**

نمونەکەیشی وەك ئەوەی کە (إمام نواوی) دەیڵێت: ئەوەی کە ڕیوایەتی دەکەم لە (٣) کەسەوە و لە (البیهقی)و (الحاکم)ەوە، بالآترە لەوەی کە ڕیوایەتی بکەم، لەسێ کەسەوەو ئەوانیش لە (أبو بکر بن خلف) و لە (حاکم)ەوە، ئەمەش لەبەر پێش کەوتنی مردنی (بیهقی) بەسەر (إبن خلف)دا[٣٤١].

**هـ.بالآیەتی بەهۆی زوو تر گوێ لێبوونەوە (العلوّ بتقَدّم السماع):**

**واته:**بەلە پێش تر گوێ لێ بوون لە مامۆستاکەوە، جا ئەوەی کە پێشتر گوێی لێی بوو، بالآترە لەوەی کە دواتر گوێی لێبووە.

بۆ نمونە: وەك ئەوەی کە دووکەس لە مامۆستایەکەوە شتێك ببیستن، جا گوێ لێ بوونی یەکێکیان بۆ نمونە نزیکەی (٦٠) ساڵ بێت، وە ئەوی تریان نزیکەی (٤٠) ساڵ بێت —گوێی لێوە بووبێت— وە ژمارەی سەنەدەکەیشی —تا سەریان هەروەك یەك بێت— جا یەکەم بالآترە لە دووەم، ئەمەش جەختی لەسەر دەکرێتەوە لە کەسێکدا کە مامۆستایەکی لێ تێکچووە و لەبەر چاوی شێواوە.

**٤.بەشەکانی نزمی (النزول):**

بەشەکانی (نزول) پێنجن، وە لە پێچەوانە کانیانەوە بزانە، جا هەر بەشێك لە بەشەکانی (علوّ) دژەکەی بەشێکە لەبەشەکانی (نزول).

---

(٣٤١) التدریب شرح التقریب ج٢ /ص١٦٨ (البیهقي) لە ساڵی (٤٥٨) و (إبن خلف) لەساڵی (٤٨٧)ـەوە، وەفاتیان کردووە.

## ٥.ئایا (علوّ) بەڕێز ترە یان (نزول):

أ.لەسەر ئەو گوتە ساغەی کە جەماوەری زانایانی لەسەرە، ئەوەیە کە (العلوّ) بەڕێز ترە لە (نزول)، چونکە بە –نزیکی سەنەدەکە–زۆری هەڵە کەوتنە ناو فەرمودەکەوە دوور دەکەوێتەوە، وە (النزول) شتێکە زۆر ڕەغبەتی نییە، (إبن المدینی) دەفەرموێ، (النزول شؤم) ئەم نزمییە (نزول)ـە شوومە، ئەمە ئەگەر سەنەدەکە لە هێزیشدا ڕێك بوبوونەوە.

ب.وە جاری وا هەیە (نزول) بەڕێز ترە، ئەمە ئەگەر (إسناد النازل) ەکە، بەچەند سودێك جیاکرابووەوە، وەك:ئەوەی کە پیاوەکانی ئەم (إسناد النازل)ە، خاوەن پیاوی متمانەترو هێزی لەبەرکردنیان باشترو تێگەیشتوو تربن، لە (إسناد العالـی).

## ٦.بەناوبانگترین کتێب تیایدا:

کتێبی تایبەت بەسەنەدی (عالـی و نازل) بەشێوەیەکی گشتی نییە، بەڵام زانایان هەستاون بە تایبەت چەند کتێبێکیان داناوە، کەناوی (ثلاثیات) یان لێناوە، کە مەبەستیان پێی ئەو فەرمودانەیە کە لەنێوان دانەری کتێبەکەو پێغەمبەردا (ﷺ) تەنها سێ کەس هەیە، کە لەمەشدا ئاماژەیەك هەیە، بۆ بایەخدانی زانایان بەسەنەدە باڵاکان (الإسناد العوالـي) لەو کتێبانە،

أ.(ثلاثیات البخاري) دانراوی (حافظ إبن حجر).

ب.(ثلاثیات أحمد بن حنبل) دانراوی (السفاريني).

## المسَلْسَلْ

- ٢ -

**١- تعريفه:**

أ) لغة: اسم مفعول من " السَّلْسَلَة " وهي اتصال الشيء بالشيء، ومنه سِلْسِلَة الحديد، وكأنه سمى بذلك لشبهه بالسِّلْسِلة من ناحية الاتصال والتماثل بين الأجزاء.

ب) اصطلاحاً: هو تتابع رجال إسناده على صفة أو حالة للرواة تارة، وللرواية تارة أخرى.

**٢- شرح التعريف:**

أي أن المسلسل هو ما تَوَالي رواة إسناده على:

أ) الاشتراك في صفة واحدة لهم .
ب) أو الاشتراك في حالة واحدة لهم أيضاً .
ج) أو الاشتراك في صفة واحدة للرواية.

**٣- أنواعه:**

يتبين من شرح التعريف أن أنواع المسلسل ثلاثة وهي : المسلسل بأحوال الرواة ، والمسلسل بصفات الرواة ، والمسلسل بصفات الرواية ، وإليك فيما يلي بيان هذه الأنواع .

أ) المسلسل بأحوال الرواة :

وأحوال الرواة ، أما أقوال أو أفعال ، أو أقوال وأفعال معاً .

١–المسلسل بأحوال الرواة القولية : مثل حديث معاذ ابن جبل أن النبي صلي الله عليه وسلم قال له : " يا معاذ إني أحبك فقل في دُبُر كل صلاة : اللهم أَعِنِّي على ذكرك وشكرك وحسن عبادتك " فقد تسلسل بقول كل من رواته " وأنا أحبك ، فَقُلْ [٣٤٢]

٢–المسلسل بأحوال الرواة الفعلية: مثل حديث أبي هريرة قال: " شَبَّكَ بيدي أبو القاسم صلي الله عليه وسلم وقال: " خلق الله الأرض يوم السبت " فقد تسلسل بتشبيك كل من رواته بيد من رواه عنه [٣٤٣]

٣–المسلسل بأحوال الرواة القولية والفعلية معاً : مثل حديث أنس قال : قال رسول الله صلي الله عليه وسلم : " لا يجد العبد حلاوة الإيمان حتى يؤمن بالقدر خيره وشره حُلْوِهِ ومُرِّهِ وقبض رسول الله صلي الله عليه وسلم على لحيته وقال : آمنت بالقَدَر خيره وشره حلوه ومره " [٣٤٤] تسلسل بقبض كل راو من رواته على لحيته ، وقوله : آمنت بالقدر خيره وشره وحلوه ومره .

ب) المسلسل بصفات الرواة :

وصفات الرواة : أما قولية أو فعلية .

١–المسلسل بصفات الرواة القولية : مثل الحديث المسلسل بقراءة سورة الصَّفِّ فقد تسلسل بقول كل راو : " فقرأها فلان هكذا " هذا وقد قال العراقي : " وصفات الرواة القولية وأحوالهم القولية متقاربة بل متماثلة .

---

[٣٤٢] أخرجه أبو داود ، في الوتر .

[٣٤٣] أخرجه الحاكم مسلسلا في معرفة علوم الحديث ص ٤٢ .

[٣٤٤] أخرجه مسلسلا الحاكم في معرفة علوم الحديث ص ٤٠ .

٢–المسلسل بصفات الرواة الفعلية : كاتفاق أسماء الرواة ، كالمسلسل بـ " المُحَمَّدِيْنَ " أو اتفاق اسمائهم ، كالمسلسل بالفقهاء أو الحفاظ أو اتفاق نِسْبَتِهم كالدمشقيين أو المصريين .

ج) المسلسل بصفات الرواية : وصفات الراوية إما أن تتعلق بصِيَغ الأداء ، أو بزمن الرواية ، أو مكانها .

١–المسلسل بصِيَغ الأداء : مثل حديث مسلسل بقول كل من رواته " سمعت" أو "أخبرنا " .

٢–المسلسل بزمان الرواية : كالحديث المسلسل بروايته يوم العِيد .

٣–المسلسل بمكان الرواية : كالحديث المسلسل بإجابة الدعاء في المُلْتَزِم .

**٤– أفضله :**

وأفضله ما دل على الاتصال في السماع وعدم التدليس .

**٥– من فوائده :**

اشتماله على زيادة الضبط من الرواة .

**٦– هل يشترط وجود التسلسل في جميع الإسناد ؟**

لا يشترط ذلك ، فقد ينقطع التسلسل في وسطه أو آخره ، لكن يقولون في هذه الحالة : " هذا مسلسل إلى فلان " .

**٧– لا ارتباط بين التسلسل والصحة:**

فقَلَّمَا يسلم المسلسل من خلل في التسلسل، أو ضعف، وإن كان أصل الحديث صحيحاً من غير طريق التسلسل.

**٨- أشهر المصنفات فيه :**

أ) المُسَلْسَلات الكبرى للسيوطي ، وقد اشتملت على / ٨٥/ حديثاً .

ب) المناهل السَّلْسَلَة في الأحاديث المُسِلْسِلَة ، لمحمد عبدالباقي الأيوبي ، وقد اشتملت على / ٢١٢/ حديثاً .

## -٢- پەیوەندکراو ( المسلسل )

### ١.پێناسەکەی:

**أ.لەڕووی زمانەوە:** ئیسمی مەفعولەو لە (السلسلة – زنجیرەیی)یەوە هاتووە، کەواتای لکاندنی شتێك بە شتێکی ترەوەی هەیە، هەر لەمەشەوە یە (سلسلة الحدید)، بۆیە بەمەش ناسراوە، وەك بڵێی، لەلایەکەوە بەهۆی لێکچوونی لە زنجیرو لەلایەکی تریشەوە بەهۆی هاو وێنەیی لەنێوان بەشەکانیدا.

**ب.لەڕووی زاراوەوە:** بریتیە لە هاورێك بوونی پیاوانی سەنەدەکەی لەسەر صیفەتێك یان حاڵەتێك، ئەمە لەلایەکەوە بۆ ڕاوییەکانو لەلایەکی تریشەوە بۆ ڕیوایەتەکە.

### ٢.شەرحی پێناسەکە:

واتە:مُسَلْسَلْ: ئەوەیە کە گێڕەرەوانی ئەو سەنەدە یەك لەدوای یەکو وەك یەکن لە:

أ.هەموویان هاوبەشن لەیەك صیفەتدا.

ب.هەروەها هەموویان هاوبەشن لەیەك حاڵەتدا.

جـ.یان هاوبەشن لەتەنها صیفەتێکی ڕیوایەتەکەدا.

**٣.جۆرەکانی:**

لە شەرحی پێناسەکەوە دەردەکەوێت، کە سێ جۆر (مسلسل) هەیە، کە ئەمانەن:

أ.المسلسل بأحوال الرواة.
ب.المسلسل بصفات الرواة.
جـ.المسلسل بصفات الرواية.
جا ڕونکردنەوەی ئەم سێ جۆرەت بۆدەکەم:

**أ.المسلسل بأحوال الرواة:** موسەلسەل بونەکەی بەهۆی ئەو حاڵەتەوەیە کە گێڕەرەوەکانی تیادایە.

وەحاڵەتی ڕاویەکان یان گوفتاری یە، یان کرداریە، و یان هەردووکیانە.

**١.المسلسل بأحوال الرواة:** گوفتارییەکەی: وەك فەرمودەکەی (معاذ بن جبل)کە پێغەمبەر (ﷺ) پێی فەرمووە .. (يامعاذ إني أحبك فقل في دبر كل صلاة اللهم أعنّي على ذكرك وشكرك وحسن عبادتك) واتە: ئەی موعاز خۆشم دەوێت، بۆیە لەدوای هەموو نوێژێکەوە بڵێ : اللهم أعنّي..........).

لە گوتەی سەرجەم ڕاوییەکاندا(أنا أحبك فقل[٣٤٥] – بەزنجیرەیی (تسلسل) (تسلسل) و بەگوفتار – هاتووە.

**٢.المسلسل بأحوال الرواة:** کردارییەکەی: وەك فەرمودەکەی (أبو هريرة) کە دەفەرموێ : (شبّك بيدي أبو القاسم (ﷺ) وقال (خلق الله الأرض يومَ

---

(٣٤٥) أخرجه ابو داود في الوتر.

السبت) واتە: پێغەمبەر (ﷺ) پەنجەی خستەناو پەنجەکانم و فەرموی خودا زەوی لەڕۆژی شەممەدا دروست کرد.

جا ئەم فەرمودەیە بەزنجیرەیی کە هاتووە سەرجەم ڕاوییەکانی لەکاتی گێڕانەوەیدا پەنجەیان خستوەتە نێو پەنجەی یەکترییەوە بەکرداری[٣٤٦].

**٣.المسلسل بأحوال الرواة:**گوفتارو کردار پێکەوە: وەك فەرمودەکەی (أنس) کە دەڵێت: پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: (لايجد العبد حلاوة ألإيمان حتى يؤمن بالقدر خيره و شرّه حُلوهِ و مُرّه وقبض رسول الله (ﷺ) على لحيته وقال: آمنت بالقدر خيره و شرّه وحلوه و مرّه) واتە: بەندە تام و چێژی باوەڕ ناچێژێت، تا باوەڕی بە چارەنووسیی خوایی (القدر) نەبێت، لەچاكو خراپو شیرینو تاڵی، جا پێغەمبەر (ﷺ)ڕیشی خۆی گرت و فەرمووی: بڕوام بەقەدەر هەیە، چاكو خراپ و شیرینو تاڵـی[٣٤٧]، کە بە زنجیرەیی هەموو گێڕەرەوەیەك لەکاتی گێڕانەوەیدا ڕیشی خۆیی گرتووەو وتویەتی، (أمنتُ بالقدر خيره و شره حلوه و مرّه).

**ب.المسلسل بصفات الرواة:**پەیوەندکراو بەهۆی بوونی سیفەتێکەوە لەسەر جەمی گێڕەرەوەکاندا کە ئەمەش دوو جۆرە:

**گوفتاری و کرداری.**

**١.المسلسل بصفات الرواة:**گوفتارییەکەی:وەك ئەو فەرمودە زنجیرەییەی کە دەربارە بە خوێندنی سورەتی (الصف)ە، کە بە زنجیرەیی لە گوتەی هەموو ڕاویەکدا هاتووە، (فقرأها فلان هكذا —فلاّنە کەس بەو جۆرە خوێندویەتیەوە).

---

(٣٤٦) أخرجه الحاكم مسلسلاً في معرفة علوم الحديث ص٤٢.

(٣٤٧) أخرجه مسلسلاً الحاكم في معرفة علوم الحديث ص٤٠.

ئەمەو (إمام العراقي) فەرمويەتی: صيفاتی گێڕەرەوەكان بە گوفتارو حاڵەتی گێڕەرەوەكان بە كرداری زۆر نزيكن پێكەوەو بەڵكو لێك چوويشن.

**٢.المسلسل بصفات الرواة:**كرداری يەكەی:وەك ڕێك كەوتنی ناوی گێڕەرەوەكان وەك (مسلسل) بە (المُحَمّدَيْنْ) يان ڕێك كەوتنی ناوەكانيان (إتفاق ألأسماء) وەك (مسلسل)ی شەرعزانان (الفقهاء)و (الحفاظ) حافيزەكان: يان تێك گرتنەوەی نيسبەتەكانيان، وەك (الدمشقيين) ديمەشقيەكان و (المصريين) ميسريەكان.

**جـ.المسلسل بصفات الرّواية:**پەيوەندكراو بە هۆی صيفەتی گێڕانەوەكەوە:كە صيفاتی گێڕانەوەش يان بەشێوازی دانەوە (صيغ الأداء) يان بەكاتی گێڕانەوەكەوە يان بە شوێنەكەيەوە پەيوەستە.

**١.المسلسل بصيغ ألأداء:**وەك فەرمودەی زنجيرەيی كە لەسەرەتای ڕيوايەتەكاندا دەڵێن(سمعت) يان (أخبرنا).

**٢.المسلسل بزمان الرواية:**كاتەكەی:وەك ئەو فەرمودە پێوەندەی كە بەزنجيرەيی لە ڕۆژی جەژندا ڕيوايەت كراوە.

**٣.المسلسل بمكان الرّواية:**شوێنەكەی:وەك فەرمودەی (مسلسل) گەلـی وەلاّم دانەوەی نزا لە (ملتزَم)دا، كە جێگايەكە.

**٤.گرنگترينيان (أفضله):**

ئەوەيانە كە پێوەند (الأتصال)ی هەيەو لە گوێ گرتنەكەيداو (درۆ :التدليس)ی تيادا نييە.

**٥.لە سوودەكانی:**ئەوەيە كە زۆر (ضبط)ی گێڕەرەوەكان بەسەريەوە ديارە.

**٦.ئایا بوونی (تسلسل)ەکە لەسەرجەمی سەنەدەکەدا بەمەرج گیراوە؟** ئەمە بەمەرج نەگیراوە، جاری وا هەیە کە (تسلسل)ەکە لە ناوەڕاستیدا یان لە کۆتاییەوە دەپچڕێت، بەڵام لەم کاتەدا دەگوترێ: (هذا مسلسل إلى فلان).

**٧.هیچ پەیوەندی یەك لەنێوان (تسلسل)و صەحیحێتیدا نییە؟**

کەم جار فەرمودەی (مسلسل) لەو (تسلسل)ەیدا، پارێزراوە لەخەلەلو لاوازێتی، هەرچەندە ئەصڵی فەرمودەکەیش صەحیح بێت، لەغەیری ئەو ڕێگای (تسلسل)ەی.

**٨.بەناوبانگترین کتێب تیایدا:**

أ.(المسلسلات الکبری)ی (إمام سیوطي) کە (٨٥) فەرمودەی گرتۆتەوە.

ب.(المناهل السلسلة في ألأحاديث المُسَلْسَلة)ی (محمد عبدالباقي ألأيّوبي) کە (٢١٢) فەرمودەی گرتۆتەوە.

## - ٣ - رواية الأكابر عن الأصاغر

**١ – تعريفه:** [348]

أ) لغة : الأكابر جمع " أَكْبَرَ " والأصاغر جمع " أَصْغَر " والمعني : رواية الكبار عن الصغار .

ب) اصطلاحاً: رواية الشخص عمن هو دونه في السن والطبقة أو في العلم والحفظ.

---

[348] الهاء عائد لهذا النوع من علوم الحديث .

**٢- شرح التعريف :**

أي أن يروي الراوي عن شخص هو أصغر منه سناً وأدنى طبقة، والدُّنُوُّ في الطبقة كرواية الصحابة عن التابعين ونحو ذلك. أو يروي عمن هو أقل منه علماً وحفظاً ، كرواية عالم حافظ عن شيخ ولو كان ذاك الشيخ كبيراً في السن ، هذا وينبغي التنبه إلى أن الكِبَر في السن أو القِدَم في الطبقة وحده ، أي بدون المساواة في العلم عمن يروي عنه لا يكفي لأن يُسَمَّي رواية أكابر عن أصاغر ، والأمثلة التالية توضح ذلك .

**٣- أقسامه وأمثلتها:**

يمكن أن نقسم رواية الأكابر عن الأصاغر إلى ثلاثة أقسام وهي:

أ) أن يكون الراوي أكبر سناً وأقدم طبقة من المَرْوِيِّ عنه. ( أي مع العلم والحفظ أيضاً ).

ب) أن يكون الراوي أكبر قَدْراً ـ لا سناً ـ من المروي عنه، كحافظ عالم عن شيخ كبير غير حافظ.

مثل : رواية مالك عن عبدالله بن دينار .[٣٤٩]

ج) أن يكون الراوي أكبر سناً وقَدْراً من المروي عنه، أي أكبر وأعلم منه.

مثل : رواية البَرْقاني عن الخطيب [٣٥٠]

**٤- من رواية الأكابر عن الأصاغر :**

أ) رواية الصحابة عن التابعين : كرواية العَبَادِلة وغيرهم عن كعب الأحبار .

---

[٣٤٩] فمالك إمام حافظ ، وعبدالله بن دينار شيخ راو فقط ، وان كان اكبر سناً من مالك .

[٣٥٠] لأن البرقاني أكبر سناً من الخطيب ، وأعظم قدراً منه لأنه شيخه ومعلمه وأعلم منه .

ب) رواية التابعي عن تابِعِيِّهِ : كرواية يحيي بن سعيد الأنصاري عن مالك .

**٥- من فوائده :**

أ) إلا يُتَوَهَّم أنَّ المروِي عنه أفضل وأكبر من الراوي لكونه الأغلب.

ب) إلا يُظَنَّ أن في السند انقلاباً ، لأن العادة جرت برواية الأصاغر عن الأكابر .

**٦- أشهر المصنفات فيه :**

أ) كتاب " ما رواه الكبار عن الصغار والآباء عن الأبناء " للحافظ أبي يعقوب اسحق بن إبراهيم الورّاق المتوفى سنة ٤٠٣هـ.

## -٣- گێڕانەوەی گەورەکان لە بچوکەکان

## رواية ألاكابر عن ألأصاغر

**١.پێناسەکەی:**

**أ.لەڕووی زمانەوە:**(ألأكابر)جەمعی (أكبر)ە،و(ألأصاغر) جەمعی (أصغر)ە، ماناكەیشی واتە: گێڕانەوەی گەورە لە بچووكەوە.

**ب.لەڕووی زاراوەوە:**گێڕانەوەی کەسێکە لە کەسێکی ترەوە کە لەم کەمتر بێت لەڕووی تەمەن بێت یان پلە (الطبقة)ـەوە، یان لەڕووی زانست یان لەبەر کردن (حفظ)ـەوە بێت.

**٢.ڕونکردنەوەی پێناسەکە:**

**واتە:** گێڕەرەوە کە لە کەسێکەوە شتێك بگێڕێتەوە، کە ئەو کەسە لێی کەم

تەمەن تر بێت و پلەی نزم تـر بێـت، وە نزمـی لــە پلەیشــدا، وەك ڕیوایـەت کردنی صەحابی لە تابیعینەوەو وێنەی ئەمە.

یاخود لە کەسێکەوە شت بگێڕێتەوە کە لەڕووی زانست و لەبەرکردنەوە ئەم کەسی دووەمە – لێی کەمتر بێت، وەك گێڕانەوەی زانایەکی بیر تیژ (عالم حافظ) لە مامۆستا (شیخ)ێکەوە، هەرچەندە ئەو شێخە گەورە تر بێت لە تەمەندا، وە پێویستە ئاگادار بوون لەوەی کە تەنها گەورەیی لەتەمەن‌و پلەدا، واتە بەبێ هاوڕێکی لە زانستدا لەو کەسەوەی کە لێوەی شت دەگێڕێتەوە، وە ئەمە تەنها خۆی بەس نییە بەوەی کە ناو بنرێت بەڕیوایەتی گەورە لە بچووك (روایة: الأکابر عن ألأصاغر)، وە ئەو نمونانەی کە دێن، ئەمە ڕوون دەکەنەوە.

### ٣.بەشەکانی و نمونەکانی:

دەکرێت کە گێڕانەوەی گەورە لە بچووك بۆســێ بەش دابەش بکرێت کە ئەمانەن :

أ.ئەوەیە کە گێڕەرەوە بەتەمەن تر بێت، وە پلەکەی لە پێش تر بێت لەو کەسەی کە ڕیوایەتی لێوە کردووە، (واتە ئەمە لەگەڵ زانست‌و لەبەر کردن دا دەبێت).

ب.ئەوەیە کە گێڕەرەوە بەرێز تر بێت (أکبر قَدْراً) نەك بەتەمەن تر بێت لە ڕیوایەت لێکراوەوە، وەك گێڕانەوەی (حافزێکی زانا) لە مامۆستایەکی گەورەوە، بەڵام (حافظ) نەبێت، وەك: ڕیوایەتی (مالك) لە (عبدالله بن دینار)[٣٥١]ەوە.

---

(٣٥١) (مالك) پێشەوایەکی (حافظ)ە، و (عبدالله بن دینـار) تـەنها مامۆسـتایەکی گێڕەرەوەیـە، هەرچەندە بەتەمەن ترە لە (مالك).

جـ.دەبێت گێڕەرەوە بەتەمەن تر بێت‌و بەڕێز تر بێت لە ڕیوایەت لێکراوەوە، واتە گەورەترو زاناتر بێت لێی، وەك : گێڕانەوەی (البرقاني) له (الخطيب)[٣٥٢]ەوە.

## ٤.لە گێڕانەوەکانی گەورە لە بچووك:

أ.گێڕانەوەی صەحابی لە تابیعین، وەك ڕیوایەتی (عبادلة)، واتە: (عبدالله)کان، و هی تریش لە (کعب الأحبار)ەوە.

ب.گێڕانەوەی تابیعی، لەو تابیعیانەوە کە شوێن ئەم کەوتون، واتە:تابیعی ئەمن، وەك: گێڕانەوەی (يحيى بن سعيد الأنصاري) لە (مالك)ەوە.

## ٥.لە سوودەکانی:

أ.بۆ ئەوەی وا گومان نەبرێت کە ئەو کەسەی ڕیوایەتەکەی لێوەکراوە، بەڕێزترو گەورەترە، لە گێڕەرەوە، چونکە ئەم گومانە زۆر دەبرێ.

ب.تاوا گومان نەبرێت، کە لە سەنەدەکەدا گۆڕانکارییەك هەیە، چونکە عادەت لەو گێڕانەوەی گەورە لە بچووکا وایە، کابرا وا دەزانێت گۆڕان تیایداکراوە.

## ٦.بەناو بانگترین دانراو تیایدا:

أ.کتێبی (مارواه الكبار عن الصغار و الآباء عن ألأبناء)ی (حافظ ابو يعقوب أسحاق بن ابراهيم الوَّراق) کەلە ساڵی (٤٠٣هـ) کۆچی دوایی کردووە.

---

(٣٥٢) چونکە (برقاني) بەتەمەنترە لە (خطيب)، بەلاّم بەڕێز ترە لێی، چونکە شێخیەتی‌و مامۆستایەتی‌و زاناتریشە لێی.

## ٤ - رواية الآباء عن الأبناء

**١ - تعريفه:**

أن يوجد في سند الحديث أَبٌ يروي الحديث عن ابنه .

**٢ - مثاله:**

حديث رواه العباس بن عبد المطلب عن أبنه الفضل أن رسول الله صلي الله عليه وسلم جمع بين الصلاتين بالمزدلفة .

**٣ - من فوائده :**

ألا يُظَنَّ أن في السند انقلاباً أو خطأً ، لأن الأصل أن يروي الابن عن أبيه ، وهذا النوع مع النوع الذي قبله يدل على تواضع العلماء ، وأخْذِهِمُ العلم من أي شخص ، وإن كان دونهم في القَدْر والسن .

**٤ - أشهر المصنفات فيه :**

كتاب " رواية الآباء عن الأبناء " للخطيب البغدادي .

## -٤- گێڕانەوەی باوكان لە كوڕانەوە

## (رواية الآباء عن الأبناء)

**١ .پێناسەكەی:**

ئەوەیە كە لەسەنەدی فەرموودەكەدا باوكێك هەبێت كە فەرموودەكەی لە كوڕەكەیەوە گێڕابێتەوە.

**٢.نمونەکەی:**

وەك ئەو فەرمودەیەی کە (عباس بن عبدالمطلب) لە (الفضل)ی کوڕییەوە دەیگێڕێتەوە، کە پێغەمبەر (ﷺ) لە (مزدلفة) دوو نوێژی کۆکردۆتەوە.

**٣.لە سوودەکانی:**

تا گومان نەبرێت کە لە سەنەدەکەدا گۆڕانکاری یان هەڵە هەیە، چونکە ئەصڵ وایە کە کوڕ لە باوکەوە شت ڕیوایەت بکات، وە ئەم جۆرەو ئەو جۆرەی پێشتری بەڵگەیە لەسەر (تواضع)ی زانایان، و زانست وەرگرتنیان لەهەر کەسێکەوە بێت، هەرچەندە لەپلەو ڕێزو تەمەنیشدا ئەوان لێیان کەمتر بن.

**٤.بەناو بانگترین کتێب تیایدا:**

کتێبی (روایة ألآباء عن ألأبناء)ی دانراوی (خطیب البغدادي).

## - ٥ - رواية الأبناء عن الآباء

**١– تعريفه:**

أن يوجد في سند الحديث ابْنٌ يروي الحديث عن أبيه فقط ، أو عن أبيه عن جده .

**٢– أهمه:**

وأهم هذا النوع ما لم يُسَمَّ فيه الأبُ أو الجَدُ ، لأنه يحتاج إلى البحث لمعرفة اسمه .

**٣– أنواعه:**

هو نوعان.

أ) رواية الراوي عن أبيه فحسب ( أي بدون الرواية عن الجَد ) وهو كثير.

مثاله : رواية أبي العُشَرَاء عن أبيه [٣٥٣]

ب) رواية الراوي عن أبيه عن جده، أو عن أبيه عن جده فما فوقه. مثاله : رواية عَمرو بن شُعَيْب عن أبيه عن جده .[٣٥٤]

**٤- من فوائده:**

أ) البحث لمعرفة اسم الأب أو الجَد إذا لم يُصَرَّحْ باسمه.

ب) بيان المراد من الجَدَّ ، هل هو جَدَّ الابن أو جد الأب .

**٥- أشهر المصنفات فيه :**

أ) رواية الأبناء عن آبائهم ، لأبي نصر عبيد الله بن سعيد الوائلي .

ب) جزء من روي عن أبيه عن جده ، لابن أبي خَيْثَمَةَ .

ج) كتاب الوَشْيُ المعلم في من روي عن أبيه عن جده عن النبي صلي الله عليه وسلم للحافظ العلائي .

---

[٣٥٣] اختلف في اسمه واسم أبيه على أقوال ، أشهرها أنه اسامه بن مالك .

[٣٥٤] عمرو هذا نسبة هكذا " عمرو بن شعيب بن محمد بن عبدالله بن عمرو بن العاصي " فجده عمرو هو محمد ، لكن العلماء وجدوا من التتبع والاستقراء أن الضمير في " جده " يعود على شعيب فيكون المراد في "جده" عبدالله بن عمرو الصحابي المشهور .

## ٥- گێڕانەوەی کوڕان لە باوکان

## رواية الأبناء عن الآباء

**١.پێناسەکەی:**

ئەوەیە کە لە سەنەدی فەرمودەکەدا کوڕێك هەبێت، کە فەرمودەکەی تەنها لە باوکییەوە گێڕابێتەوە، یاخود لە باوکیەوە و ئەویش لە باپیریەوە.

**٢.گرنگترینیان:**

گرنگ ترینی ئەم جۆرەیش ئەوەیە کە ناوی باوك یان باپیرەکە نەهێنرابێت، چونکە ئەمە پێویستی بە لێکۆڵینەوە هەیە بۆ زانینی ناوەکەی.

**٣.جۆرەکانی: دوو جۆرە:**

أ.گێڕانەوەی ڕاوییەکە لەتەنها باوکییەوە، (واتە: بەبێ گێڕانەوەی لە باپیرییەوە) کە ئەمە یان زۆرە.

وەك: گێڕانەوەی (أبي العشراء) لە باوکیەوە[٣٥٥].

ب.گێڕانەوەی ڕاوییەکە لەباوکیەوەو لە باپیریەوە، یاخود لە باوكو باپیری بەرەو ژوورتریش.

وەك: ڕیوایەت کردنی (عمرو بن شعيب) لە باوكو باپیریەوە[٣٥٦].

---

(٣٥٥) کە لەناوەکەیدا و ناوی باوکیدا ڕاجیایی هەیە، بەچەند گوتەیەك، کە دیارترینیان ئەوەیە کە ناوی (أسامة بن مالك)ە.

(٣٥٦) (عمرو) نەسەبەکەی بەم جۆرەیە: (عمرو بن شعيب بن محمد بن عبدالله بن عمرو بن العاص)کە باپیری (عمرو) موحەممەدە، بەڵام زانایان بە هۆی بەدواداچوون بۆیان جێگیر بووە، کە ضە

**٤.لە سوودەکانی:**

أ.لێکۆڵینەوەیە بۆ زانینی ناوی باوکو باپیر، ئەگەر ناویان ڕاستەوخۆ نەدرکێنرابوو.

ب.ڕونکردنەوەی مەبەست لەو باپیرە، کە ئایا باپیری کوڕەکە یە یان باپیری باوکیەتی.

**٥.بەناوبانگترین دانراو تیایدا:**

أ.(رواية الأبناء عن آبائهم)ی (أبو نصر بن عبدالله بن سعيد الوائلي).

ب.(جزء من روى عن ابيه عن جده)ی، دانراوی (أبو خيثمة).

جـ.کتێبی (الوشي المعلّم في من روى عن أبيه عن جده عن النبي (ﷺ))ی، دانراوی (الحافظ العلائي).

## ـ ٦ ـ المُدَبَّج ورواية الأقْران

**١– تعريف الأقْران:**

أ) لغة: الأقران جمع " قَرِين " بمعنى المَصَاحِب، كما في القاموس [٣٥٧]

ب) اصطلاحاً: المتقاربون في السن والإسناد[٣٥٨].

**٢– تعريف رواية الأقران:**

أن يروي أحد القرينين عن الآخر .

---

میر لە (جَدِّهِ)دا، بۆ (شعیب) دەگەڕێتەوە، جا بۆیە مەبەست لە (جَدِّهِ)، (عبدالله بن عمرو)یە، کە صەحابیەکی ناسراوە.

[٣٥٧] جـ٤ ـ ص ٢٦٠ .

[٣٥٨] التقارب في الإسناد أن يكونوا قد أخذوا عن شيوخ من طبقة واحدة .

مثل : رواية سليمان التَّيْمي عن مِسعَر بن كِدَام ، فهما قرينان ، لكن لا نعلم لِمسْعَرٍ رواية عن التَّيْمي .

**٣- تعريف المُدَبَّج:**

أ) لغة: اسم مفعول من " التَّدْبِيْج " بمعنى التزيين والتدبيج مشتق من دِيْباجَتِي الوجه أي الخدين ، وكأن المُدَبَّج سُمي بذلك لتساوي الراوي والمروي عنه ، كما يتساوي الخُدّان .

ب) اصطلاحاً: أن يروي القرينان كل واحد منهما عن الآخر.

**٤- أمثلة المدبج:**

أ ) في الصحابة: في رواية عائشة عن أبي هريرة، ورواية أبي هريرة عن عائشة.

ب) في التابعين: رواية الزهري عن عمر بن عبدالعزيز ورواية عمر بن عبدالعزيز عن الزهري.

ج) في أتباع التابعين: رواية مالك عن الأوزاعي ، ورواية الأوزاعي عن مالك .

**٥- من فوائده :**

أ) ألا يظن الزيادة في الإسناد . [٣٥٩]

ب) ألا يظن إبدال " عن " بـ " الواو ". [٣٦٠]

[٣٥٩] لأن الأصل أن يروي التلميذ عن شيخه ، فإذا روي عن قرينه ربما ظن من لم يدرس هذا النوع أن ذكر القرين المروي عنه زيادة من الناسخ .

**٦- أشهر المصنفات فيه :**

أ) المدبج ، للدارقطني .

ب) رواية الأقران ، لأبي الشيخ الأصبهاني .

## -٦- گێڕانەوەی (المُدَبَّج و رواية الأقران)

**١.پێناسەی: (الأقران):**

**أ.لەڕووی زمانەوە:** (الأقران) كۆی (قَرِين)ە، بەمانای (هاوەڵ — مُصاحب)ەیە، هەروەك لە (قاموس)دا وایە[٣٦١].

**ب.لەڕووی زاراوەوە:** ئەو كەسانەن كە لەتەمەن و لەنێو سەنەدیشدا لێك نزیكن[٣٦٢].

**٢.پێناسەی گێڕانەوەی (الأقران):**

ئەوەیە كە یەكێك لە و دوو برادەرە لەوی تریانەوە شت بگێڕێتەوە وەك: گێڕانەوەی (سليمان التَّيْمي) لە (مِسْعَر بن كِدَام)ەوە، كە ئەم دوانە برادەری یەكترن، بەڵام ئەوە هەیە نازانین كە (مسعر) گێڕانەوەی لە (التَّيْمي)یەوە هەبێت.

---

[٣٦٠] أي ألا يتوهم السامع أو القارئ لهذا الإسناد أن أصل الرواية : حدثنا فلان و فلان ، فأخطأ فقال ، حدثنا فلان عن فلان .

([٣٦١]) ج٤/ ص٢٦٠.

([٣٦٢]) نزیكیی لە سەنەددا، ئەوەیە كە دەبێت لە چەند مامۆستایەكەوە شتیان وەرگرتبێ لەیەك پلە (طبقة)دا.

**٣.پێناسەی (الْمُدَبَّجْ):**

**أ.لەڕووی زمانەوە:**ئیسمی مەفعولە و لە (التدبیج)ەوە هاتووە، بەمانای (التزيين – ڕێك بوون)ەوە، (التدبیج) لە (دیباجَتَيْ الوَجْه)ەوە وەرگیراوە، بەمانای دوو كولـمەكەی دەمووچاو، وە بۆیە ناونراوەتە (مُدبج) بەهۆی یەكسانیو هاوڕێكی گێڕەرەوە(الرَاوي)و لـێ گێڕدراوە (المروي عنه)، هەروەك چۆن دوو كولـمەكە ڕێكن، ئەمانیش ڕێك بونەتەوە.

**ب.لەڕووی زاراوەوە:**ئەوەیە كە دوو برادەر هەریەكێكیان لەوی تریانەوە شت بگێڕێتەوە.

**٤.نمونەی (المدبج):**

**أ.لەهاوەڵاندا:** وەك گێڕانەوەی (عائشة) لە (ابو هريرة)و گێڕانەوەی (أبو هريرة) لە (عائشة).

**ب.لە (تابعین)دا:** وەك گێڕانەوەی (الزهري) لە (عمر بن عبدالعزيز)و گێڕانەوەی (عمر بن عبدالعزيز) لە (الزهري)یەوە.

**جـ.لەوانەی دوای تابعين دا (أتباع التابعين):** وەك گێڕانەوەی (مالك) لە (الأوزاعي) و گێڕانەوەی (الأوزاعي) لە (مالك).

**٥.لە سوودەكانی:**

أ.تاوا گومان نەبرێت كە لەسەنەدەكەدا زیادە هەبێت[٣٦٣].

ب.تا گومان نەبرێت، كە (عن) ەكە گۆڕدراوە بە (واو)[٣٦٤].

---

(٣٦٣) چونكە ئەصڵ وایە كە قوتابی لە مامۆستاكەیەوە شت بگێڕێتەوە، جا كە لـە برادەرێكیـەوە شتی گێڕایەوە، ئەگەر كەسێك لێكۆڵینەوەی لەم بابەتە نەكردبێت وا گومان دەبات، كە ناوهێنانی ئـەو برادەرەی كە شتە كەی لـێ گێڕاوەتەوە زیادەیەو سڕاوەیە.

(٣٦٤) واتە: تا گوێگر یان خوێنەری ئەو سەنەدەوا گومان نەبات، كە ئەصڵی ڕیوایەتەكە، (حـدثنا فلان (و) فلان)ە، بكەوێتە هەڵەوە و بیكات بە (حدثنا فلان (عن) فلان)!

٦.بەناوبانگترین دانراو تیایدا:

أ.(المدبج) دانراوی (الدار قطني).

ب.(رواية الأقران)ی (ابو الشيخ ألأصبهاني).

## - ٧ - السَّابق واللاحق

١- تعريفه:

أ) لغة: السابق اسم فاعل من " السَّبْق " بمعني المتقدم، واللاحق اسم فاعل من " اللُّحَاق " بمعنى المتأخر، والمراد بذلك الراوي المتقدم موتاً، والراوي المتأخر موتاً.

ب) اصطلاحاً: أن يشترك في الرواية عن شيخ اثنان تَبَاعد ما بين وفاتيهما.

٢- مثاله:

أ) محمد بن إسحق السراج [٣٦٥]، اشترك في الرواية عنه البخاري والخَفاف ، وبين وفاتيهما مائة وسبع وثلاثون سنة أو أكثر [٣٦٦]

ب) الإمام مالك : اشترك في الرواية عنه الزهري وأحمد بن إسماعيل السَّهْمِي ، وبين وفاتيهما مائة وخمس وثلاثون سنة ، لأن الزهري توفي سنة ١٢٤ وتوفي السهمي سنة ٢٥٩. وتوضيح ذلك أن الزهري أكبر سناً من مالك .

لأنه من التابعين ،ومالك من أتباع التابعين ، فرواية الزهري عن مالك تعتبر من باب رواية الأكابر عن الأصاغر كما مر ، على حين أن السهمي أصغر سناً

[٣٦٥] ولد السراج سنة ٢١٦هـ وتوفي سنة ٣١٣وعاش ٩٧ سنة .

[٣٦٦] توفي البخاري سنة ٢٥٦هـ ، وتوفي أبو الحسين احمد بن محمد الخفاف النيسابوري سنة ٣٩٣هـ وقيل أربع وقيل خمس وتسعون وثلاثمائة .

من مالك ، هذا بالإضافة إلى أن السهمي عُمِّر طويلا ، إذ بلغ عمره نحو مائة سنة ، لذلك كان هذا الفرق الكبير بين وفاته ووفاة الزهري .

وبتعبير أوضح فان الراوي السابق يكون شيخاً لهذا المروي عنه، والراوي اللاحق يكون تلميذاً له، ويعيش هذا التلميذ طويلاً.

**٣- من فوائده :**

أ) تقرير حلاوة علو الإسناد في القلوب .

ت) ألا يظن انقطاع سند اللاحق .

**٤- أشهر المصنفات فيه :**

كتاب السابق واللاحق، للخطيب البغدادي.

## -٧- باسی (السابق و اللاحق)

**١ .پێناسەکەی:**

**أ.لەڕووی زمانەوە:** (السابق) ئیسمی فاعیلەو لە (السَبق)ەوە هاتووە، بەمانای (پێشکەوتوو- لە پێش - المتقدم)، وە (اللاحق)یش ئیسمی فاعیلەو لە (اللِّحاق)ەوە هاتووە، بەمانای (دواکەوتوو - المتأخر - پاش خراو)، وە مەبەست لەمە گێڕەرەوەیەکە کە زوو مردبێت و گێڕەرەوەیەکی ترە کە دواترو لەپاشتر مردبێت.

**ب.لەڕووی زاراوەوە:** ئەوەیە کە لە گێڕانەوەدا لە مامۆستایەکەوە دوو کەس بەشداری بکەن، کەنێوانی مردنیان زۆر بێت.

**٢.نموونەکەی:**

أ.(محمد بن إسحاق السراج)[٣٦٧]، کە (البخاری) و (الخفاف) بەشدارییان کردووە، لە گێڕانەوەدا لێیەوە، کە ماوەی مردنی نێوانیشیان (١٣٧) ساڵ یان زیاتریشە[٣٦٨].

ب.(ألإمام مالك): کە (الزهری) و (أحمد بن إسماعیل السَّهمی) بەشدارییان کردووە لە گێڕانەوەدا لێیەوە، کە ماوەی مردنی نێوانیشیان (١٣٥) ساڵە، چونکە (الزهری) لە ساڵی (١٢٤ هـ) وەفاتی کردووەو (السهمی) لە ساڵی (٢٥٩هـ) وەفاتی کردووە.

ڕوونکردنەوەی ئەمەش ئەوەیە کە (الزهری) زۆر بە تەمەنترە، لە (مالك) چونکە لە شوێن کەوتوان (تابعین)ەو (مالك) لە شوێن کەوتەی شوێنکەوتوان (أتباع التابعین)ە، جا گێڕانەوەی (الزهری) لە (مالك)، لە بابی گێڕانەوەی گەورە لە بچووك حیسابە، وەك ڕابورد لە کاتێکا کە (السهمی) تەمەنی زۆر کەمترە لە (مالك) سەرەڕای ئەوەش کە (السهمی) زۆریش ژیاوە کە تەمەنەکەی نزیکەی سەد ساڵ گەیشتووە، بۆیەش ئەو جیاوازییە زۆرەی هەیە لەنێوان وەفاتی ئەم و وەفاتی (الزهری)دا.

بەدەستەواژەیەکی ڕوونتر، ئەو گێڕەرەوە لەپێش ترە (السابق) دەبێتە مامۆستا بۆ ئەو لێوەگێردراوە (المروي عنه)ەوە ئەو گێڕەرەوە لەدواترە (اللاحق) دەبێتە قوتابی ئەو، وە ئەو قوتابی یە بۆماوەیەکی زۆر دەژێت.

---

(٣٦٧) (السراج) لە ساڵی (٢١٦ هـ) لەدایك بووەو لەساڵی (٣١٣ هـ) کۆچی دوایی کردووە، کەماوەی (٩٧) ساڵ ژیاوە.

(٣٦٨) (إمام بخاری) لە ساڵی (٢٥٦هـ) وەفاتی کردووە، وە (الحسین أحمد بن محمد الخفاف النیسابوری) لە ساڵی (٣٩٣هـ) وەفاتی کردووە، وە گوتراویشە لە (٣٩٤ هـ) دا وەفاتی کردووە، وەهەروەها گوتراویشە کە لە (٣٩٥هـ)یشدا وەفاتی کردووە.

**٣.لە سوودەکانی:**

أ.بەڵگەیە لەسەر شیرینی سەنەدی باڵاو نزیك لە دڵدا.

ب.تاوا گومان نەبرێت کە ئەو سەنەدە لە پاشترە پچڕاوە.

**٤.بەناو بانگ ترین کتێب تیایدا:**

کتێبی (السابق و اللاحق)ی دانراوی (الخطیب البغدادي).

# الفصل الثاني

## معرفة الرواة

١- معرفة الصحابة.

٢- معرفة التابعين.

٣- معرفة الأخوة والأخوات .

٤- المتفق والمفترق .

٥- المؤتلف والمختلف.

٦- المتشابه.

٧- المهمل.

٨- معرفة المبهمات.

٩- معرفة الوُحدان .

١٠- معرفة من ذكر بأسماء أو صفات مختلفة.

١١- معرفة المفردات من الأسماء والكنى والألقاب .

١٢- معرفة أسماء من اشتهروا بكناهم .

١٣- معرفة الألقاب.

١٤- معرفة المنسوبين إلى غير آبائهم .

١٥- معرفة النسب التي علي خلاف ظاهرها.

١٦- معرفة تواريخ الرواة.

١٧- معرفة من خلط من الثقات .

١٨- معرفة طبقات العلماء والرواة.

١٩- معرفة الموالي من الرواة والعلماء .

٢٠- معرفة الثقات والضعفاء من الرواة .

٢١- معرفة أوطان الرواة وبلدانهم.

## بەشی دووەم

**ناسینی گێڕەرەوەكان (معرفة الرواة)**

١.ناسینی هاوەڵان.(معرفة الصحابة).

٢.ناسینی شوێن كەوتوان. (معرفة التابعين).

٣.ناسینی براو خوشكەكان. (معرفة الأخوة و الأخوات).

٤.وەك یەك و جودا.. (المتفق و المفترق).

٥.باسی (المؤتلف و المختلف).

٦.باسی (المتشابه).

٧.باسی (المهمل).

٨.ناسینی شتە نادیارەكان (المبهمات).

٩.ناسینی (الوحدان).

١٠.ناسینی ئەوانەی كە بەناوو صیفاتی جیاواز ناسراون.

١١.ناسینی موفرەداتی ناوو كونیەو ناز ناو (لقب)ەكان.

١٢.ناسینی ناوی ئەوانەی كە بە كونیەكانیان ناسراون.

١٣.ناسینی ناز ناو (ألقاب)ەكان.

١٤.ناسینی ئەوانەی كە بۆلای غەیری باوكیان نیسبەت دراون.

١٥.ناسینی ئەو جۆرە نیسبەت لێدانەی كە خۆی پێچەوانەی ئەو نیسبەتەیە.

١٦.ناسینی مێژووی گێڕەرەوەكان (معرفة تواريخ الرواة).

١٧.ناسینی ئەو كەسە بڕوا پێكراوانەی زانایانو گێڕەرەوەكان كە شت تێكەڵ دەكەن.

١٨.ناسینی یاخود زانینی چینەكانی زانایانو گێڕەرەوەكان.

١٩.ناسینی ئەو گێڕەرەوە، و زانایانەی كە كۆیلە بوون.

٢٠.ناسینی گێڕەرەوە بڕوا پێكراوو لاوازەكان.

٢١.ناسینی نیشتمان و شاری گێڕەرەوەكان.

## معرفة الصحابة

- ١ -

### ١ – تعريف الصحابي:

أ ) لغة: الصحابة لغة مصدر بمعني" الصحبة " ومنه " الصحابي "و" الصاحب " ويجمع علي أصحاب وصَحْب ، وكثر استعمال " الصحابة " بمعني "الأصحاب" .

ب) اصطلاحاً: من لقي النبي صلي الله عليه وسلم مسلماً ومات علي الإسلام ، ولو تخللت ذلك ردة علي الأصح .

### ٢– أهميته وفائدته:

معرفة الصحابة علم كبير مهم عظيم الفائدة، ومن فوائده معرفة المتصل من المرسل.

### ٣– بم تعرف صحبة الصحابي ؟

تعرف الصحبة بأحد أمور خمسة وهي:

أ ) التواتر: كأبي بكر الصديق وعمر بن الخطاب، وبقية العشرة المبشرين بالجنية.

ب ) الشهرة : كضِمَام بن ثَعْلَبة ، وعُكاشة بن مِحْصَن .

ج ) إخبار صحابي.

د )إخبار ثقة من التابعين .

هـ ) إخبارُه عن نفسه إن كان عَدْلا، وكانت دعواه مُمْكِنة[٣٦٩].

---

(٣٦٩) و ذلك كأن يدعى الصحبة قبل مائة سنة من بعد وفاته صلى الله عليه وسلم، أما إذا ادعاها في زمن متأخر فلا يقبل خبره مثل " رتن الهندي" فإنه ادعى الصحبة بعد الستمائة للهجرة، وهو في الحقيقة شيخ دجال كما قال عنه الذهبي في الميزان جـ ٢ – ص ٤٥.

**٤ – تعديل جميع الصحابة:**

والصحابة رضي الله عنهم كلهم عدول ، سواء من لابس الفتن منهم أولا ، وهذا بإجماع من يعتد به ، ومعني عدالتهم : أي تجنبهم عن تعمد الكذب في الرواية والانحراف فيها ، بارتكاب ما يوجب عدم قبولها ، فينتج عن ذلك قبول جميع رواياتهم من غير تكليف البحث عن عدالتهم ، ومن لابس الفتن منهم يحمل أمره علي الاجتهاد المأجور فيه لكل منهم تحسيناً للظن بهم . لأنهم حملة الشريعة وخير القرون .

**٥ – أكثرهم حديثاً :**

ستة من المكثرين، وهم علي التوالي:

أ ) أبو هريرة : روي / ٥٣٧٤ / حديثاً ، وروي عنه أكثر من ثلاثمائة رجل.

ب) ابن عمر : روي / ٢٦٣٠ / حديثاً .

ح) أنس بن مالك: روي / ٢٢٨٦ / حديثاً.

د) عائشة أم المؤمنين: روت / ٢٢١٠ / أحاديث.

ه) ابن عباس : روي / ١٦٦٠ / حديثاً .

و) جابر عبدالله : روي / ١٥٤٠ / حديثاً .

**٦ – أكثرهم فتيا :**

وأكثرهم فتيا تروي هو ابن عباس ، ثم كبار علماء الصحابة ، وهم ستة كما قال مسروق : " انتهي علم الصحابة إلى ستة : عمر وعلي وأبي بن كعب وزيد بن ثابت وأبي الدرداء وابن مسعود ثم انتهي علم الستة إلى علي وعبد الله بن مسعود".

٧ – من هم العبادلة ؟

المراد بالعبادلة بالأصل من اسمهم " عبدالله " من الصحابة ، ويبلغ عددهم نحو ثلاثمائة صحابي ، لكن المراد بهم هنا أربعة من الصحابة كل منهم اسمه عبدالله ، وهم :

أ ) عبدالله بن عمر .

ب) عبدالله بن عباس .

ج) عبدالله بن الزبير .

د) عبدالله بن عمرو بن العاص .

والميزة لهؤلاء أنهم من علماء الصحابة الذين تأخرت وفاتهم حتى احتيج إلى عملهم ، فكانت لهم المزية والشهرة ، فإذا اجتمعوا علي شيء من الفتوى قيل هذا قول العبادلة .

٨ – عدد الصحابة :

ليس هناك إحصاء دقيق لعدد الصحابة ، لكن هناك أقوال لأهل العلم يستفاد منها أنهم يزيدون علي مائة ألف صحابي ، وأشهر هذه الأقوال أبي زرعة الرازي : " قبض رسول الله صلي الله عليه وسلم عن مائة ألف وأربعة عشر ألفاً من الصحابة ممن روي عنه وسمع منه "[٣٧٠].

٩ – عدد طبقاتهم :

اختلف في عدد طبقاتهم، فمنهم من جعلها باعتبار السبق إلى الإسلام، أو الهجرة أو شهود المشاهد الفاضلة، ومنهم من قسمهم باعتبار آخر، فكل قسمهم حسب اجتهاده.

---

([٣٧٠]) التقريب مع التدريب جـ ٢ - ٢٢٠

أ ) فقسمهم ابن سعد خمس طبقات .

ب ) وقسمهم الحاكم اثنتي عشرة طبقة.

**١٠ – أفضلهم :**

أفضلهم علي الإطلاق أبو بكر الصديق ثم عمر رضي الله عنهما بإجماع أهل السنة، ثم عثمان ثم علي، علي قول جمهور أهل السنة، ثم تمام العشرة، ثم أهل بدر، ثم أهل أحد، ثم أهل بيعة الرضوان "

**١١ – أولهم إسلاماً :**

أ) من الرجال الأحرار: أبو بكر الصديق رضي الله عنه .

ب ) من الصبيان: علي بن أبي طالب رضي الله عنه.

ج ) من النساء : خديجة أم المؤمنين رضي الله عنها .

د ) من الموالي: زيد بن حارثة رضي الله عنه.

هـ) من العبيد: بلال بن رباح رضي الله عنه.

**١٢ – آخرهم موتاً :**

أبو الطفيل عامر بن واثلة الليثي ، مات سنة مائة بمكة المكرمة ، وقيل أكثر من ذلك ، ثم آخرهم موتاً قبله أنس بن مالك توفي سنة ثلاث وتسعين بالبصرة.

١٣ – أشهر المصنفات فيه :

أ ) الإصابة في تمييز الصحابة ، لابن حجر العسقلاني .

ب) أسد الغابة في معرفة الصحابة ، لعلي بن محمد الجزري المشهور بابن الأثير.

ح ) الاستيعاب في أسماء الأصحاب ، لابن عبد البر .

## -١- ناسینی هاوەڵان ( معرفة الصحابة )

### ١.پێناسەی هاوەڵ (الصحابي):

**أ.لەڕووی زمانەوە:(الصحابة)** چاو گەو بەمانای (الصُّحبة — هاوەڵێتی) دێت، وە هەر لەمەشەوە، (الصحابي و الصاحب) وەرگیراوە، کە جەمعەکەی دەبێتە (أصحاب)و (صحب) جا بەکارهێنانی (الصحابة) بەمانای (أصحاب) زۆر بووە.

**ب.لەڕووی زاراوەوە:**ئەو کەسەیە کە گەیشتبێت بە پێغەمبەر (ﷺ) بە مسوڵمانێتی و هەر لەسەر مسوڵمانێتیش مردبێت، هەرچەندە هەڵگەڕانەوە (الردة)یش بەسەریدا هاتبێ، ئەمە لەسەر گوتەی زۆر صەحیحی زانایان.

### ٢.گرنگییەکەیو سودەکانی:

ناسینی هاوەڵان رضي الله عنهم زانستێکی گەورەو گرنگو زۆر بەسوودە، وە لەو سوودانەیش ناسینی (پەیوەست — المتصل)ەکانە، لەنێو (مرسل)ەکاندا.

### ٣.بە چیدا هاوەڵێتی ئەو هاوەڵانە رضي الله عنهم بۆ پێغەمبەر (ﷺ) دەزانرێت؟

ئەو هاوەڵێتییە بە یەکێك لەم پێنج شتە دەزانرێت، کە ئەمانەن:

**أ.**بەزۆر گێڕانەوە (التواتر): وەك (أبو بكر الصديق) و (عمر بن الخطاب) و دەکەسەموژدە پێدراوەکەی تر بە بەهەشت.

**ب.**(بەناوبانگ دەرکردن)، وەك : (ضمام بن ثعلبة) و (عكاشة بن محصن).

**جـ.**بەهەواڵدانی هاوەڵان رضي الله عنهم.

**د.**بەهەواڵدانی کەسێکی بڕوا پێکراوی شوێنکەوتوان (التابعين).

هـ.بە هەواڵدانی خودی ئەو کەسە ئەگەر (عادل) بوو، وە ئەو بانگەشە کردنەی شتێکی (ممكن) بوو[٣٧١].

**٤.بەڕاستاڵ دانان (تعديل)ی سەرجەم هاوەڵان ﷺ:**

هاوەڵان ﷺ هەموویان عادلن، ئیتر چونیەکە ئەوانەیان بێت کە تووشی فیتنەی شەڕ بوبن یان نا..، ئەمەش بە کۆڕا(إجماع) ی ئەوانەی کە قسەیان بەبەڵگە دەکرێت و مانای (عدل)ی هاوەڵان ﷺ،واتە: دوور بونیان لەوەی کە بەتایبەتی درۆ بکەن لەگێڕانەوەدا، و لادان و لاڕێیی تێدا بکەن، بەکردنی کارگەلێك کە ببێتە هۆی ئەوەی کە ئەو گێڕانەوەیەیان لێ وە رنەگیرێت، جا لەسەر ئەنجامی ئەمەدا وەرگرتنی سەرجەم گێڕانەوەکانیان بەبێ لێکۆڵینەوەو خۆماندوو کردن دەربارەی بە(عادل) بونیان، بۆ ئەوانەیان کە تێکەڵ بە فیتنە بوون، ئەوە بە (إجتهاد) بۆیان لێك دەدرێتەوەو لەسەریشی بەپاداشتن، ئەمەش وەك چاك گومان بردن (حسن الظن)ێك پێیان، چونکە ئەم پێرە هەڵگری شەریعەت بوون و لە چاکترینی سەدەکاندا بوون.

**٥.ئەوانەیان کە زۆرترین فەرمودەیان هەیە:**

خاوەنی گێڕانەوە زۆرەکان (المُكْثِرين) شەش کەسن، یەك لەدوای یەك ئەمانەن:

---

(٣٧١) ئەمەش وەك ئەوەی کە بانگەشەی هاوەڵێتی (الصحبة) بکات، پێش سەد ساڵ لە وەفاتی پێغەمبەر(ﷺ) ، بەڵام ئەگەر بانگەشەی ئەمەی کرد بۆ زەمەنێکی دواتر ئەوە ئەو قسەیەی وەرناگیرێ، وەك، (رتن الهندي) کە ئەم کابرایە بانگەشەی هاوەڵێتی کرد دوای شەش سەد ساڵ لە هیجرەت کە ئەم کابرایە لە ڕاستیدا کابرایەکی (دجال) بوو، هەروەك (إمام الذهبي) وا دەربارەی دەفەرموێت لە (الميزان)دا ج٢/ ص٤٥.

أ.(ابو هريرة) كه (٥٣٧٤) فەرمودەی گێڕاوەتەوە، وزیاتر لە سێ سەد کەس شتیان لێ گێڕاوەتەوە.

ب.(إبن عمر) كه (٢٦٣٠) فەرمودەی گێڕاوەتەوە.

جـ.(أنس بن مالك) كه (٢٢٨٦) فەرمودەی گێڕاوەتەوە.

د.(عائشة)ی دایکی باوەڕداران كه (٢٢١٠) فەرمودەی گێڕاوەتەوە.

هـ.(إبن عباس) كه (١٦٦٠) فەرمودەی گێڕاوەتەوە.

و.(جابر بن عبدالله) كه (١٥٤٠) فەرمودەی گێڕاوەتەوە.

### ٦.ئەوەیان کە زۆرترین فەتوای هەبووە:

وە ئەوەیان کە زۆرترین فەتوای لێ گێڕدراوەتەوە (إبن عباس)ە، و پاشان گەورە زاناکانی تری هاوەڵانﷺ كه هەر شەش کەسن، وەك (مسروق) دەڵێت: (زانستی هاوەڵانﷺ لە شەش کەسدا کۆتایی هاتووەو کۆبوەتەوە)، (عمر) و (علی) و (أبی بن كعب) و (زید بن ثابت) و (أبي درداء) و (إبن مسعود) و پاشانیش زانستی ئەم شەش کەسەیش لەلای (علی) و (عبدالله بن مسعود) کۆبۆتەوە.

### ٧.عەبدوڵلاکان کێن؟

مەبەست لە (العبادلة) لە ئەصڵدا، (عبدالله) ناوەکانی نێو هاوەڵاننﷺ، کە ژمارەیان دەگاتە نزیکەی سێ سەد هاوەڵ بەلام مەبەست پێیان لێرەدا چوار کەسە لە هاوەڵان کە هەموویان ناویان (عبدالله)یە، و ئەمانەن:

أ.عبدالله بن عمر.

ب.عبدالله بن عباس.

جـ.عبدالله بن الزبير.

د.عبدالله بن عمرو بن العاص.

وه جیاکەرەوه (المّيزة)ەی ئەمانە ئەوەیە کە لە زانایانی صەحابی بوون، ئەوانەی کە مردنیان دوا کەوتووه، تا کاتێك کە خەڵکی پێویستیان کەوتووه بە زانستەکانیان ئەم چوار کەسە ئەو جیاکەرەوه و ناوبانگەیان هەیە، جا کە کۆبونەوه لەسەر شتێك لەسەر فەتوایەك دەگوترێ ئەوە گوتەو فەرمایشتی (عبادلة)ەیە.

## ٨.ژمارەی هاوەڵانﷺ:

سەر ژمێرییەکی ورد نییە بۆ ژمارەی هاوەڵانﷺ، بەڵام ئەوە هەیە فەرمایشت گەلێکی ئەهلی عیلم هەن، کە لێیانەوه دەفامرێتەوه، کە ژمارەیان لەسەد هەزار (١٠٠٠٠٠) صەحابی زیاتر بوون.

کە دیارترینی ئەم گوتانە گوتەی (أبي زُرعة الرازي)یە، کە دەفەرموێت: (پێغەمبەر (ﷺ) گیانی کێشرا لەناو سەدو چواردە هەزار هاوەڵدا کە شتیان لێ دەگێڕایەوەو شتیان لێوەدەبیست)[٣٧٢].

## ٩.ژمارەی چینەکان (طبقات)ی هاوەڵانﷺ:

جیاوازی هەیە، لە ژمارەی چینەکاندا، هەندێکیان لە زانایان بە گوێرەی زوو موسڵمان بونیان یاخود زوو کۆچ کردنیان یاخود بینینی ڕوداوه گرنگەکان، ڕیزبەندی چینەکانیان کردووه.

هەندێکیان بەگوێرەی شتی تر ڕیزبەندی چینەکانیان کردووه، هەریەکەو بەگوێرەی ئیجتیهادی خۆیان دابەشیان کردوون:

أ.(إبن سعد) بۆ پێنج چین دابەشی کردوون.

ب.(حاکم) بۆ دوانزە چین دابەشی کردوون.

---

(٣٧٢) التقريب مع التدريب، ج٢/ ص٢٢٠.

**١٠.بەرێزترینی هاوەڵان:**

بەشێوەیەکی گشتی بەرێزترینیان (أبوبکر الصدیق)ە، پاشان (إمام عمر)ە، (رضي الله عنهما) ئەمە بە کۆڕای ئەهلی سوننەت، پاشان (إمام عثمان) و پاشان (إمام علی) ئەمەش لەسەر گوتەی جەماوەری ئەهلی سوننەت، پاشان تەواوی دەکەسەکە، پاشان ئەوانەی غەزوەی (بدر) و پاشان ئەوانەی غەزوەی (أحد) و پاشان کۆمەڵـی (بیعة الرضوان)ن.

**١١.ئەوەیان کە یەکەم کەس مسوڵمان بووە:**

أ.لەنێو پیاوە ئازادەکاندا، (أبوبکر الصدیق)ـە.

ب.لەنێو منداڵاندا: (علي بن ابي طالب)ـە.

جـ.لەنێو ئافرەتاندا: (خدیجة)ی دایکی بڕواداران.

د.لەنێو گزیرەکاندا (زید بن ثابت)ـە.

هـ.لەنێو کۆیلەکاندا: (بلال بن رباح)ـە.

**١٢.ئەو هاوەڵەی کە کۆتا کەسی هاوەڵان بوو و وەفاتی کردبێ:**

(أبو الطفیل عامر بن واثلة اللیثي)یە، کە لە ساڵـی (١٠٠) سەد لە مەککەی موکەڕەمە وەفاتی فەرمووە، وە گووتراویشە لە سەد بەدواوە بووە، و پاشان ئەوە کە لە پێش ئەمەوە بووە لە مردندا (انس بن مالك)ە، کە لە ساڵـی (٩٣) نەوەدو سێ لە (بەصرە) وەفاتی فەرمووە.

**١٣.بەناو بانگترینی کتێب لەم بارەیەوە:**

أ.(ألأصابة في تمییز الصحابة) ی (إبن حجر العسقلاني).

ب.(أسد الغابة في معرفة الصحابة)ی (علي بن محمد الجَزَري) کە بە (ابن ألأثیر) ناسراوە.

جـ.(ألأستیعاب في أسماء ألأصحاب) دانراوی (إبن عبدالبر).

## - ٢ - معرفة التابعين

**١ – تعريف التابعي:**

أ) لغة: التابعون جمع تابعي أو تابع، والتابع اسم فاعل من "تبعه" بمعني مشي خلفه.

ب) اصطلاحاً: هو من لقي صحابيا مسلما ومات علي الإسلام، وقيل هو من صحب الصحابي.

**٢ – من فوائده :**

تمييز المرسل من المتصل .

**٣ – طبقات التابعين:**

اختلف في عدد طبقاتهم ، فقسمهم العلماء كل حسب وجهته .

أ) فجعلهم مسلم ثلاث طبقات.

ب) وجعلهم ابن سعد أربع طبقات .

ج) وجعلهم الحاكم خمس عشرة طبقة، الأولي منها من أدرك العشرة من الصحابة.

**٤ – المخضرمون:**

واحدهم "مخضرم " والمخضرم: هو الذي أدرك الجاهلية وزمن النبي صلي الله عليه وأسلم ولم يره. والمخضرمون من التابعين علي الصحيح .

وعدد المخضرمين نحو عشرين شخصاً ، كما عدهم الإمام مسلم ، والصحيح أنهم أكثر من ذلك ، ومنهم أبو عثمان النهدي ، والأسود بن يزيد النخعي.

